ئەمانەتی گشتی رۆشنبیری و لاوان یارمەتی لەچاپدانی داوە

# إقتران النيرين في مجمع البحرين

## ترجمەی حەدیسەکانی موسلیم و بوخاری

دانراوی

ماموستا مەلا رەشید بەگی بابان

لێکۆڵینەوەی

محمد علی قەرەداغی

بەرگی پێنجەم

چاپی یەکەم ١٤٠٧ ك ١٩٨٧ ز

ئەمانەتی گشتی رۆشنبیری و لاوان یارمەتی لەچاپدانی داوە

# إقتران النيرين

## في

# مجمع البحرين

## ترجمەی حەدیسەکانی موسلیم و بوخاری

دانراوی

ماموستا مەلا رەشید بەگی بابان

لێکۆڵینەوەی

محمد علی قەرەداغی

بەرگی پێنجەم

چاپی یەکەم

١٤٠٧ك - ١٩٨٧ز

# إقتران النيرين

# في

# مجمع البحرين


تأليف

ملا رشيد بيگ بابان

تحقيق

محمد علي القره‌داغي


الجزء الخامس

١٤٠٧هـ ١٩٨٧م




بغداد ـ هاتف ٨٨٨٢٧٢٦

## فەضائیلی ئەنبیا لە حەزرەتی ئادەمەوە تا حەزرەتی پێغەمەر - علیهم الصلاة والسلام -

**٩٤١/٣/١**

**١٤٨٢/١ - عن أبي هريرة - رضي الله تعالى عنه - عن النبي ﴿ﷺ﴾ قال: خلق الله آدم [على صورته. م]، [عليه الصلاة والسلام] وطوله ستون ذراعا، ثم قال: اذهب فسلم على أولئك من الملائكة فاستمع ما يجيبونك؛ تحيتك وتحية ذريتك. فقال: السلام عليك. فقالوا: السلام عليكم ورحمة الله، فزادوه ورحمة الله. فكل من يدخل الجنة على صورة آدم [عليه السلام في الحسن، والجمال، والطول] فلم يزل الخلق ينقص حتى الآن خ - ٣٠٩/٥. م - ٢١١/١٠. ت، ن.**

ئەم حەدیثەم نووسیو کاغەزەکەت هات، بە خوێندنەوەو سەلامەتیتان زۆر دڵخۆش بووم، خوا ئەو دڵخۆشی‌یەم بەردەوام کا، ئامین. (١)

**تەرجەمە:**

ئەبو هورەیرە - رضي الله تعالى عنه - ئەفەرموێ: پێغەمەر ﴿ﷺ﴾ فەرمووی: خوا - عز وجل - حەزرەتی ئادەم - علیه السلام - ی خەلق کرد شەصت ذیراع درێژ بوو، لە پاشا ئەمری پێکرد: بچۆ لەو مەلائیکەتانە سەلام بکە، گوێ بدەرێ چیت جواب ئەدەنەوە سەلامی

---

(١) - دانەر - خ - بێ‌ناوبردنی کەس ئەم قسەی لێرەدا نووسیوە، دیارە کە بۆ مامۆستا مەلا حسەینی نووسیوە. ئێمەیش وەك خۆی هێشتمانەوە.

تۆو جوابی ئەوان تەحی‌یەتی تۆو ذوڕی‌یەتی تۆن. حەزرەتی ئادەم ـ علیـه الصـلاة والسـلام ـ تەشـریفی چوو فەرمـووی: (السلام علیکم) مەلائیکەکان ـ علیهم السلام ـ جوابیان دایەوەو فەرموویان: (السلام علیك ورحمة الله)، (ورحمة الله)یان بۆ زیاد کرد، هەرکەسێ بچێتە بەهەشتەوە [لە حوسن و، جەماڵ و، باڵادا] لە سەر صوورەتی ئادەم ـ علیه الصلاة والسلام ـ ئەچێتە بەهەشت. [بە مەعلوولیی‌و ناشیرینی ناچێتە بەهەشت] ڕۆژ بەڕۆژ خەڵق لە جەماڵ و طوولا لە کەمکردنا بوون تا ئیمڕۆ.]

[تاجەدینی تەدموری لە قوتەیبەوە نەقڵ ئەکا کە ئادەم ـ علیه السلام ـ ئەمرەد بوە ریش لە ذوڕی‌یەتەکەی ڕواوە، خۆی درێژ و مووی زۆری بوە.

بەزارو ترمذیی‌و نەسائي لە ئەبوهورەیرەوە ـ رضي الله تعالی عنه ـ ریـوایـەت ئەکـەن بە مەرفـووعیی کە خوا خەلقی ئادەمی کرد لە گڵ، گڵەکەی کرد بە قوڕ، تەرکی کرد تا بوو بە قوڕێکی (متغیر) لە دواییدا تەرکی کرد تا بوو بە وەك پارچەی دیزەو گۆزەی وشك بۆوە. شەیطان ـ علیــه اللعنــة ـ بەلایــا رائــەبـورد ئەیـوت: تۆ بۆ ئیشێکی زۆر گەورە دروست کراوی. لە پاشا خوا ڕۆحی بە بەرا کرد. ئەووەڵ جوزئێکی کە ڕۆحی تیا جاری بوو چاوو لووتی بوو، پژمی‌و فەرمووی: (الحمد لله) خوا فەرمووی: (یرحمك ربك).

ئەبوداود لە حەدیثی ئەبوموساوە بە مەرفووعیی ریوایەت ئەکا، (ابن حبان)یش فەرموویەتی: صەحیحە، خوا خەلقی ئادەمی ـ علیه السلام

ـ لە مستێ گڵ کرد کە لە هەموو رووی ئەرزی هەڵگرت، بەنوئادەم بە میقداری ئەرز هاتە وجوود.

لەم حەدیثەدا ئەفەرموێ: کە خوا ـ عزوجل ـ کە ئیرادەی فەرموو حەزرەتی ئادەم ـ علیـه السـلام ـ لە عەدەم بێنێتـە وجـوود لە=شەش= طەوری گۆڕی: طەوری گڵ، طەوری قوڕ، طەوری حەمەء. یەعنی قوڕی ترشـاو. طەوری صەلـصـال یەعـنـی = دەنـگـی لێ = بێت و خرەخری لێ بێ. طەوری تەسوی‌یە کە صەلصالەکە بکا بە ئێسك و گۆشت و خوێن، لە پاشا رۆحی بە بەرا کرد. خوا ئینسانی بە چوار نەوع خەلق کردوە: ئینسانی بێ دایك وباوك = ئادەم = ئینسانی بێ دایك وەك حەوا، ئینسانی بێ باوك = عیسا = ـ علیه السلام ـ ئینسانی بە باوك و دایك وەك ئێمە.

ئینسانی لە بەینی قووەی مەلەکی و قووەی حەیوانی دروست کردوە. ئینسان خۆی پاك بکاتەوە لە نەجاساتی نەفسانی مەلەکووتی سەماوات و ئەرز ئەبینێ. (إلى آخر ما في القسطلاني في هذا الحديث).

**تەمام وابوو کە دەرحەق هەر پێغەمەرێ ـ علیه السلام ـ چە ئایەتێ نازڵ بوە بینووسم، تێفکریم ئەبوو نیوەی زیاتری قورئانم بنووسیایە، صەرفی نەظەرم کرد؛ چونکی عومرم لە نیهایەتیدایە، پەلەپەلمە بەڵکو (إن شاء الله) ئەم میقدارە تەواو بکەم!**

**٢/١٤٨٣ ـ عن أبي هريرة ـ رضي الله تعالى عنه ـ عن النبي ـ ﷺ ـ لولا بنـو إسـرائيـل لم يَخْنَزِ اللحم [لم ينتن. وفي أخـرى: لم يخبث**

الطعـام، ولم يخنز اللحم] ولـولا حواء لم تَخن أنثى زوجهـا [الـدهـر أخرى] ح ـ ٥/٣١٢. م ـ ٦/٢٦٠.

تەرجەمە:

ئەبـو هورەیـرە ـ رضي الله تعـالى عنـه ـ لە پێغـەمـەر ـ ﷺ ـ وە ریـوایـەت ئەکـا کە فەرمـوویـەتی: ئەگەر بەنی ئیسرائیل نەبوایە [طەعام خراپ نەئەبوو] گۆشت بۆگەن نەئەبوو [چونکە لە صەحرای تەیها کە شەلاقەو شیرخشتیان بۆ ئەباری خوا مەنعی کردن لە پاشەکەوت کردنی، پاشەکەوتیان کردو گۆشتەکەیان بۆگەن بوو]. ئەگەر حەووا نەبوایە هیچ ژنێ خەیانەتی قەط لە مێرد نەئەکرد. [تەفرەی داو گەندمی پێ خوارد لە بەهەشت کراینە دەرێ] حەزرەتی ئادەم و حەووا ـ علیهما السلام ـ چی بکەن؟ خوا ئەوانی بۆ ئیعماری ئەرز خەلق کردبوو بۆ بەهەشت نەبوو.

## نوح ﴿عليه السلام﴾

٣/١٤٨٤ـ عن أبي سعيد الخدري [رضي الله تعالى عنه] قال: قال رسـول الله ـ ﷺ ـ: يجيء نوح وأمتـه فيقـول الله تعـالى:ـ هل بلغتَ؟ فيقول: نعم أي رب. فيقول لأمته: هل بلغكم؟ فيقولون: لا ماجاءنا من نبي! فيقـول لنـوح: من يشهـد لك؟ فيقـول: محمـد ـ ﷺ ـ وأمته فنشهد [له] أنه قد بلغ، وهو قوله ـ عز وجل ذكره ـ: ﴿وكذلك جعلناكُم أمَّةً وَسَطاً لتكونوا شُهداءَ على الناسِ [ويكون الرسول عليكم شهيـدا]﴾[1] والـوسـط العـدل [وهـذا من نفس الحـديث لا مدرج من

(١) البقرة/١٤٣.

الرواة]. ح ـ ٥/٣١٩.

**تەرجەمە:**

پێغەمەر ـ ﷺ ـ فەرمووی: ڕۆژی قیامەت نووح و ئوممەتی ـ علیه السـلام ـ یێنە حوزووری خوا بۆ موحاکـەمـە، خوا ـ عزوجـل ـ لە حەزرەتی = نوح = ـ علیه السلام ـ ئەپرسێ: ئەحکامی منت تەبلیغی ئوممەتەکەت کرد یان نا؟ ئەفەرموێ: بەڵێ یا ڕەببی خوا ـ عزوجل ـ لە ئوممەتەکەی ئەپرسێ: نووح ئەحکامی منی تەبلیغ کردوون؟ عەرزی خوا ئەکەن: خەیر هیچ پێغەمەرمان بۆ نەهاتوە؟ خوا ـ عزوجل ـ لە نووح ـ علیه السلام ـ ئەپرسێ: کێ شەهادەتت بۆ ئەدا کە تەبلیغت کردوون؟ عەرزی خوا ئەکـا: محـەمـەد ـ علیـە الصـلاة والسـلام ـ و ئوممـەتی شەهـادەتم بۆ ئەدەن [یـا ڕەببی خوایـا من و مەلا حسـەین و ئەحباب و ئەقاریبمان داخڵی ئەو شاهیدانە بکەی، ئامین!] ئەو وەختە ئێمـە شەهـادەتی بۆ ئەدەین کە تەبلیغی کردوون. پێغـەمـەر ـ ﷺ ـ ئەفەرموێ: ئەوە ئەو ئایەتەیە کە ئەفەرموێ: چۆن ئێوەمان هیدایەت داوە لە دنیادا بۆ ڕێی ڕاست و بۆ قیبلەی حەق وایش ئێوەمان کردوە = بە = ئوممەتێکی عادڵ تا ئێوە لە ڕۆژی قیامەتا ببن بە شاهید لە ئینسانانی پێش ئێـوە کە پێغـەمـەرەکـانیان تەبلیغی ئەحکامی ئیلاهیەیان کردوون، پێغـەمـەری ئێـوەیش لە حوزووری خوادا شەهـادەت لەسەر عەدالەت و ڕاستی ئێوە بدا. (البقرة ـ دوای ـ سیقول).

ئێمـە خوا ـ عزوجـل ـ ئەوەنـدە ئیعتیبـارو شەرەفـەی داوینێ کە لە حوزووری خوادا ـ عزوجل ـ شەهادەت بۆ پێغەمەرانی عیظام ئەدەین

نازانم بۆچ بۆ چوار رۆژی پڕو پووچ ئەو شەرەفە ضایع ئەکەین؟ خوایا ئەو لیباسی شەرەفەمان لەبەر دانەکەنی ئامین!

ئەم حەدیثە لە حەقیقەتا لە فەضائیلی پێغەمەری ئێمەیە ـ علیه الصلاة والسلام ـ.

## صالح ﴿علیه السلام﴾

**٤/١٤٨٥ـ عبد الله بن زمعة [رضي الله تعالى عنهما] قال: سمعت النبي ـ ﷺ ـ [يخطب] وذكر [قصة قدار] الذي عقر الناقة، فقال: فانتدب لها رجل ذو عزة ومَنَعة في قوة كأبي زمعة [الأسود بن المطلب، بن أسد. جد عبد الله الراوي، مات كافرا] ح ـ ٥/٣٦٣. ت، ن، جه. مسلم ـ ١٠/٣٢٢.**

**تەرجەمە:**

عبدوڵڵای کوڕی زیممەعە ـ رضي الله تعالى عنهما ـ ئەفەرموێ: لە پێغەمەر ـ ﷺ ـ م بیست کە خوطبەی ئەخوێن و بەحثی لە قەدار فەرموو، کە وشترەکەی حەزرەتی صالح ـ علیه السلام ـی سەربڕی، فەرمووی: پیاوێ بۆی چوو کوشتی کە لە ناو قەومەکەیا صاحیب عیززەت و قودرەت بوو، لە قووەتا وەك ئەبو زیممەعە وابوو. [کە ئەسوەدی باپیری عەبدوڵڵای راوی‌یە ـ رضي الله تعالى عنه ـ ]

**٥/١٤٨٦ ـ عن ابن عمر ـ رضي الله تعالى عنهما ـ: أن الناس نزلوا مع رسول الله ـ ﷺ ـ أرض ثمود الحجرَ فاستقوا من بئرها واعتجنوا به، فأمرهم رسول الله ـ ﷺ ـ أن يهريقوا ما استقوا من بئرها، وأن يعلفوا الإبل**

**العجينَ [أن يطرحوا ذلك العجين. أخرى خ] وأمرهم أن يستقوا من البئر التي تردها الناقة. ح ـ ٣٦٣/٥. م ـ ٤٢٨/١٠.**

تەرجەمە:

عەبدوڵڵای ئیمامی عومەر ـ رضي الله تعالى عنهما ـ ئەفەرموێ: لە خزمەت پێغەمەرا ـ ﷺ ـ خەڵق لە حیجری دیاری ثەموودا دابەزین، پێغەمەر ـ ﷺ ـ [ئەمری پێفەرموون: لە ئاوی بیرەکەی هەڵنەیێنجن و لیێ نەخۆنەوە] لە بیرەکەیان هەڵیێنجا بوو هەویریان پێ شێلابوو، فەرمووی: ئەو ئاوەی کە لێیان هەڵیێنجاوە بیڕێژن و، هەویرەکەیش بدەن بە وشترەکانیان، [لە ریوایەتەکەی ترا: هەویرەکە فرێدەن، یەعنی نەیخۆن] ئەمری پێکردن لەو بیرە هەڵیێنجن کە وشترەکەی حەزرەتی صاڵح ـ علیه السلام ـ ئەچوە سەری‌و ئاوی لێ ئەخواردەوە.

**١٤٨٧/٦ـ عبد الله بن عمر [رضي الله تعالى عنهما] ئەفەرموێ: پێغەمەر ـ ﷺ ـ لما مر بالحجر قال: لا تدخلوا مساكن الذين ظلموا أنفسهم إلا أن تكونوا باكين [مخافة] أن يصيبكم ما أصابهم! ثم تقنع بردائه وهو على الرحل، ح ـ ٣٦٤/٥. خ ـ ٤٤٧/٦. فيه وفي مسلم: قال رسول الله ـ ﷺ ـ لأصحاب الحجر: لا تدخلوا على هؤلاء المعذبين.**

**م ـ ٤٢٧/١٠. وفي ح ـ ٤٤٧/٦ في أخرى: ثم تقنع برأسه وأسرع السير حتى أجاز الوادي.**

**تەرجەمە:**

پێغەمەر ـ ﷺ ـ کە تەشریفی بە لای حیجری ثەموودا رابورد

فەرمـووی: مەچنـە ئەو جێگـەیـەی کە ئەوانـەی چوونێ کە زوڵمیان لە نەفسی خۆیـان کردوە مەگـەر بە گریـانـەوە، مەبـادا ئێوەیش تووشی ئەو عەذابــە ببـن کە ئەوانی تووش بوون. لە پاشــا پێغــەمــەر ـ ﷺ ـ بە بەرمـاڵـەکـەی سەرشـانی لەچکی کردو، یەعنی سەرو چاوی موبارەکی خۆیی داپۆشیو خێرای لە رۆیین کرد تا لەو وادییەی کە ئەوانی تیان تێپەڕ بوو. لە ئەوەڵی ریوایەتەکەی ترا ئەفەرموێ: کە پێغەمەر ـ ﷺ ـ دەرحەق ئەصحابی حیجر فەرمووی: بەگریانەوە نەبێ مەچنە سەر ئەو (معذب)انە.

لەم حەدیثەدا نەهیکراوە لەوە ئینسان بچێتە مەنازیلی ئەوانەی کە موعــەذذەبـن، هەر میللەتێ بێ، عاد بێ، ثەمــوود بێ، قەومی لووط بێ. مەقبەرەی جوولەکەو گاورو سائیری ئەهلی کوفریش وایە؛ چونکی دیارە کە موعەذذەبن. یەعنی بە ناو شەڕا مەڕۆن مەبادا ئێوەیش تیرێ، یا گوللەیێ، یا بەردێکتان بەربکەوێ.

## إبراهيم وإسماعيل ـ عليهما السلام ـ

**٧ ١٤٨٨ـ عن أنس بن مالـك [رضي الله تعـالى عنه] قال: جاء رجل إلى رسول الله ـ ﷺ ـ فقال: يا خير البرية. فقال رسول الله ـ ﷺ ـ: ذاك إبراهيم ـ عليه السلام ـ. م ـ ٩/٣٣٤.**

**تەرجەمە:**

پیاوێ هاتە خزمەت پێغەمەر ـ ﷺ ـ عەرزی پێغەمەری کرد ـ ﷺ ـ: ئەی چاکتـرینی هەمـوو مەخلووقـات. پێغـەمـەر ـ ﷺ ـ فەرمووی:

چاکترینی مەخلووقات ئیبراهیمە ـ علیه السلام ـ.

ئەم فەرموودەی پێغەمەر ـ ﷺ ـ تەواضوعە لە پێغەمەرەوە ـ ﷺ ـ و ئیرشادی ئوممەتە کە دەرحەق هیچ کەس ئینسان لە مەدح و ئەنادا زۆر بەرەوژوور نەچێ و ئیحتیراز بکا لە مەدحی بەرەوڕوو، گینا (علو)ی دەرەجەی پێغەمەر ـ ﷺ ـ وەك رۆژی رووناکە، غەیری کوێر ئەیبینێ. (أللهم افتح أبصار قلوبنا آمين).

**٨/١٤٨٩ ـ عن أبي هريرة ـ رضي الله تعالى عنه ـ قال: قال رسول الله ـ ﷺ ـ: إختتن إبراهيم النبي ـ عليه السلام ـ وهو ابن ثمانين سنة بالقدوم. [بتخفيف الدال، قرية، أو آلة النجار، وبتشديدها قرية. نووي] م ـ ٩/٢٣٥ ح ـ ٥/٣٣٩. ح ـ ٩/١٦٢، وفيه: بالقدوم مخففة. وفي أخرى في تلك الصحيفة عن أبي الزناد وقال: بالقدوم وهو موضع مشدَّد.**

**تەرجەمە:**

پێغەمەر ـ ﷺ ـ فەرمووی: ئیبراهیم ـ علیه السلام ـ لە هەشتاساڵیدا لە قەدووم، یا بە قەدووم، خۆی خەتەنە کرد.

قەدووم: بە تەخفیفی (دال) بە تەشویە ئەڵێن. ناوی دێیێکیشە. بە تەشدیدی دال ناوی دێیێکە. ظاهیر وایە لەو دێیەدا تەشریفی ئیقامەتی کردبێ و بە تەشوێیش خۆی خەتەنە کردبێ. کە وابێ لە ریوایەتی تەخفیفا ناوی ئەو جێیە نەبراوە، لە ریوایەتی تەشدیدا ناوی تەشوێ نەبراوە. مونافیی یەك نین؛ چونکی خەتەنە مەکانێك و ئالەتێکی پێ لازمە.

٩/ ١٤٩٠ـ عن ابن عباس ـ رضي الله تعالى عنهما ـ عن النبي ـ ﷺ ـ قال: إنكم تحشرون حفاة، عراة، غُرْلا [غير مختونين] ثم قرأ: ﴿كما بدأنا أول خلق نعيده، وعدا علينا، إنا كُنَّا فاعلين﴾(١) وأول من يكسى يوم القيامة إبراهيم، وإن أناسا من أصحابي يؤخذ بهم ذات الشمال، فأقول: أصحابي، أصحابي. فيقال: إنهم لم يزالوا مرتدين على أعقابهم منذ فارقتهم. فأقول كما قال العبد الصالح ﴿وكنتُ عليهم شهيدا ما دُمْتُ فيهم . . ـ الى قوله ـ الحكيم﴾(٢) آخر المائدة. وبقية الآية: ﴿فلما توفيتني كنتَ أنْتَ الرقيب عليهم، وأنت على كل شيء شهيد، إن تعذبهم فإنهم عبادك، وإن تغفر لهم فإنك أنت العزيزُ الحكيم﴾ ح ـ ٥/ ٣٣٦، ح ـ ٧/ ١٠٩ م ـ ١٠/ ٣٢٩ وفيه الآية بتمامها.

ئەم حەدیثەم رەنگە لە ئەحوالی ئاخیرەتا نووسیبێ

تەرجەمە:

پێغەمەر ـ ﷺ ـ فەرمووی: ئێوە رۆژی قیامەت بە پێخاوسیی، بە ووتی، بە خەتەنە نەکراوی زیندووئەکرێنەوە. لە پاشا پێغەمەر ـ ﷺ ـ ئەو ئایەتی ئاخری سوورەتی ئەنبیایەی خوێندەوە کە ئەفەرموێ: چۆن لە ئەووەڵەوە ئێوەم دروست کردوە بە بێ هیچ وایش ئیعادەتان ئەکەینەوە. وەعدەییێکی ثابتە لەسەر ئێمە، بە تەحقیق ئێمە ئەیکەین، پێغەمەر ـ ﷺ ـ فەرمووی: ئەووەڵ کەسێ کە جلی لەبەر ئەکرێ لە قیامەتا حەزرەتی ئیبراهیمە ـ علیه السلام ـ [چونکە نەمروود بە رووتیی هاویتیە ناو

(١) الأنبياء/ ١٠٤.

(٢) المائدة/ ١١٧.

ئاگرەوە]. پێغەمەر ـ ﷺ ـ فەرمووی: بەعزێ خەڵق لە ئەصحابی من دەستەچەپیان پێ ئەگرن ئەیانبەن بۆ جەهەننەم، ئەڵێم: یارەبی ئەمانە ئەصحابی منن، پێم ئەڵێن: ئەوان لە دوای وەفاتی تۆ هەر پاشەوپاش لە گەڕانەوەدا بوون، منیش عەبدی صاڵح کە حەزرەتی عیسایە چی فەرموو ئەوە ئەفەرمووم، ئەڵێم: من لەسەریان شاهیدو رەقیب بووم تا لە ناویانا بووم، کە وەفاتت بە من کرد تۆ خۆت رەقیبیان بووی، تۆ شاهیدو عالمی بە کوللی شتێ؛ ئەگەر عەذابیان بدەی ئەوانە عەبدی تۆن ئەگەر لێیشیان خۆش ببی هەر تۆی کە عیزەت و قودرەتت ببێ بەسەر هەموو شتێکا، حەکیم و عالمی بە عاقیبەتی کوللی شتێك و هیچ شت بە بێ حیکمەت ناکەی.

١٠/١٤٩١ـ عن أبي هريرة ـ رضي الله تعالى عنه ـ عن النبي ـ ﷺ ـ قال: يلقى إبراهيم أباه آزر يوم القيامة، وعلى وجه آزر قترة [سواد كالدخان] وغبرة [غبار] فيقول إبراهيم: ألَم أقل لك: لا تعصني؟ فيقول أبوه: فاليوم لا أعصيك. فيقول إبراهيم: يارب إنك وعدتني أن لا تخزيني [أي لا تهينني ولا تذلني] يوم يبعثون، فأي خزي أخزى من أبي الأبعد [من رحمة الله]؟ فيقول الله ـ تعالى ـ: إني حرمت الجنة على الكافرين. ثم يقال له: يا إبراهيم ما تحت رجليك؟ فينظر فإذا هو بذيخ [بضبع] متلطِّخ؛ فيؤخذ بقوائمه فيلقى في النار. ح ـ ٥/٣٣٦. ح ـ ٧/٢٦٧ بأخصر.

تەرجەمە:

پێغەمەر ـ ﷺ ـ ئەفەرموێ: رۆژی قیامەت حەزرەتی ئیبراهیم ـ

عليه الصلاة والسلام ـ بە ئازەری باوکی ئەگا لەسەر دەموچاوی ئازەر ڕەشییەکی وەك دووکەڵ و غوبارێکی پێوەیە. ئیبراهیم ـ علیه السلام ـ پێی ئەفەرموێ: پێم نەوتی: موخالەفەم مەکە؟ باوکی عەرزی ئەکا: ئیمرۆ موخالەفەت ناکەم. ئیبراهیم ـ علیه السلام ـ عەرزی بارەگای ئیلاهیی ئەکا: یا ڕەببی وەعدەت دامێ کە لە ئاخیرەتا ئیهانەم نەکەیت و ذەلیلم نەکەی، چە ذیللەتێ لە ذیللەتی باوکم زیاترە کە لە ڕەحمەتی تۆ دوورخراوەتەوە؟ خوا ـ عزوجل ـ ئەفەرموێ: بە تەحقیق من بەهەشتم لەسەر کافران حەرام کردوە. لە پاشا بە ئیبراهیم ـ علیه السلام ـ ئەفەرمووێ: ئەوە چییە لە ژێر پێتا؟ کە تێئەفکرێ کەمتیارێ (ملوث)ە چوارپەلی ئەگرن و ئەیهاونە ناو ئاگرەوە.

١١/١٤٩٢ـ عن سعيد بن جبير ـ رحمه الله ـ قال ابن عباس [رضي الله تعالى عنهما]: أول ما اتخذ النساء المنطق من قبل أم إسماعيل [عليهما السلام] اتخذت منطقا لتُعَفِّيَ أثرها على سارة [رضي الله تعالى عنها] ثم جاء بها إبراهيم وبابنها إسماعيل [عليهما السلام] وهي ترضعه حتى وضعهما عند البيت عند دوحة [عظيمة] فوق زمزم، في أعلى المسجد، وليس بمكة يومئذ أحد، وليس بها ماء، فوضعهما هنالك، ووضع عندهما جرابا فيه تمر، وسِقاء فيه ماء، ثم قَفى إبراهيم [عليه السلام] منطلقا، فتبعته أم إسماعيل [عليهما السلام] فقالت: يا إبراهيم أين تذهب وتتركنا بهذا الوادي الذي ليس فيه إنس ولا شيء؟ فقالت له ذلك مِرارا، وجعل لا يلتفت إليها، فقالت له: آلله الذي أمرك بهذا؟ قال: نعم. قالت: إذاً لا يضيعنا، ثم رجعتْ.

فانطلق إبراهيم حتى إذا كان عند الثنية [حيث دخل النبي - ﷺ - مكة] حيث لا يرونه إستقبل بوجهه البيت ثم دعا بهؤلاء الكلمات ورفع يديه فقال: ﴿ربنا إني أَسْكَنتُ من ذُريتي بِوادٍ غير ذي زرع عند بيتك المحرم ـ حتى بلغ يشكرون ـ [سورة إبراهيم. وبقية الآية ـ: ربنا لِيُقيموا الصلاة، فاجعلْ أفئدةً من الناسِ تهوي اليهم، وارْزُقهم من الثمراتِ لعلهم يشكرون﴾[1] وجعلت أم إسماعيل ـ عليهما السلام ـ ترضع إسماعيل وتشرب من ذلك الماء حتى إذا نَفِذ]ما في السقاء عطشت وعطش ابنها، وجعلت تنظر إليه يتلوى، أو قال يتلبط [أي يضرب بنفسه الأرض] فانطلقت كراهية أن تنظر إليه، فوجدت الصفا أقرب جبل في الأرض يليها، فقامت عليه، ثم استقبلت الوادي تنظر: هل ترى أحدا؟ فلم تر أحدا، فهبطت من الصفا، حتى إذا بلغت الوادي رفعت طَرَف دِرعها، ثم سعَتْ سعي الإنسان المجهود حتى جاوزت الوادي، ثم أتت المروة فقامت عليها ونظرت: هل ترى أحدا؟ فلم تر أحدا.. ففعلت ذلك سبع مرات.

قال ابن عباس [رضي الله تعالى عنهما]: قال النبي ـ ﷺ ـ: فذلك سعي الناس بينهما، فلما أشرفت على المروة سمعت صوتا فقالت:صهٍ [وبسكونها] تريد نفسها، ثم تسمعت فسمعت أيضا، فقالت: قد أسمعتَ إن كان عندك غِواث [أي فأغثني] فإذا هي بالملك عند موضع زمزم، فبحث بعقبه، أو قال بجناحه حتى ظهر الماء، فجعلت تحوضه وتقول بيدها هكذا، وجعلت تغرف من الماء في سقائها وهو يفور بعد ما تغرف.

[1] ابراهيم/ ٣٧

قال ابن عباس [رضي الله تعالى عنهما] قال النبي - ﷺ -: يرحم الله أم إسماعيل لو تركتْ زمزم، أو قال: لو لم تغرف من الماء لكانت زمزم عينا معينا.

قال: فشربت وأرضعت ولدها، فقال لها المَلك: لا تخافوا الضَّيْعة؛ فإن ههنا بيت الله يبني هذا الغلام وأبوه، وإن الله لا يضيع أهله، وكان البيت مرتفعا من الأرض كالرابية [تەپۆڵکە] تأتيه السيول فتأخذ عن يمينه وشماله، فكانت كذلك حتى مرت بهم رُفقة من جُرْهُم، أو أهل بيت من جُرهم مقبلين من طريق كَداء، فنزلوا أسفل مكة، فرأوا طائرا عائفا [يحول حول الماء]. فقالوا: إن هذا الطائر ليدور على ماء، لعهدنا بهذا الوادي وما فيه ماء. فأرسلوا جَرِيًّا أو جريين [رسولا أو رسولين] فإذا هم بالماء، فرجعوا فأخبروهم بالماء فأقبلوا.

قال: وأم إسماعيل [عليه السلام] عند الماء. فقالوا: أتأذنين لنا أن ننزل عندك؟ فقالت: نعم، ولكن لا حق لكم في الماء. فقالوا: نعم.

قال ابن عباس [رضي الله تعالى عنهما] قال النبي -ﷺ- فألفى ذلك أم إسماعيل [عليهما السلام] وهي تُحِبُّ الأُنس، فنزلوا وأرسلوا إلى أهليهم، فنزلوا معهم حتى إذا كان بها أهل أبيات منهم، وشب الغلام، وتعلم العربية منهم = وأنفَسهم = وأعجبهم حين شب، فلما أدرك زوجوه إمرأة منهم [اسمها عمارة بنت سعد] وماتت أم إسماعيل [- عليهما السلام - ولها من العمر تسعون سنة].

فجاء إبراهيم [عليه الصلاة والسلام] بعد ما تزوج إسماعيل يطالع تركته، فم يجد إسماعيل [عليه السلام] فسأل امرأته عنه، فقالت: خرج

يبتغي لنـا، ثم سألهـا عن عيشهم وهيئتهم. فقـالت: نحن بشرٍّ، نحن في ضيق وشـدة، فشكت إليـه. قال: فإذا جاء زوجـك فأقرئي عليـه السلام وقـولي له: يغيـر عتبـة بابـه. فلمـا جاء إسماعيل [عليه السلام] كأنه آنس شيئـا، فقـال: هل جاءكمْ من أحـد؟ قالت: نعم جاءنـا شيـخ كذا وكـذا [كـالمستخفـة بشأنه] فسألَنا عنك فأخبرته، وسألني كيف عيشنا، فأخبرته أنـا في جهـد وشـدة. قال: فهل أوصاك بشيء؟ قالت: نعم أمرني أن أقرأ عليـك السـلام ويقـول: غيِّـر عتبـة بابـك. قال: ذاكَ أبي وقـد أمرني أن أفارقك، ألحقي بأهلِك، فطلقها وتزوج منهم أخرى [سلمة بنت مهلهل].

فلبث عنهم إبـراهيم [عليـه السـلام] ما شاء الله، ثم أتـاهم بعـد فلم يجده، فدخل على امرأته فسألها عنه، فقالت: خرج يبتغي لنا. قال كيف أنتم؟ وسألها عن عيشهم وهيئتهم، فقالت: نحن بخير وسعة، وأثنت على الله. فقال: ما طعامكم؟ قالت: اللحم. قال: وما شرابكم؟ قالت: الماء [واللبن أبَوجهم] قال: أللّهم بارك لهم في اللحم والماء. قال النبي ـ ﷺ ـ: ولم يكن لهم يومئـذ حبٌّ، ولـو كان لهم دعـا لهم فيـه. قال: فهمـا لا يخلو عليهمـا أحـد بغيـر مكة إلا لـم يوافقاه. قال: فإذا جاء زوجكِ فأقرئي عليه السلام، ومُريه يثبت عتبة بابه.

فلمـا جاء إسمـاعيـل [عليه السلام] قال: هل أتاكم من أحد؟ قالت: نعم أتـانـا شيـخ حسن الهيئة وأثنت عليه، فسألني عنك فأخبرته، فسألني كيفَ عيشنـا فأخبـرته أنا بخير. قال: فأوصاكِ بشيء؟ قالت: نعم هو يقرأ عليك السلام، ويأمرك أن تثبت عتبة بابك. قال: ذاكِ أبي، وأنت العتبة،

أمرني أن أمْسِكَكِ.

ثم لبث عنهم ما شاء الله، ثم جاء بعد ذلك وإسماعيل [عليه السلام] يَبْـري نَبْـلا له تحت دوحـة قريبـا من زمـزم، فلما رآه قام إليه، فصنع كما يصنع الوالد بالولد والولد بالوالد، ثم قال: يا إسماعيل إن الله أمرني بأمر، قال: فاصنـــع ما أمـرك ربـك. قال: وتعينني عليـه؟ قال: وأُعينـك. قال [إبـراهيم عليـه السلام]: فإن الله أمرني أن أبني ههنا بيتا، وأشار الى أكمة مرتفعة على ماحولها. قال: فعند ذلك رفعا القواعد من البيت، فجعـل إسماعيل يأتي بالحجارة وإبراهيم يبني [عليهما الصلاة والسلام] حتى إذا ارتفع البناء جاء بهذا الحجر [حجر المقام] فوضعه له، فقام عليه وهو يبني وإسمـاعيـل [عليـه السـلام] يناوله الحجارة، وهما يقولان: ربنا تقبل منا إنـــك أنت السميـع العليم. قال: فجعـلا يبنيـان حتى يدورا حول البيت وهمـا يقـولان: ربنـا تقبـل منـا إنـك أنت السميع العليم. ح - ٥/٣٤٦ - ٣٥٢. وفي أوله:

لمــا كان بين إبــراهيم - عليـه السـلام - وبين أهله سارا ما كان خرج بإسماعيل وأم إسماعيل - عليه السلام - ومعهم شنة فيها ماء. وفيه: نادته من ورائـه: يا إبـراهيم الى من تتـركنا؟ قال: إلى الله. وفيه: ثم قالت: لو ذهبت فنظرت ما فعل؟ تعني الصبي. فذهبت فنظرت، فإذا هو على حاله كأنه ينشغ [يشهق من صدره] فلم تقِرَّها نفسها. والباقي نحوه.

[وفي حديث عثمان: ونزل عليه الركن والمقام، فكان إبراهيم - عليه السـلام - يقـوم على المقـام يبني عليـه ويرفعه له إسماعيل - عليه السلام - فلما بلغ الموضع الذي فيه الركن وضعه يومئذ موضعه وأخذ المقام فجعله

لاصقـا بالبيت، فلمـا فرغ إبـراهيم ـ عليـه السـلام ـ من بناء الكعبة جاءه جبريل فأراه المناسك كلها، ثم قام إبراهيم ـ عليه السلام ـ فقال: يا أيها النـاس أجيبـوا ربكم. فوقف إبـراهيم وإسماعيل ـ عليهما السلام ـ تلك المـواقف، وحجـه إبراهيم وسارة ـ عليهما السلام ـ =من بيت المقدس= ثم رجع إبراهيم ـ عليه السلام ـ إلى الشام، فمات بالشام. قسط [٣٥٣/٥

تەرجەمە:

حەزرەتی سارە هاجـەری هیبـە کرد بە حەزرەتی ئیبـراهیم ـ علیهم السلام ـ کە هاجەر حامیلە بوو بە ئیسماعیل ـ علیه السلام ـ سارە پێی مەحزوون بوو سوێنی خوارد ئەبێ سێ ئەعضای ببڕێ! هاجەر پشتێنێکی دروست کرد قەدی پێ بەست و هەردو طەرەفی بەسەر ئەرزا شۆڕ کردەوە فیـراری کرد، پشتێنـەکـەی بەسـەر ئەرزا ئەخشـان کە شوێن پێی مەحـو بکاتەوە سارا نەزانێ بۆ کوێ ڕۆییوە. لە پاشانا حەزرەتی ئیبراهیم ـ علیه السلام ـ ئیسماعیل و هاجەری [بە سواریی بوراق] برد بۆ مەککەو لای بەیت لە لای دارێکی گەورە لە ژوور زەمزەمەوە لە لای ژووری بەیت دایانان. ئەو ڕۆژە لە مەککەدا هیچ کەس نەبوو، ئاوی لێ نەبوو، لەوێ دایانان، نانەبەرەیێ کە خورمای تیابوو لەگەڵ مەتارەیێ ئاوی بۆ دانان و، خۆی پشتی هەڵکـردو گەڕایـەوە. دایکی ئیسمـاعیـل ـعلیهماالسلام ـ شوێنی کەوت، فەرمووی: یا ئیبراهیم بۆ کوێ ئەچی؟ ئێمە لێرەدا بەجێ یێڵی؟ هیچ ئینسانی لێ نییەو، هیچ شتی لێ نییە! چەند دەفعە وای وت. ئیبراهیم ـ علیه السلام ـ ئاوڕی لێ نەدایەوە، لە پاشا پێی وت: توخوا!

خوا ئەمری پێ کردووی کە وا بکەی؟ فەرمووی: بەڵێ. حەزرەتی هاجەر فەرمووی: کە وابێ خوا بە ضایعمان ناداو گەڕایەوە [لەریوایەتەکەی ترا ئەفەرموێ: کە فەرمووی: ئێمە بە کێ ئەسپێری؟ فەرمووی: بەخواتان ئەسپێرم، هاجەر فەرمووی: رازیم بە خوا].

کە حەزرەتی ئیبـــراهیم ـ علیـه السـلام ـ گەیی‌یـە ئەو کەلـە [ی کە پێغەمەر ـﷺـ تەشریفی لێی هاتەخوارێ بۆ مەککەکە فەتحی مەککەی کرد] کە لێیانەوە نەبینرێ، رووی کردە بەیت و دەستی هەڵبری‌و بەم کەلیمانە دۆعـــای کرد، فەرمـــووی: ئەی خوایـــا من بەعـزێ ذوڕییـەتی خۆم لە وادی‌یێکی بێ زەراعەتا دانا لای (بیت الحرام)ی تۆوەو ئەی رەببی ئێمە بۆیێکم لێرە دانان کە نوێژ و طاعەتی تۆ بکەن، دڵی بەعزێ لە خەڵقیان بۆ وا لێ بکە کە بێنە لایان، لە ئەنواعی میوە رزقیان بدە ئومێدم هەیە شوکری تۆ بکەن. [سوورەتی ئیبراهیم].

دایکی ئیسماعیل ـ علیهما السلام ـ لەو ئاوەی ئەخواردەوەو شیری زۆر ئەبوو بۆ ئیسماعیل ـ علیه السلام ـ کە ئاوەکە بڕایەوە ئەویش تینووی بوو کوڕەکـەیشی تینـووی بوو، تەمـاشـای ئیسمـاعیل ـ علیه السلام ـی ئەکرد، بەسەر پشتاو بەسەر دەما گینڵەی ئەدا، یا فەرمووی: ئەتلایەوە لە ناو خۆڵا،مەبادا لەسەر ئەو حاڵە تەماشای بکا لێیدا رۆیی تا گەیی‌یە صەفا ،کەشاخێ بوو لەووە لێی نزیکتر بوو لە شاخەکانی تر،لەسەر صەفا وەستا رووی‌کـردە وادی‌یەکـە تێ ئەفکـری ئایـا یەکێـك نەبینێ! هیـچ کەسی نەدی، لە صەفا هاتەخوارێ بۆ وادی‌یەکە، کە گەیی‌یە وادی‌یەکە مەبادا داوێنی کراسـەکـەی بکـەوێتـە بەرپێی‌و هەڵـەنگـوێ لایێکی کراسەکەی

هەڵگرت. لە پاشا وەك یەكێ كە ترسێكی لەبەر بێ هەڕای كرد تا لە وادی‌یەكە تێپەڕ بوو، ئەمجا سەركەوتە سەر مەروە، لەسەری راوەستاو تەماشای كرد: ئایا كەسێك ئەبینێ؟ هیچ كەسی نەدی. حەوت دەفعە وای كرد.

ئیبن و عەباس ـ رضي الله تعالى عنه ـ ئەفەرموێ: پێغەمەر ـﷺـ فەرمووی: ئەو حەوت جار هاتوچۆی هاجەرە لە بەینی صەفاو مەروەدا ئەوەیە كە ئێستە خەڵق ئەیكەین. [حەدیثەكە لە ئەووەڵەوە بە مەوقووف دیارە، بەمە كە ئەفەرموێ: پێغەمەر ـﷺـ فەرمووی: ئەبێ بە موسنەد].

كە هاجەر لە مەروەوە نزیك بۆوە دەنگێكی بیست، بە خۆیی وت: وز، وز! ئەمجا گوێی راگرت دیسان بیستی فەرمووی: وا خستتە گوێوە بە خەڵقت بیست. ئەگەر ئیمدادێكت لا هەیە وەرە بە ئیمدادمەوە كە تێفكری حەزرەتی جیبریل لای زەمزەم بوو، بە پاژنەی پێی یا بە باڵی ئەرزی كۆڵی‌یەوە تا ئاو دەركەوت، حەزرەتی هاجەر ئەیكرد بە حەوز تا ئاوەكەی بڵاونەبێتەوە، بە دەستی وائی ئەكرد بە لوێنج، لێی هەڵەهێنجاو ئەكردە ناو مەتارەكەیەوە، لە دوای لێ‌هەڵهێنجانی هەڵەقوڵایەوە.

ئیبن وعەباس ئەفەرموێ: پێغەمەر ـﷺـ فەرمووی: خوا رەحم بكا بە دایكی ئیسماعیل، ئەگەر زەمزەمی تەرك بكردایە، یا فەرمووی: لێی هەڵنەهێنجایە زەمزەم ئەبوو بە سەرچاوەیێكی جاریی.

فەرمووی: لە ئاوی زەمزەمی خواردەوەو شیری دا بە مناڵەكەی. جیبریل ـ علیه السلام ـ پێی‌فەرموو: مەترسن بە ضایع ناچن؛ چونكی

لێرەدا بەیتوڵڵا هەیە، ئەم منداڵەو باوکی (بیت الله)بینا ئەکەن، خوا ئەهلی خۆی بە ضایع نادا (بیت الحرام)یش وەکوو تەپۆڵکە لە ئەرز بەرزتر بوو، سەیل بە لای راست و چەپیا ئەهات ئەیبرد، یەعنی زەرەری بۆ بەیت نەئەبوو. موددەتێ وا بوو تا چەند کەسێ لە جورهوم، یا فەرمووی: ئەهلی بەیتێ لە جورهوم لە کەلی کەدائەوە روویان کردە ئەوێ، لە خوار مەککەوە دابەزین، چاویان بە طەیر کەوت کە لەوێدا دەورەی ئەدا، وتیان: ئەم طەیرە بە دەوریئاوێکا ئەگەڕێ، ئەم وادییە وامان دیوە کە ئاوی تیا نییە. دوو سێ کەسیان نارد کە بزانن ئاوی لێیە یا لێی نییە؟ هاتنەوە وتیان: ئاوی لێیە، هاتنە لای ئاوەکە دایکی ئیسماعیل ـ علیهما السلام ـ لەسەر ئاوەکە بوو عەرزیان کرد: ئیذنمان ئەدەی کە لای تۆ دابەزین؟ فەرمووی: بەڵێ، ئەمما ئێوە لە ئاوەکەدا حەقتان نەبێ. عەرزیان کرد: بەڵێ.

ئیبن و عەباس ئەفەرموێ: پێغەمەر ـﷺـ فەرمووی: ئەو قەبیلەیە لە جورهوم تێگەیین کە دایکی ئیسماعیل ـ علیه السلام ـ حەزەکا کە رەفیقی بێ ئولفەتی پێوە بگرێ، ئەوانە لەوێ دابەزین ناردیان بە شوێن ماڵ و منداڵەکانیانا ئەوانیش هاتنە لایان، تا چەند ماڵێکی لێ کۆبووەوە، ئیسماعیل ـ علیه السلام ـ یش لە ناو منداڵی ئەوانا گەورە بوو، عەرەبییان لێ فێر بوو. [ئەوەڵ کەسێ لە ئەولادی ئیبراهیم ـ علیه السلام ـ کە بە فەصیحی تەکەللومی بە عەرەبیی کردبێ حەزرەتی ئیسماعیلە ـ علیه السلام] حەزرەتی ئیسماعیل ـ علیه السلام ـ گەورە بوو، لەناو ئەوانا نەفیس و تەبیعەت بڵند بوو، خستنیە حیرەتەوە، کە

بلووغی بوو کچێکی خۆیـانیـان لێ نیکـاح کرد [نـاوی عەمـارەی کچی سەعد بوو].

دایکی حەزرەتی ئیسماعیل ـ علیه السلام ـ وەفاتی کرد [عومری نەوەد ساڵ بوو، حەزرەتی ئیسماعیل ـ علیه السلام ـ لە حیجرا دفنی کرد] ئیبـــراهیم ـ علیـــه الصـلاة والســلام ـ لە دوای ئەمـە کە حەزرەتی ئیسمـاعیـل ژنی هێنـا تەشـریفی هات بە شوێن ئەوەدا ئەگـەڕا کە لەوێ تەرکی کردبوو. ئیسماعیل ـ علیه السلام ـی لە ماڵەوە دەست نەکەوت پرسیی: کە لە کوێیە؟ ژنەکەی ئیسماعیل ـ علیه السلام ـ عەرزیکرد: چوە شتـێـکـمـــان بۆ پەیـــدا بکـــا. لە گوزەران و حاڵـیشیــانی پرسی. عەرزیکـرد: لە شەڕاین، لە تەنگانەو زەحمەتاین! لای ئیبراهیم ـ علیه السلام ـ شکایەتی لە ئەحواڵی خۆیان کرد. ئیبراهیم ـ علیه السلام ـ فەرمووی: کە مێردەکەت هاتەوە سەلامی لێبکەو پێی بڵێ: داری ژێر دەرگـاکـەی بگـۆڕێ. کە ئیسمـاعیـل ـ علیـه السلام ـ تەشریفی هاتەوە [بۆنی باوکی کرد] وەك حیسی ئەمەی کردبێ کە یەکێ هاتوە پرسیی: کەسێکتـان هاتـوەتـە لا؟ وتی: بەڵێ پیـاوێکی پیری واو وا هات. [وەك ئـستیخفــافی پێ بکـــا] خەبـــەری تۆی لێ پرسین، خەبـەرم دایـە، لە گوزەرانی پرسین، وتم: لەتەنگانەداین. فەرمـووی: هیچی راسپـاردن؟ عەرزیکرد: بەڵێ ئەمری پێکردم کە سەلامت لێ بکەم، وتیشی کە پێی بڵێ: داری ژێـر دەرگـاکـەی بگـۆڕێ. فەرمـووی: ئەو پیـاوە باوکمـە، ئەمری پێکردووم کە تەڵاقت بدەم، بچۆرەوە لای کەس و کاری خۆت. تەڵاقی داو ژنێکی تری لێ هێنان.

ئیبراهیم ـ علیه السلام ـ موددەییێکی تر صەبری لیٚکردن، له پاشا تەشریفی هاتەوە لایان، حەزرەتی ئیسماعیل ـ علیه السلام ـی له ماڵەوە دەست نەکەوت، تەشریفی چوە لای ژنەکەی [کە سەلـەمەی کچی موهەلهەلە]. حەزرەتی =ئیبراهیم هەواڵی حەزرەتی= ئیسماعیل ـ علیه السلام ـی لیٚ پرسی، عەرزیکرد: چوە رزقیٚکمان بۆ پەیدا بکا، فەرمووی: حاڵتان چۆنە؟ له مەعیشەت و گوزەرانی پرسین.. عەرزی کرد: ئیٚمە له خەیرو روفاهی یەتاین، حەمدو ثەنای خوای کرد. [عەرزیکرد: دابەزە شتیٚك بخۆ، شتیٚك بخۆرەوە. أخری] فەرمووی: طەعامتان چییە؟ عەرزیکرد: گۆشتە. فەرمووی: شەرابتان چییە؟ فەرمووی: ئاوە. ئیبراهیم ـ علیه السلام ـ فەرمووی: یا رەببی بەرەکەت بخەرە گۆشتیان و ئاویانەوە.

پیٚغەمەر ـﷺـ =فەرمووی: = ئەو وەختە دانەویٚڵەیان نەبوو، ئەگەر بیان بوایە بۆ ئەوەیش دوٚعای بەرەکەتی بۆ ئەکردن. فەرمووی: هیچ کەس نی یە بە دەوام هەر گۆشت و ئاو بخواو بخواتەوە له غەیری مەککەدا پیٚی بکەوێ. [ئەبوجەهم ـ رحمه الله ـ له ریوایەتی خۆیا ئەوەی لیٚ زیادکردوە کە: بووکەکەی عەرزیکرد: رەحمەتی خوات لیٚ بیٚ دابەزە بخۆو بخۆرەوە، فەرمووی: ناتوانم دابەزم ـ چونکی وەعدەی دابوو بە سارا کە دانەبەزێ، ئەمجا ئیذنی دا کە تەشریفی بچیٚتە لایان ـ عەرزیکرد: سەرو ریشت تیٚك ئاڵۆزاوە، ئایا سەرت نەشۆم و رۆنی لیٚ نەدەم؟ فەرمووی: ئەگەر ئەیکەی بیکە. بووکەکەی چوو مەقامی هیٚنا، مەقام ئەو رۆژە سپیی بوو، =وەك= بلوورو وەك دوڕ وابوو! له ناو ماڵی حەزرەتی

ئیسماعیل ـ علیه السلام ـابوو،بەسەر ولاخەکەیەوە پێی موبارەکی راستی لەسەر داناو لای راستی سەری شت، کە لە لای راستی بووەوە بەردەکەی بردە لای چەپیەوە، پێی موبارەکی چەپی خستە سەر، سەری بۆ دانەوان لای چەپی سەریشی شت، ئەو ئەثەرەی کە لە مەقاما دیارە جێ پاژنەو پەنجەی موبارەکی حەزرەتی ئیبراهیم ـ علیه السلام ـە] فەرمووی: کە مێردەکەت هاتەوە سەلامی لێ بکەو ئەمری پێ بکە داری ژێر دەرگای لە جێی خۆی بهێڵێتەوە. [ئیبراهیم ـ علیه السلام ـ تەشریفی رۆیی].

کە حەزرەتی ئیسماعیل ـ علیه السلام ـ تەشریفی هاتەوە فەرمووی: هیـچ کەستـان هاتـوّتـە لا؟ عەرزیکـرد: بەڵێ پیـاوێکی پیری هەیئەت جوانمان هاتەلا. ثەنای لەسەر حەزرەتی ئیبراهیم ـ علیه السلام ـ کرد. تۆی لێ پرسیم، خەبەرم دایێ، لە مەعیشەتی پرسین عەرزم کرد: کە لە خێـراین. فەرمـووی: هیـچ شتێکی راسپـاردن؟ عەرزیکـرد: بەڵێ سەلامت لێ ئەکاو ئەمرت پێ ئەکا کە عەتەبەی دەرگاکەت لە جێی خۆی بێڵەوە. [کە صەلاحی ماڵە، ئەبو جەهم] ئیسماعیل ـ علیه السلام ـ فەرمووی: ئەوە باوکمە تۆیش داری ژێر گرێژەنەی دەرگاکەی، ئەمری پێکردووم کە تەڵاقت نەدەم. [تۆ لە لام کەریم بوویو کەرامەتت لە لام زیادی کرد. ئەو ژنە دە کوڕی بوو بۆ ئیسماعیل ـ علیه السلام ـ ئەبو جەهم].

لە پاشـا ئیبـراهیم ـ علیـه السـلام ـ ئەوەنـدەی خوا ئیـرادەی کردبوو صەبـری لێکـردن، لە پاشـا تەشـریفی هاتەوە لایان. ئیسماعیل ـ علیه السـلام ـ لە ژێـر ئەو دارە گەورەدا کە ئیبـراهیم ـ علیـه السـلام ـ ئەوو

دایکی لە ژێرا دابەزانن لە نزیکی زەمزەمەوە تیرێکی ئەتاشیی، کە چاوی بە باوکی کەوت تەشریفی لە بەری هەڵسا، باوك لەگەڵ ئەولاداو ئەولاد لەگەڵ باوکا چی ئەکەن کردیان [یەعنی ئیسماعیل ـ علیه السلام ـ دەستی ئەوی ماچ کردو، ئیبراهیم ـ علیه السلام ـ یش سەروچاوی ئەوی ماچ کرد]. لە پاشا ئیبراهیم ـ علیه السلام ـ فەرمووی: یا ئیسماعیل خوا شتێکی پێ ئەمر کردووم. ئیسماعیل ـ علیه السلام ـ عەرزیکرد: چی ئەمر پێ‌فەرمووی بیکە. فەرمووی: موعاوەنەتم ئەکەی؟ عەرزیکرد: موعاوەنەتت ئەکەم. فەرمووی: ئەمری پێ فەرمووم لێرەدا بەیتێ دروست بکەم، ئیشارەیکردە تەپۆڵکەیێ کە بەرزایی بوو بەسەر ئەطرافیا. ئیتر ئەو وەختە بناغەی بەیتیان بەرزکردوە. ئیسماعیل ـ علیه السلام ـ بەردی ئەهێناو ئیبراهیم ـ علیه السلام ـ بینای ئەکرد تا بیناکە بەرز بۆوە [بەرزیی نۆ ذیراع و=پانیی لە ئەرازا یەعنی=دەورەی سی زیراع بە زیراعی خۆیان. أبوجهم].

کە بیناکەی بەرزبۆوە ئیسماعیل ـ علیه السلام ـ حەجەری مەقامی هێنا بۆ ئیبراهیم ـ علیه السلام ـی دانا، تەشریفی لە سەری راوەستا. ئیبراهیم ـ علیه السلام ـ بینای ئەکردو ئیسماعیل ـ علیه السلام ـ بەردی ئەدایێ، ئەیان فەرموو: ئەی خوایا لێمان قەبووڵ بکە؛ چونکی هەر تۆی گوێت لە دەنگمان بێ‌و عیلمت پێمان ببێ.

[وتوویانە لە دنیادا بینایێ نیی‌یە کە لە کەعبە شەریفتر بێ، ئەوی ئەمری بە بینای فەرموە (رب العالمین)ە حەزرەتی جیبریل ـ علیه السلام

ـ تەبلیغی ئەو ئەمــرەی کردوون و موهــەنـدیسیی بۆ کردوون. حەزرەتی ئیبراهیم ـ علیه السلام ـ وەستای بووو حەزرەتی ئیسماعیل ـ علیه السلام ـ شاگردی بوە. قسطلاني]

لە حەدیثی عوثمــانــا ئەفــەرمــوێ: روکن و مەقـامی بۆ نازڵ بوو، ئیبراهیم ـ علیه السلام ـ تەشریفی ئەوەستاو ئیسماعیل ـ علیه السلام ـ بۆی بەرزئـەکـردەوە تا گەیی یـەوە ئەو جێیـەی کە ئێستـە روکنی لێیە، ئەو رۆژە روکنی لەو جێیــە دانــا، مەقـامی هێنـا نووسـانی بە بەیتـەوە. کە ئیبراهیم ـ علیه السلام ـ لە بینای بەیت بۆوە جیبریل ـ علیه السلام ـ تەشـریفی هاتـە لای، هەمـوو مەنـاسیکی حەجی پێ نیشان دا، لە پاشا حەزرەتی ئیبــراهیم ـ علیــە السـلام ـ تەشـریفی لەسـەر مەقـام وەستـا فەرمــووی: (أیهـا النـاس) ئیجـابـەتی دەعـوەتی خوای خۆتـان بکـەن، ئیبــراهیم و ئیسمـاعیـل ـ علیهمـا الصـلاة والسـلام ـ لەو مەواقیفـانـەدا تەشــریفیــان وەستــا. ئیبــراهیم و سارة ـ علیهمــا السـلام ـ لە (بیت المقدس)ەوە حەجی بەیتیان کرد، لە پاشانا ئیبراهیم ـ علیه السلام ـ تەشریفی گەڕایەوە بۆ شام و لەوێ وەفاتی کرد].

**١٢/١٤٩٣ـ عن أبي هريــرة [رضي الله تعـالى عنـه] أن رسـول الله ـﷺـ قال: لم يكـذب إبـراهيم النبي ـ عليـه الصـلاة والسـلام ـ قط إلا ثلاث كَذَبات: ثنتين في ذات الله؛ قوله: ﴿إني سقيم﴾. وقوله: ﴿بل فعله كبيرهم هذا﴾. وواحدة في شأن سارة؛ فانه قدم أرض جبّار ومعه سارة [بنت هادان ملك حران] وكانت أحسن الناس، فقال لها: إن هذا الجبـار إن يعلم أنـكِ امـرأتي يغلبني عليـكِ، فإن سألـكِ فاخبـريه أنكِ**

أختي. فإنكِ أختي في الإسلام، فإني لا أعلم في الأرض مسلماً غيري وغيركِ.

فلما دخل أرضه رآها بعض أهل الجبار، آتاه فقال له: لقد قدم أرضك امرأة لا ينبغي لها أن تكون إلا لك: فأرسل إليها، فأُتيَ بها، وقام إبراهيم ـ عليه السلام ـ الى الصلاة، فلما دخلت عليه لم يتمالك أن بسط يده إليها، فقبضت يده قبضة شديدة، فقال لها: اُدعي الله أن يطلق يدي ولا أضركِ، ففعلت، فعاد، فقُبضت أشد من القبضة الأولى، فقال لها مثل ذلك ففعلت، فعاد، فقبضت أشد من القبضتين الأوليين فقال: اُدعي الله أن يُطلق يدي فلكِ الله أن لا أضركِ، ففعلت وأطلقت يده. ودعا الذي جاء بها، فقال له: إنك إنما أتيتني بشيطان ولم تأتني بإنسان! فأخرجها من أرضي وأعطها هاجر، قال: فأقبلت تمشي، فلما رآها إبراهيم ـ عليه الصلاة والسلام ـ إنصرف. فقال لها: مهيم؟ قالت: خيرا؛ كفَّ الله يد الفاجر وأخدم خادما. قال أبو هريرة: فتلك أمكم يا بني ماء السماء. م ـ ٩/٢٣٦. خ ـ ٥/٣٤٠. ح ـ ٤/٩٨ بفرق ما.

١٣/١٤٩٤ـ وفي خ ـ ٤/٩٨ عنه قال: قال النبي ـﷺـ: هاجر إبراهيم ـ عليه السلام ـ بسارة، فدخل بها قرية فيها ملك من الملوك [القرية مصر أو الأردن] أو جبار من الجبابرة فقيل [له]: دخل إبراهيم بامرأة من أحسن النساء [وشّى به حنّاط، وكان إبراهيم ـ عليه الصلاة والسلام ـ يمتار منه] فأرسل إليه أن: يا إبراهيم من هذه التي معك؟ قال: أختي. ثم رجع إليها، فقال: لا تكذبي حديثى فإني أخبرتهم أنكِ أختي

والله إنْ على الأرض من مؤمن غيري وغيركِ. فأرسل بها إليه، فقام إليها، فقـامت توضأ وتصلي. فقـالت: أللهم إن كُنت آمنت بك وبـرسـولـك وأحصنت فرجي إلا على زوجي فلا تسلط علي الكـافـر! فغط حتى ركض برجله ـ وقـالت: أللهم إن يمت يقـال: هي قتلتـه. فأرسـل ثم قام إليهـا فقـامت توضأ وتصلي وتقـول: أللهم إن كنت =آمنت= بك وبـرسـولـك وأحصنت فرجي إلا على زوجي فلا تسلط علي هذا الكـافـر! فغـط حتى ركض برجله ـ فقـالت: أللهم إن يمت فيقـال:هي قتلته. فأرسل في الثانية أو الثـالثـة. فقـال: والله ما أرسلتم إلي إلا شيطانا! إرجعوها إلى إبراهيم وأعطوها آجر [أبوها من ملوك القبط] فرجعت الى إبراهيم ـ عليه السلام ـ فقـالت: أَشْعِـرْتُ أن الله كبت الكـافـر وأخـدم وليـدة. ح ـ ٤ /٩٨. ح ـ ٤ /٣٥٦ مختصرا.

تەرجەمە:

پێغەمەر ـﷺـ فەرمووی: ئیبراهیم پێغەمەر ـﷺـ لە سێ درۆ زیاتر قەط درۆی نەکردوە، دوانی دەرحەق خوا، یەکێکی کە بتەکانی شکان وتیان: تۆ شکانوتە؟ فەرمووی: گەورەکەیان شکانوویەتی. دوەمی کە قەومەکەی چوە دەرەوە بۆ جەژن، ئەو بۆ خاتری =ئەوە= بتەکان بشکێنێ خۆی بەنـەخـۆش خست و فەرمووی: نەخۆشم. لەگەڵیان نەچوو مایەوەو بتەکانی شکانن. سێیەمیشی دەرحەق سارا کە فەرمووی: ئەمە خوشکمە [ئـەمـانـە لە حەقیقـەتا هیچیان درۆ نین؛ چونکی دوو مەعنا هەڵەگرێ، مەقصـوودی ئەو مەعنـایـەیـە کە درۆ نی‌یـە، مەعنا ظاهیرەکەی مەقصوود نەبـوە؛ چونکی هەمـوو پێغـەمـەرێ لە درۆ مەعصـوومن. ئەبو سەعیدی

خدري ـ رضي الله تعالى عنه ـ ئەفەرموێ: پێغەمەر ـ ﷺ ـ فەرمووی: ئەو سێ کەلیمەی کە حەزرەتی ئیبراهیم فەرمووی: بە کوللێکی مودافەعەی دینی خوای پێکردوە؛ بە دوانی مودافەعەی ئەمەی پێکردوە کە خوا ـ عزوجل ـ شەریکی نییە. بە یەکێکی مودافەعەی سارەی پێکردوە؛ چونکی صوورەتەکەیان صوورەتی درۆیە بۆیە پێغەمەر ـ ﷺ ـ ناوی بردوون بە درۆ. کە فەرموویەتی ناخۆشم مەقصوودی نارەحەتی دڵی بوە بە سەبەبی شیرك و کوفری ئەوان، ئەوەی کە فەرموویەتی: گەورەکەیان بتەکانی تری شکانوون مەقصوودی وابوە ئێوە تەعظیمیان ئەکەن، تەعظیمی گەورەکەیان لەوانی تر زیاتر ئەکەن ئەو بوو بە سەبەبی ئەمە کە ئیهانەتیان بکەم و بیان شکێنم. یەعنی ئەگەر شتێکی لە دەست بێ بۆ ئێوە نەیئەهێشت کە بتەکانی تر لە پێش چاوی ئەو بشکێنم، ئێوەیش تێبگەن کە ئەویش هیچ نییەو هیچی لە دەست نایێ. بە سارەی فەرموە کە خوشکمە خۆی ـ علیه السلام ـ تەئویلی کردوە؛ فەرموویە: خوشکی دینمە (المؤمنون إخوة)].

ئیبراهیم ـ علیه الصلاة والسلام ـ حەزرەتی سارای لە خزمەتا ئەبێ، حەزرەتی سارایش لە جوانترینی ژنی ئەو عەصرە بوو، داخڵی موڵکی جەببارێك ئەبێ، بە سارا ئەفەرموێ: ئەگەر ئەم جەببارە بزانێ تۆ ژنی منی تۆیشم لێ داگیر ئەکاو غیرەتیش ئەیهێنێتە سەر ئەوە کە منیش بکوژێ. ئەگەر لێی پرسیت بڵێ: من خوشکی ئەوم (ذاتا) تۆ لە دینا خوشکی منی، لەسەر ئەرز غەیری من و تۆ هیچ کەس نازانم کە موسوڵمان بێ.

حەزرەتی ئیبراهیم ـ علیە السلام ـ کە تەشریفی هاتە خاکی ئەو جەببارە، بەعزێ لە پیاوانی ئەو جەببارە چاوی بە حەزرەتی سارا کەوت، هات خەبەری دا بە جەببارەکە، پێی‌وت: ژنێ هاتۆتە خاکی تۆوە بە تۆ نەبێ بە کەس لایەق نی‌یە، ناردی بە شوێنیا هێنایانە لای. ئیبراهیم ـ علیە الصلاة والسلام ـ دەستی کرد بە نوێژکردن. کە حەزرەتی سارە چوە لای خۆی پێ‌ڕاگیر نەکرا دەستی بۆ درێژکرد، دەستی وشك بوو زۆر بە شیددەت! پێی‌وت: دۆعام لە لای خوا بۆ بکە دەستم بەرەڵلا بێ هیچ زەرەرت پێ ناگەیێنم. دۆعای بۆ کرد دەستی بەرەڵلا بوو، دیسان دەستی بۆ کێشایەوە، دەستی لە جاری پێشوو زیاتر وشك بوو. دووبارە پێی‌وت: دۆعام بۆ بکە دەستم بەرەڵلا بێ هیچ زەرەرم بۆت نابێ، دۆعای بۆ کرد دەستی بەربوو. دیسان دەستی بۆ کێشایەوە، دەستی لە دوو جارەکەی تر زیاتر وشك بوو. پێی‌وت: دۆعام بۆ بکە خوات لەسەر بێ کە زەرەرم بۆت نەبێ. دۆعای بۆ کرد، دەستی بەربوو بانگی ئەوەی کرد کە بۆی هێنابوو، پێی‌وت: تۆ ئینسانت بۆ نەهێناوم هەر شەیتانێکت بۆ هێناوم! لە ئەرزی من بیکەرە دەرێ‌و هاجەری بدەرێ. فەرمووی: حەزرەتی سارا گەڕایەوە بۆ خزمەت حەزرەتی ئیبراهیم ـ علیە السلام ـ کە حەزرەتی ئیبراهیم ـ علیە السلام ـ چاوی پێکەوت سەلامی نوێژی دایەوەو فەرمووی: چە خەبەرێکت پێیە؟ عەرزی‌کرد: خوا ـ عزوجل ـ لە دەستی فاجیرەکە حیفظی کردم و خادیمێکیشی دایێ. ئەبوهورەیرە ـ رضي الله تعالى عنە ـ ئەفەرموێ: ئەی ئەولادی بارانی ئاسمان ئەوە دایکی ئێوەیە. [چونکی هەر لە صەحراو دەشتا بوون و هەر ئاوی بارانیان خواردۆتەوە، بە ئەولادی هاجەر ئەڵێن: ئەولادی ئاوی ئاسمان].

لە حەدیثـەکـەی، ترا ئەفـەرمـوێ: ئیبـراهیم ـ علیـە السلام ـ لەگەڵ سارادا هیجرەتی کرد، تەشریفی چوە شارێك کە میصرە یا ئەردەنە یەکێ =لـە= پادشـایـانی تیـابوو، یا فەرمووی: جەبارێ لە جەبارانی تیابوو، حەنناط، کە حەزرەتی ئیبراهیم ـ علیە السلام ـ موعامەلەی لێ ئەکرد، بەو پادشایەی وت: ئیبراهیم ژنێکی هێناوە لە جوانترینی هەموو ژنانە، ئەو پادشایە ناردی‌یە خزمەت حەزرەتی ئیبراهیم ـ علیە السلام ـ: ئەو ژنەی کە لەگەڵتە کێیە؟ فەرمووی: خوشکمە. گەڕایەوە بۆ لای حەزرەتی سارا پێی‌فەرموو کە قسەکەم بە درۆ دەرنەخەی من وام خەبەر داوەتێ کە تۆ خوشکی منی. وەڵڵاهی لەسەر ئەرز غەیری من و تۆ موئمین نی‌یە.

سارای نارد بۆ پادشـاکــە، هەڵسـا بچـێ بە لایـەوە حەزرەتی سارا دەزنوێژی شت و نوێژی ئەکردو فەرمووی: خوایا ئەگەر ئیمانم هێناوە بە تۆو بە رەسـوولی‌تۆو لە غەیـری مێـردم خۆم موحـافـەظە کردوە ئەم کافرەم بەسـەرا موسـەللەط مەکـە! صەرعی لێ هات تا لنگـەفـرکێی پێکـەوت! حەزرەتی سارا فەرمووی: یارەببی ئەگەر بمرێ پێم ئەڵێن تۆ کوشتت. لەوە بەربوو. دەفعەی دوەم‌بوویا سێیەم بوو، وتی:وەڵڵاهی ئێوە شەیتانتان ناردوتـە لام، بی‌نێـرنـەوە بۆ ئیبـراهیم ـ علیـە السلام ـ ئاجەری بدەنێ. حەزرەتی سارا تەشریفی گەڕایەوە بۆ خزمەت ئیبراهیم ـ علیە السلام ـ عەرزی کرد: کە مەعلوومم بوو خوا ـ عزوجل ـ کافرەکەی پەست کردو جاری‌یەکی کرد بەخادیم.

ئەم دوو حەدیثەم لە شەفاعەتا نووسیبێ لێرە مەینووسن.

## يعقوب، ويوسف، وإسحاق، وابراهيم ﴿عليهم الصلاة والسلام﴾

١٤/١٤٩٥ ـ عن ابن عمر ـ رضي الله تعالى عنهما ـ أن النبي ـ ﷺ ـ قال: الكريم ابن الكريم، ابن الكريم، ابن الكريم يوسف بن يعقوب، بن إسحاق، بن إبراهيم عليهم السلام. ح ـ ٥/٣٦٩.

تەرجەمە:

پێغەمەر ـ ﷺ ـ فەرموویەتی: یوسف خۆی کەریمە کوڕی کەریمە کە یەعقووبە، یەعقووبیش کوڕی کەریمە کە ئیسحاقە، ئیسحاقیش کوڕی کەریمــە کە حەزرەتی ئیبــراهیمی خەلیلە. حەزرەتی یوسف خۆیشی و باوك و دوو باپیری پێغەمەر بوون ـ علیهم الصلاة والسلام ـ ئەم شەرەفە بۆ کێ هەیە؟ کە ئیبراهیم خۆیو کوڕو کوڕەزاو کوڕەزازای، ئیسحاق باوك و کوڕو کوڕەزای، یەعقووب خۆیو کوڕو باوك و باپیری ـ علیهم الصلاة والسلام ـ هەموو بە ریزە پێغەمەر بوون!

## موسى ﴿عليه الصلاة والسلام﴾

١٥/١٤٩٦ـ عن أبي هريـرة [رضي الله تعـالى عنه] قال: بينما يهودي يعـرض سلعة أُعْطِي بهـا شيئا كرهه فقال: لا [أبيعها بهذا الثمن] والذي اصطفى موسى على البشـر! فسمعـه رجـل من الأنصار [أي من الناصرين لدينه، لا من قبيلة الأنصار؛ لأن عمرو بن دينار ـ رحمه الله ـ روى أنه أبو بكـر الصـديق ـ رضي الله تعـالى عنـه ـ] فقـام فلطم وجهـه وقال: تقول: والـذي اصطفى موسى على البشـر والنبي ـ ﷺ ـ بين أظهـرنـا؟! فذهب

اليهـودي . م] إليـه [الى رسـول الله ـﷺ ـ م] فقال : يا أبا القاسم إن لي ذمة وعهـدا فمـا بال فلان لطم وجهي؟ فقـال [رسول الله ـﷺ ـ م] : لم لطمت وجهه؟ فذكره [قال : قال : يا رسول اللهوالذي اصطفى موسى ـ عليه السلام ـ على البشر وأنت بين أظهرنا . م] فغضب النبي [رسول الله . م] ـﷺ ـ حتى رؤي [عــرف . م] الغضب في وجهـه . ثـم قال : لا تفضلوا بين أنبيـاء الله . فإنه ينفخ في الصور فيصعق من في السماوات ومن في الأرض إلا من شاء الله ، ثم ينفـخ فيـه أخـرى فأكـون أول من بعث ، فإذا موسى آخذ بالعرش [بقـائمـة من قوائم العـرش ..ح ـ ٥ / ٣٨٦ . أخـرى] فلا أدري أحـوسب بصعقة يوم الطور [لما سأل الرؤية] أم بعث قبلي؟ ولا أقول إن أحدا أفضل من يونس بن متي! ح ـ ٥ / ٣٩٣ . م ـ ٩ / ٢٤٤ . د، ن .

تەرجەمە :

ئەبـوهـورەيـرە ـ رضـي الله تعـالى عنـه ـ ئەفـەرمـوێ : جوولـەکەیێ مەتــاعێکی هێنــا بۆ ئەفـرۆت ، پارەیێکیـان دایێ بە موقـابیلی ئەوە لای جوولەکەکە لە قیمەتی مەتاعەکە کەمتر بوو پیێ رازیی نەبوو، جوولەکەکە وتی : قەسـەم بەو خوایـەی کە حەزرەتی مووسـای بەسـەر هەمـوو کەسـا تەرجیـح داوە =بـەو نرخـە نایـدەم= حەزرەتی ئەبـوبـەکری صەدیق ، کە ناصیــری دینی خوا بوە، بیستیو بۆی هەڵســا شەقــەزلــەیێکی لێـدا، فەرمووی : ئێمە پێغەمەر ـﷺ ـ مان لە ناوایەو تۆ ئەڵێی : قەسەم بەوەی کە مووسـای تەفضیـل داوە بەسـەر هەمـوو بەشـەرا؟! جوولـەکـەکە چوە خزمەت پێغەمەر ـﷺ ـ عەرزیکرد : (یا أبو القاسم)من عەهدو ذیمەتم لە ناو ئێــوەدا هەیــە کەچی فلان زللەیێکی لێـدام! پێغـەمـەر ـﷺ ـ پێی

فەرمــوو: بۆچی زللەت لێــداوە؟ عەرزیکــرد: (یــارســـول الله) تۆ لە ناومـانـایت و کەچی ئەو ئەڵێ: قەسـەم بەوە مووسـای ئینتیخـاب کردووەو تەرجیحی داوە بەســەر هەمـوو بەشـەرا. پێغـەمـەر ـﷺـ رقی هەڵسـا تا ئەثــەری رقــەکــەی لە دەمـوچـاوی موبـارەکی دیـاریی دا، لە دواییـدا فەرمـووی: لە بەینی پێغـەمـەرانـا تەرجیـح مەدەن؛ کە ئەم پێغەمەرە لەو پێغـەمـەرە زیـاتـرە [یـەعنی عیلمی ئەوە لای خوایـەو ئەو کەسەی کە ئەو خەبەری داوەتێ] چونکی بە صووری ئیسرافیلا نەفخ ئەکرێ غەیری ئەو میقـدارەی کە خوا ـ عزوجـل ـ ئیـرادەی کردوە هەمـوو ئەمـرن، لە دوای موددەتێـك دەفعـەیێکی تر فووی پیـا ئەکـرێ، من لە پێش هەمـوو کەسا زیندووئەکرێمەوە کە تێئەفکرم مووسا پێچکی عەرشی گرتوە! نازانم صەعقەی[1] رۆژی طووری [کــە داوای چاوپێکــەوتنی بە خوا کرد] بۆ خراوەتە بری صەعقەی ئاخری زەمان کە پێی هیلاك نەبوە، یاخۆ لە پێش منــا زیندوکراوەتەوە؟ من ناڵێم کە هیــچ کەسێ لە یونسی کوڕی مەتتی گەورەو باشترە!

موسا ـ علیه السلام ـ لە پێش ئەو نەفخی صوورەدا وەفاتی کردوە، دیارە بەوە هیلاك نەبوە، کە وابێ چۆن صەعقەی طوور ئەکەوێتە بری صەعقەی نەفخی صوور. (تأمل یا سلام! علیك السلام واجب)

---

(١) صەعقـە: هەورەتـریشقـە. مەبـەستی ئەوەیـە کە حەزرەتی مووسـا لەسەر داوای گەلەکەی داوای لە خودا کرد کە خودا ببینن. خودایش فەرمووی: من نابینن، بەڵام تەماشای ئەو کێوە بکەن، کە سەرنجی کێوەکەیان داو خوا نووری ذاتی خۆیی پیشان دا؛ کێوەکە وردو خاش بوو، حەزرەتی مووسایش بێهۆش کەوت، وەك خودا دەفەرموێ. ﴿فلما تجلّی ربه للجبل جعله دکاً، وخرَّ موسی صعقا﴾.

١٦/١٤٩٧ـ أبو هريرة ـ رضي الله تعالى عنه ـ قال: إستب رجل من المسلمين [أبو بكر الصديق ـ رضي الله تعالى عنه ـ]ورجل من اليهود، فقال المسلم: والذي اصطفى محمدا ـﷺـ على العالمين! في قسم يقسم به. فقال اليهودي: والذي اصطفى موسى على العالمين! فرفع المسلم عند ذلك يده فلطم اليهودي. فذهب اليهودي الى النبي ـﷺـ فأخبره الذي كان من أمره وأمر المسلم. فقال: لا تخيروني على موسى [من تلقاء أنفسكم، فإن ذلك قد يفضي إلى العصبية، فينتهز الشيطان فرصة فيوقع في الإفراط والتفريط] فإن الناس يصعقون، فأكون أول من يُفيق، فإذا موسى باطش بجانب العرش، فلا أدري أكان فيمن صعق فأفاق قبلي، أو كان ممن استثنى الله؟ ح ـ ٥/٣٨٦.

تەرجەمە:

ئەم حادیثەیە عەینی حادیثەکەی پێشوە، لێرەدا ئەفەرموێ: موسوڵمانێك و جوولەکەیێ شەڕەجوێنیان کرد، یەعنی دەمقاڵیان بوو، لێرەدا ئەفەرموێ: لە سوێندێکا کە موسوڵمانەکە خواردی فەرمووی: قەسەم بەوەی کە محەمەدی ـﷺـ ئینتیخاب کردوە بەسەر عالەما، لەوێدا ئەفەرموێ: بەسەر بەشەرا [موراد لە عالەم بەشەرە]. پێغەمەر ـﷺـ لە ئەوەڵەوە فەرموویەتی: ئەنبیا بەعزێکیان بەسەر بەعزێکیانا تەرجیح مەدەن، لە پاشا فەرموویەتی: منیش بەسەر مووسادا تەرجیح مەدەن [چونکی ئەوە ئەکێشێتە سەر رقەبەریی، ئینسان لە حەدی خۆی تێئەپەڕێو، شتی بێ مەعنا ئەڵێو ئەبێ بە سەبەبی ظەفەری شەیطان بە خەڵق].

١٤٩٨/١٧ـ عن أبي هريرة ـ رضي الله تعالى عنه ـ قال: أرسل ملك الموت إلى موسى [عليه السلام ـ فقال: أجب ربك. م] فلما جاءه صكه ففقأ عينه، فرجع إلى ربه فقال: أرسلتني إلى عبد لا يريد الموت [قال: فردّ الله عليه عينه] قال: ارجع إليه فقل له:[الحياة تريد؟ فإن كنت تريد الحياة فضع يدك. م] يضع يده على متن ثور فله بما غطت يده بكل شعرة سنة. قال: أي رب. ثم = ماذا=؟ قال: ثم الموت. قال: فالآن. =قال= فسأل الله أن يدنيه من الأرض المقدسة رمية بحجر. فقال رسول الله ـﷺـ: فلو كنت ثم لأريتكم قبره إلى جانب الطريق عند الكثيب الأحمر.
ح ـ ٣٨٦/٥. م ـ ٢٤١/٩. ح ـ ٤٢٢/٢. ن.

تەرجەمە:

ئەبو هورەیرە ـ رضي الله تعالى عنه ـ ئەفەرموێ: خوا (ملك الموت)ی نارده لای مووسا [لە صوورەتی بەشەرا کە قەبضی رۆحی بکا] کە هاتەلای عەرزیکرد: ئیجابەتی دەعوەتی رەببی خۆت بکە، کە زللەییەکی لێدا چاوێکی دەرپەڕان. حەزرەتی ئیزرائیل ـ علیه السلام ـ گەڕایەوە بۆ خزمەت خوا عەرزیکرد: منت نارد بۆ لای عەبدێ کە مردنی ناوێ. خوا چاوی نایەوە جێی خۆی. فەرمووی: بچۆ پێی بڵێ: ئەگەر ژیانت ئەوێ دەست بنێرە سەر پشتی گاجووتێ، دەستت چەندە جێ ئەگرێ بە قەد هەر موویێکی ساڵێکت عومر بێ. فەرمووی: یارەببی لە دوای ئەوە؟ فەرمووی: دوای ئەوە مردنە. فەرمووی: یارەببی کە وابێ ئێستە. طەلەبی لە خوا کرد کە بە قەد بەردهاوێژ ێ لە ئەرزی موقەددەسی نزیك بخاتەوە. پێغەمەر ـﷺـ فەرمووی: ئەگەر لەوێ بوومایە قەبرەکەییم پێ نیشان ئەدان، لە تەنیشت رێگەوەیە لای گردێکی لمی سوور.

[ئـەگـەر ئینسـان ئیمانی ببێ بە قودرەتی خواو خەلق و تەکـوینی لێی عەجایب نابێ کە حەزرەتی مووسا ـ علیه السلام ـ بە زللەیێ چاوی حەزرەتی ئیـزرائیـل ـ علیـه السـلام ـ دەرپـەڕێنێ. هەمـوو موسـوڵمـان (الحمد لله) بروایان هەیە بەوە کە هیچ مومکینێ لە قودرەت و ئیرادەی خوا ـ عزوجل ـ دەرناچێ.]

١٨/١٤٩٩ـ أبو هريرة ـ رضي الله تعالى عنه ـ قال: قال رسول الله ـﷺـ: إحتج آدم وموسى ـ عليهما السلام ـ عند ربهما فحج آدم موسى [عليهما السلام] قال موسى: أنت آدم الذي خلقك الله بيده، ونفخ فيك من روحه، وأسجد لك ملائكته، وأسكنك في الجنة ثم أهبطت الناس بخطيئتك إلى الأرض؟! فقال آدم ـ عليه السلام ـ: أنت موسى الذي اصطفاك الله برسالته وبكلامه، وأعطاك الألواح فيها تبيان كل شيء، وقرَّبك نَجياً فبكم وجدت الله كتب التوراة قبل أن أخلق؟ قال موسى [عليه السلام]: بأربعين عاما. قال آدم [عليه السلام]: هل وجدت فيها ﴿وعصى آدمُ ربه فغوى﴾؟[1] قال: نعم. قال: أفتلومني على أن عملت عملا كتبه الله عليَّ قبل أن يخلقني بأربعين سنة؟! قال رسول الله ـﷺـ: فحج آدم موسى. م ـ ٨٦/١٠، ٨٥. خ ـ ٣٤١/٩. خ ـ ٣٨٧/٥ بأخصر.

[ئەم حەدیثە موناسب وایە کە لە فەضائیلی ئادەم ـ علیه السلام ـ ا بنووسرێ. موناسبی قەدەریشە].

(١) طه/١٢١.

**تەرجەمە :**

پێغەمەر ـ ﷺ ـ فەرمووی: حەزرەتی ئادەم و مووسا ـ علیهما السلام ـ لە حوضـووری خوا موناظەرەیان کرد. حەزرەتی ئادەم ـ علیه السلام ـ غەڵەبەی کرد بەسەر حەزرەتی مووسا ـ علیه السلام ـ احەزرەتی مووسا ـ علیه السلام ـ فەرمووی: تۆ ئەو ئادەمەی کە خوا ـ عزوجل ـ بە دەستی قودرەتی خۆی دروستی کردیو، رۆحی خۆیی کردی بەبـەراو، ئەمـری کرد بە مەلائیکە سەجدەیان بۆ بردیو، لە بەهەشتدا داینایی‌و، لە پاشا بە خەطاییکی خۆت خەڵقت لە بەهـەشت خستـە خوارێ سەر ئەرز؟ حەزرەتی ئادەم ـ علیه السلام ـ فەرمووی: تۆ ئەو مووسایەی کە خوا ـ عزوجـل ـ بە رەسـوولیی‌و کەلامی خۆی تۆی لە ناو خەڵقـا هەڵبـژاردو، چەند لەوحەی پێ عەطا فەرمووی کە بەیانی هەموو شتێکی (ماکان)و (مایکون)ی[1] تیابوو، بە خەڵوەت لەگەڵتا لە خۆیی نزیك خستیەوە.. بە چەند ساڵ لە پێش خەلقی منا تەورات نووسراوە؟ حەزرەتی مووسا ـ علیه السلام ـ فەرمووی: بە چل ساڵ. حەزرەتی ئادەم ـ علیه السلام ـ فەرمووی: بۆ لۆمەم ئەکەی لەسەر شتێك کە بە چل ساڵ لە پێش خەلقما خوا لەسـەری نووسیـوم کە بیکـەم؟ پێغـەمەر ـ ﷺ ـ فەرمووی: حەزرەتی ئادەم حەزرەتی مووسای ئیلزام دا[2]..

---

(١) واتە چی بووەو چی لەمەولا ئەبێ هەمووی لەو لەوحانەدا نووسراوەو بەیان کراوە.

(٢) دانەر ـ خ ـ ئەو پرسیارەی ئادەمی لەبیرچوە کە فەرمووی: (فهل وجدت فیها ﴿وعصى آدم ربه فغوى﴾)؟ واتە تەورات ئەوەی تیابوو ـ کە لە قورئانیشدایەو خوا ئەفەرموێ ـ: ئادەم لە فەرمانی خوا دەرچوو ئەو مەبەستە باشە کە مانەوەیە لە بەهەشتدا لە کیسی چوو؟

## ذِكرُ بني إسرائيل

١٩/ ١٥٠٠- أبـو هريـرة - رضي الله تعالى عنه - يقول: قال رسول الله -ﷺ-: قيـل لبني إسـرائيـل: ادخلوا البـاب سجـدا وقولوا حطةٌ، فبدلوا، فدخلوا يزحفون على أستاههم، وقالوا: حبة في شعرة! ح - ٥/ ٣٨٢. م - ١٠/ ٤٦٦، ت. ح - ٧/ ٨٠، ١٢٥. وفيه: حطة حبة في شعرة.

تەرجەمە:

ئەبـوهـورەيـرە - رضي الله تعـالى عنـه - ئەفـەرموێ: پێغەمەر -ﷺ- فەرمـووی: ئەمـرکـرا بە بەنیئیسرائیل کە بەسەجدەبردن داخڵی دەرگای ئەو شارە ببن [کـە لە طەرەفی قیبلەیـانـەوە بوو] بیشڵێن: خوایـا طەڵەبی ئێمە لە تۆ ئەوەیە گوناهمان هەڵوەرێنی. [ئەوان بە قەولیش و بە فیعلیش موخـالـەفـەی ئەمـری خوایـان کرد] بە قنگـەخشکێ لە دەرگـاکـە چوونەژووریّو وتیان: طەڵەبی ئێمە دەنکێکە لە موویێکا [ئەم قسە بێ مەعنایەیان کرد، خوا - عزوجل - ئینتیقامی لێ ستەندن، طاعوونێکی بەسەرا موسەللەط کردن لە سەعاتێکا حەفتا هەزاریان لێمرد!]

٢٠/ ١٥٠١- قال حذيفة [رضي الله تعالى عنه] سمعته -ﷺ- يقول: إن رجلا كان فيمن كان قبلكم أتاه الملك ليقبض روحه، فقيل له: هل عملت من خير؟ قال: ما أعلم. قيل له: أنظر. قال: ما أعلم شيئا غير أنّي كنت أبايع الناس في الدنيا فأجازيهم [أي أتقاضاهم] فأُنظِر الموسر، وأتجاوز عن المعسر. فأدخله الله الجنة.

فقال: وسمعته يقول: إن رجلا حضره الموت فلما يئس من الحياة وصى أهله: إذا أنا مت فأجمعوا لي حطبا كثيرا، وأوقدوا فيه نارا حتى

**إذا أكلت لحمي وخلصت إلى عظمي فامتحشت [إحترقت] فخذوها فاطحنوها ثم انظروا يوما راحا فَاذْروه في اليم ففعلوا، فجمعه، فقال له: لم فعلت ذلــك؟ قال: من خشيتـك =فغفـر الله له= . قال عقبـة بن عمرو [البدري لحذيفة ـ رضي الله تعالى عنهما ـ]: وأنا سمعته يقول ذاك، وكان نبّاشا. ح ـ ٥/٤٢١. ح ـ ٥/٤٣٥.**

تەرجەمە:

حوذەیفە ـ رضي الله تعالى عنه ـ ئەفەرموێ: لە پێغەمەر ـ ﷺ ـ م بیست ئەیفـەرمـوو: پیـاوێ بوو لەمـەوپێش (ملك المـوت) هاتـەلای کە قەبضی رۆحی بکا، رۆیی قەبضی کرد، خوا زیندووی کردەوە لێی پرسی: هیـچ عەمـەلی چاکـەت هەیـە؟ عەرزی کرد: نازانم. ئەمری پێ فەرموو: فکـرکـەرەوە، عەرزی کـرد: هەر ئەوە ئەزانم لە دنیـادا موعـامەلەم لەگەڵ خەڵقـا ئەکـرد، کە داوام لێ ئـەکـردنەوە مۆڵەتی دەوڵەمەندم ئەداو، ئەوی نەیبوایە لێی خۆش ئەبووم. خوا ـ عزوجل ـ بەوە لێی خۆش بوو.

حوذەیفە ـ رضي الله تعالى عنه ـ ئەفەرموێ: هەم لە پێغەمەرم ـ عليه الصلاة والسلام ـ بیست ئەیفەرموو: پیاوێ کەوتە حاڵی جاو، کە لە ژیان مەئیووس بوو وەصیەتی لای ماڵ و مناڵی کرد: کە مردم دارێکی زۆر کۆبکـەنـەوە، ئاگـری تێ بـەردەن بمخـەنـە ناوی، کە گۆشتـەکـەی خواردم و گەیی یــە ئێسکم و تەواو سووتــام ئێسکــە سووتــاوەکـەم بێنن بیهــارن، مونتــەظیــری رۆژێ بن کە بای زۆر بێ بە بای بکـەن بۆ ناو بەحر! ئەوەیان لەگەڵ کرد. خوا کۆی کردەوە پێی فەرموو: بۆچ وات کرد؟ عەرزی کرد: لە ترسی تۆ. خوا لێی خۆش بو.

عەقەبەی کوڕی عەمری بەدری بە حوذەیفەی فەرموو ـ رضي الله تعالی عنهما ـ: منیش لە پێغەمەر ـﷺـ م بیست کە ئەوەی فەرموو. ئەو پیاوە کفن دز بوو.

٢١/١٥٠٢ـ عن أبي سعيد الخدري ـ رضي الله تعالى عنه ـ عن النبي ـﷺـ أن رجلا كان قبلكم [يسرف على نفسه. أخرى] رغسه الله مالا [أعطاه ووسع له فيه] فقال لبنيه، لما حُضِر، : أيَّ أب كنت لكم؟ قالوا خير أب قال: فإني لم أعمل خيرا قط، فإذا مت فأحرقوني ثم إسحقوني، ثم ذرّوني في يوم عاصف! [فوالله! لئن قدر عليَّ ربي ليعذبني عذابا ما عذبه أحداً. أخرى] ففعلوا. [فأمر الله ـ عزوجل ـ الأرض فقال: إجمعي ما فيكِ منه، ففعلت. أخرى] فجمعه الله ـ عزوجل ـ فقال: ما حملك [على ماصنعت. أخرى]؟ قال: مخافتك. فتلقاه برحمته. ح ـ ٤٣٤/٥. م ـ ١٩٣/١٠. وفيه: إذا مات فحرقوه، ثم اذروا نصفه في البر، ونصفه في البحر وفي أخرى: فقال للأرض: أدِّي ما أخذتِ، فاذا هو قائم. وفي أخرى: فإنِّي لم أبتئر [أي لم أدخر] عن الله خيرا. م ـ ١٩٦/١٠. وفي أخرى: فقال الله لكل شيء أخذ منه شيئا: أدِّ ما أخذت منه م ـ ١٩٦/١٠. والروايات كلها متقاربة الألفاظ متفقة في المعنى، وهذا القدر كافٍ.

تەرجەمە:

مەعنای وەك حەدیثەکەی پێشوە. ظاهیری بەعزێ ریوایەت وایە کە شکی بووبێ لەوەدا خوا قودرەتی بەسەریا بێ کە وای کرد!

نەوەوی ـ رحمـه الله ـ ئەفـەرمـوێ: (قَـدَرَ) بە مەعنـا (ضَیَّق)ەیە وەك لە (عمّ)دا ئەفـەرمـوێ: ﴿فقـدر علیـه رزقـه﴾[1] یەعنی رزقی تەنـگ کرد. ئەمیش ئەڵێ: ئەگـەر خوا تەنگم پێ هـەڵبچنێ عەذابێکم ئەدا کە کەسی بەو عەذابە عەذاب نەدابێ.

مەعنـای زیـادەکـەی تریشی وایـە: کە خوا ئەمر ئەکا بە ئەرزو بەحرو بە کوللی شتێ کە شتێکی لە خۆڵـەمێشـەکـەی ئەوی پێوە نووسابێ ئەیهێنێتەوەو زینـدووی ئەکـاتـەوە، مەقصـوود لەم حەدیثانە وایە کە هیچ کەس با غەرقی گوناهی کەبیرەیش بێ نابێ مەئیووس بێ لە مەرحەممەتی واسیعەی خوا، بۆ خاتـری ئەمـەیش کە ئینسـان بەم نەوعـە حەدیثـانـە کە دائیر ن بە رەحمەت موسلیمیش و بوخـاریش، بەڵکـو بەعـزێ لە راوییـەکـانیش، حەدیثی ئەو ژنەیشیان لەگەڵ ئەم حەدیثەدا نەقڵ کردوە، کە ئەوژنە بە واسیطەی ئەمە کە پشـیـلەیـێـکـی حەبس کردوە نەخـــۆی شتـی داوەتـێ، نە بەریداوە کە بە خەوش و خاڵ و مشکی ناومـــاڵ گوزەران بکـــا چوەتـە جەهـەننـەمـەوە. لە قورئانیشا وایە؛ لەگەڵ کوللی ئایەتێکی رەحمەت ئایەتێکی قەهریشی ذیکر فەرموە، بۆ خاتری ئەمە کە خەوف و رجا بەرابەر بن، لە غەیری حاڵی نەزعا ئەبێ خەوف زیـاتـر بێ، لە حاڵی نەزعـا ئەبێ رجـا زۆر زیاتر بێ لە خەوف (أنا عند ظن عبدي بي).

**٢٢/١٥٠٣ـ عن أبي هريـرة ـ رضي الله تعـالى عنـه ـ قال قال النبي ـﷺـ: إشتـرى رجـل من رجـل عقـارا له، فوجد الذي اشترى العقار في**

---

(١) الفجر/١٦. دەبێ دانەر مەبەستی لە (عم) جوزئی (عم) بێ.

عقـاره جرة فيهـا ذهب، فقال له الذي اشترى العقار: خذ ذهبك مني إنما اشتـريت منـك الأرض، ولم أبتـع منـك الذهب، وقال الذي له الأرض: إنمـا بعتـك الأرض ومـا فيها، فتحاكما إلى رجل. فقال الذي تحاكما اليه أَلَكُمـا ولـدٌ؟ قال أحـدهمـا: لي غلام، وقـال الآخـر: لي جاريـة. قال: أنكحوا الغلام الجارية وأنفقوا على أنفسهما منه وتصدقا. ح ـ ٥/٤٣٢، م ـ ٧/٢٨٩.

تەرجەمە:

پێغـەمـەر ـﷺـ فەرمـوویەتی: پیاوێ عەرصەیێ لە پیاوێك ئەكڕێ، ئەوی عەرصەكە ئەكڕێ جەڕەیێ ئاڵتوون لە عەرصەكەدا ئەدۆزێتەوە، بە صاحیبەكەی ئەڵێ: من هەر عەرصەكەم لە تۆ كڕیوە ئاڵتوونەكەییم لێ نەكـڕیـوی ئاڵتـوونـەكـەت بەرەوە. صاحیب عەرصـەكـە ئەڵێ: من عەرصەكەم بەوەوە كە تیایەتی بە تۆ فرۆتوە، موحاكەمە ئەبەنە لای پیاوێ، پێیان ئەڵێ: منداڵتان هەیە؟ یەكێكیان ئەڵێ: كوڕێكم هەیە، ئەوی تریان ئەڵێ: كچێكم هەیـە. ئەو پیـاوە پێیـان ئەڵێ: كچـەكـە لە كوڕەكـە مارە بكەن، لەو پارەیە بۆیان صەرف بكەن و صەدەقەی لێ بكەن (رحمهم الله تعالى).

٢٣/١٥٠٤ـ عن أبي هريرة ـ رضي الله تعالى عنه ـ عن النبي ـﷺـ قال: بينا رجل بفلاة من الأرض فسمع صوتا في سحابة: إسق حديقة فلان! فتنحى ذلك السحاب فأفرغ ماءه في حرة. فإذا شرجة من تلك الشـراج قد استـوعب ذلـك المـاء كله، فتتبع الماء، فإذا رجل قائم في حديقـة يحـوِّل المـاء بمسحـاته. فقال له: يا عبد الله مااسمك؟ قال:

**فلان ـ للاسم الذي سمع في السحابة ـ فقال له: يا عبد الله لم تسألني عن اسمي؟ فقال: إني سمعت صوتا في السحاب الذي هذا ماؤه يقول: إسق حديقة فلان لاسمك، فما تصنع فيها؟ قال: أما إذا قلت هذا فإني أنظر إلى ما يخرج منها فأتصدق بثلثه، وآكل أنا وعيالي ثلثا، وأرد فيها ثلثه. م ـ ١٠ / ٤٣٠ وفي أخرى مثلها وأجعل ثلثه في المساكين والسائلين وابن السبيل.**

**تەرجەمە:**

پێغەمەر ـﷺـ ئەفەرموێ: پیاوێ لە صەحرایێکا ئەبی، لەو وەختەدا لە هەورێکەوە دەنگێك ئەبیێ کە: باغی فلاّن کەس ئاو بدە! ئەو هەورە لای دا چوو ئەو ئاوە کە پێی بوو هەمووی رژانە ناو جێیەکی بەردەلاّنیی، شیوێ لەو شیوانە هەموو ئاوەکەی گرتە ناو خۆیەوە، ئەو پیاوە شوێن ئاوەکە کەوت تێفکری پیاوێ لە باغێکا راوەستابوو بە بێلّ ئاوەکەی بە باغەکەدا ئەگێرا پێی‌وت: ئەی عەبدی خوا ناوت چییە؟ وتی: ناوم فلاّنە ـ ئەو ناوەی وت کە لە هەورەکەوەی بیستبوو ـ صاحیب باغەکە لەو پیاوەی پرسی: بۆ لە ناومت پرسی؟ وتی: لە ناو ئەو هەورەی کە ئەم ئاوە ئاوی بارانی ئەوە دەنگێکم بیست کە: باغی فلاّن کەس ئاو بدە، ناوی تۆی برد، تۆ چی ئەکەی لە واریداتی ئەم باغە؟ صاحیبەکەی وتی: مادام کە تۆ وات وت.. تێ‌ئەفکرم چی لێ بێتە مەحصوول سێ‌یەکێکی ئەکەم بە صەدەقە [بە سەر میسکین و داواکەرو رێبوارا] سێ‌یەکێکی لەگەلّ مالّ و منالّەکانم ئەیخۆین، سی‌یەکێکیشی صەرفی خۆی ئەکەمەوە.

صەدەقە بەرەکەت ئەخاتە مالّ.

هەوری ئێستەیش دەنگی لێ یێ ئەڵێ: بە لافاوت فلان زەراعەت وێران بکە، فلان دێو خانوو برووخێنە، فلان و فلان بخنکێنە! ئەمما ئێمە کەرین (مخففا ومشددا!) نایبیێین و تێی ناگەین. (هدانا الله تعالى وفتح سمعنا وأبصارنا وقلوبنا آمين!).

## حديث الأقرع، والأبرص، والأعمى

٢٤/١٥٠٥- أبو هريرة - رضي الله تعالى عنه - سمع رسول الله -ﷺ- يقول: إن ثلاثة في بني إسرائيل: أبرص، وأعمى، وأقرع. بدا لله - عزوجل - أن يبتليهم، فبعث إليهم ملكا، فأتى الأبرص فقال: أي شيء أحب إليك؟ قال: لون حسن، وجلد حسن، قد قذرني الناس. قال: فمسحه فذهب عنه فأُعطي لونا حسنا وجلدا حسنا فقال: أي المال أحب إليك؟ قال: الإبل أو قال البقر هو[أي إسحاق بن عبد الله بن أبي طلحة. م] شك في ذلك أن الأبرص والأقرع قال أحدهما الإبل، وقال الآخر البقر. فأعطي ناقة عُشراء [أتى على حملها عشرة أشهر] فقال: يبارك لك فيها.

وأتى الأقرع فقال: أي شيء أحبُّ إليك؟ قال: شعر حسن، ويُذْهَبَ عني هذا، قد قذِرني الناس. قال: فمسحه فذهب، وأُعطي شعرا حسنا. قال: فأي المال أحب إليك؟ قال: البقر. قال: فأعطاه بقرة حاملا، وقال: يبارك لك فيها.

وأتى الأعمى فقال: أي شيء أحب إليك؟ قال: يردَّ الله إليّ بصري فأبصِرَ بِه الناس. قال: فمسحه فردَّ الله إليه بصره. قال: فأي المال أحب إليك؟ قال: الغنم. فأعطاه شاة والدا [أي ذات ولد أو حاملا] فأنتج هذا وولَّد

هذا، فكان لهذا واد من الإبل، ولهذا واد من البقر، ولهذا واد من الغنم. ثم إنه أتى الأبرص في صورته وهيئته [أي الأبرص] فقال: رجل مسكين تقطعت بي الحِبال في سفري [أي الأسباب] فلا بلاغ اليوم إلا بالله ثم بك، أسألك بالله الذي أعطاك اللون الحسن والجلد الحسن والمال بعيرا أتبلغ عليه في سفري! فقال له: إن الحقوق كثيرة. فقال له: كأني أعرفك، ألم تكن أبرص يقذرك الناس فقيرا فأعطاك الله؟ فقال: لقد ورثت لكابر عن كابر. فقال: إن كنت كاذبا فصيرك الله إلى ما كنت!

وأتى الأقرع في صورته وهيئته فقال له مثل ما قال لهذا، فردَّ عليه مثل ما رد عليه هذا. فقال: إن كنت كاذبا فصيرك الله إلى ماكنت!

وأتى الأعمى في صورته وهيئته فقال: رجل مسكين وابن سبيل وتقطعت بي الحِبال في سفري فلا بلاغ [كفاية] اليوم إلا بالله ثم بك، أسألك بالذي رد عليك بصرك شاة أتبلَّغُ بها في سفري. فقال: قد كنتُ أعمى فردّ الله بصري، وفقيرا فقد أغناني، فخذ ما شئت، فوالله لا أجهدك اليوم بشيء [أي لا أشق عليك في ردِّ شيء تطلبه مني] أخذته لله. فقال: أمسك مالك، فإنما أبتليتم، فقد رضي الله ـ تعالى ـ عنك، وسخط على صاحبيك. ح ـ ٥/٤٢٥. م ـ ١٠/٤١٨.

تەرجەمە:

پێغەمەر ـ ﷺ ـ فەرمووی: سێ کەس لە بەنی ئیسرائیل: بەڵەکێك و، کوێرێك و، کەچەڵێ. خوا ئیرادەی کرد کە ئیمتیحانیان بکا، مەلائیکەیێکی ناردەلایان، مەلائیکەکە هاتە لای بەڵەکەکە پێی فەرموو:

حەز لە چی ئەکــەی؟ عەرزی‌کـــرد: رەنگێکی جوان و پێستێکی جوان، خەڵق بێـزم لێ ئەکـەن. ملائیکـەکـە دەستێکی پیاهێنا رەنگێکی جوان و پێستێکی جوانی پێ عەطـــاکـرا، فەرمـووی: حەز لە =چ= نەوعــە ماڵێ ئەکەی بتبێ؟ عەرزی‌کرد: حەز لە وشتر ئەکەم، یا عەرزی‌کرد: حەز لە گاگەل ئەکەم. بوخاریی ئەفەرموێ: ئیسحاقی کوڕی عەبدوڵڵای کوڕی ئەبوطەلحە ـ رضي الله تعالى عنهما ـ بە شك کەوتوە، کە ئەبرەص و کەچەڵەکە کامیان وشتری ویستووەو کامیان مانگای ویستوە. وشترێکی دە مانگ بەسەر ئاوسیدا رابوردبێ دایێ، وتی: خوا بەرەکەتت بۆ تێ بخا.

ئەمجا چوو بە لای کەچەڵەکەوە پێی‌فەرموو: حەز لە چی ئەکەی؟ عەرزی‌کـــرد: حەز لەوە ئەکـــەم خوا موویـــێـــکـــی جوانـم بداتـێ‌و ئەم کەچـەڵی‌یـەم لێ لابـەرێ؛ چونکی خەڵق بێـزم لێ ئەکـەنـەوە. دەستی بەســەریـا هێنـا، سەری چـاك بۆوەو موویێکی جوانی پێ عەطـاکـرا. فەرمووی: حەز لە چ ماڵێ ئەکەی بتبێ؟ عەرزی‌کرد: حەز لە گاگەل ئەکەم، مانگاییێکی ئاوسی دایێ‌و فەرمووی: خوا بەرەکەتت بۆ تێ بخا.

ئەمجـــا هاتـــە لای کوێـرەکـە، لێی‌پـرسی: حەز لە چی ئەکـەی؟! عەرزی‌کرد: حەزەکەم =خوا= چاوم بداتەوەو خەڵقی پێ ببینم. دەستی بەسەر چاویا هێناو چاوی پێ عەطاکرایەوە،فەرمووی: حەز لە چە ماڵێك ئەکەی؟ عەرزی‌کرد: حەز لە مەڕ ئەکەم. مەڕێکی ئاوسی دایێ‌و دۆعای بەرەکــەتی بۆ کرد، ئەوان وشتـرو مانگـاکـەیـان زاو ئەمیش مەڕەکەی زا، ئەوان یەکی پڕ بە وادی‌یێ وشترو گاگەلیان بوو، ئەمیش پڕ بە وادی‌یێ مەڕی بوو.

لە دوایيـدا مەلائیکـەکـە لە شکـڵ و هەیئـەتی بەڵـەکەکەدا هاتە لای بەڵــەکـەکـە، فەرمـووي: پیـاوێکی فەقیـرم، لەم سەفـەرەمـا ئەسبـابی بەرێدارۆیینم براوەتەوەو، ئەمرۆ غەیری خواو غەیری تۆ هیچی تر نی‌یە بمگەیێنێتە مەقصەد، بە ناوی ئەو خوایەی کە ئەم رەنگە جوانەو پێستە جوانـەی پێ عەطـا فەرمـووی وشترێکم بدەرێ پێی‌بگەمەوە جێی خۆم، پێی‌وت: حەق زۆرە. فەرمووی: وا بزانم ئەتناسمەوە، بەڵەك نەبوویت و خەڵق بێزیان لێ‌ئەکردی‌و فەقیر نەبوویت و خوا ماڵی پێ عەطا کردی؟ وتی: خەیــر لە باوك و باپیــرمـــەوە بە ئیـرث وەرم گرتـوە. مەلائیکـەکـە فەرمووی: ئەگەر درۆ بکەی خوا بتگێرێتەوە سەر ئەو حاڵەی کە بووت.

ئەمجــا هاتـە لای کەچـەڵـەکـە لە صوورەتی کەچـەڵیـدا، ئەوی بە بەڵەکەکەی وت بەویشی فەرموو، بەڵەکەکە چ جوابێکی دابووەوە ئەویش ئەو جوابەی دایەوە. فەرمووی: ئەگەر درۆ بکەی خوا بتباتەوە سەر ئەو حاڵە کە بووت.

ئەمجـا هاتـە لای کوێـرەکـە لە شکڵی کوێردا، فەرمووی: پیاوێکی فەقیرم رێبوارم ئەسبابی سەفەرم نەماوە کە ئەم سەفەرەی پێ بەرمە سەر، ئیمرۆ ئەوی کافیی من بێ هەر خوایەو لە پاشا تۆ، سوئالت لێ ئەکەم بەو کەسەی چاوی پێ عەطا کردی‌یەوە مەرێکم بدەیتێ. کوێرەکە وتی: من کوێر بووم خوا چاوی دامەوە، فەقیر بووم خوا دەوڵەمەندی کردم، چیت دەوێ هەڵی‌گــرە، وەڵـلاهی دەستت نایێنمـە پێش، لەوەی بۆ خوا وەری بگـری. مەلائیکـەکـە فەرمـووی: ماڵی خۆت بۆ خۆت بێ. خوا ئێوەی ئیمتیحان کرد؛ لە تۆ رازی‌یەو لەوان غەضەبناکە.

شوکری حەقیقیی نیعمەت فەرزە؛ گینا خوا زوو لێی وەرەگرێتەوە.

## قتل أصحاب الأخدود النار ذات الوقود

٢٥/١٥٠٦- عن صهيب - رضي الله تعالى عنه - أن رسول الله -ﷺ- قال: كان ملك فيمن كان قبلكم، وكان له ساحر، فلما كَبُر قال للملك: إني قد كبُرت، فابعث إليَّ غلاما أُعلِّمه السحر، فبعث إليه غلاما يعلِّمه، فكان في طريقه، إذا سلك راهب، فقعد إليه وسمع كلامه، فأعجبه، فكان إذا أتى الساحر مرَّ بالراهب وقعد إليه، فإذا أتى الساحر ضربه، فشكا ذلك إلى الراهب، فقال: إذا خشيت الساحر فقل: حبسني أهلي، وإذا خشيت أهلك فقل: حبسني الساحر.

فبينما هو كذلك إذ أتى على دابة عظيمة قد حبست الناس، فقال: اليوم أعلم الساحر أفضل أم الراهب أفضل؟ فأخذ حجرا فقال: اللهم إن كان أمر الراهب أحب إليك من أمر الساحر فاقتل هذه الدابة حتى يمضي الناس! فرماها فقتلها، ومضى الناس. فأتى الراهب فأخبره. فقال له الراهب: أي بُنيَّ أنت اليوم أفضل مني قد بلغ من أمرك ما أرى. وإنك ستُبتلى، فإن ابتليت فلا تدل عليَّ، وكان الغلام يبرىء الأكمه والأبرص، ويداوي الناس من سائر الأدواء. فسمع جليس للملك كان قد عمي، فأتاه بهدايا كثيرة، فقال: ما ههنا لك أجمع إن أنت شفيتني. قال: إني لا أشفي أحدا إنما يشفي الله. فإن أنت آمنت بالله دعوتُ الله فشفاك. فآمن بالله فشفاه الله.

فأتى الملك، فجلس إليه كما كان يجلس. فقال له الملك: من رد عليك بَصَرَك؟ قال: ربي. قال: ولك رب غيري؟ قال: ربي وربك الله. فأخذه فلم يزل يعذبه حتى دل على الغلام، فجيء بالغلام، فقال له

الملك : أي بني قد بلغ من سحرك ما تبرىء به الأكمه والأبرص، وتفعل وتفعل؟ فقال : إني لا أشفي أحدا إنما يشفي الله، فأخذه فلم يزل يعذبه حتى دل على الراهب. فجيء بالراهب، فقيل له : ارجع عن دينك، فأبى. فدعا بالمنشار فوضع المنشار في مفرق رأسه فشقه به حتى وقع شقاه! ثم جيء بجليس الملك فقيل له : ارجع عن دينك فأبى فوضع المنشار في مفرق رأسه فشقه به حتى وقع شقاه! ثم جيء بالغلام فقيل له : ارجع عن دينك فأبى، فدفعه إلى نفر من أصحابه فقال : اذهبوا به إلى جبل كذا وكذا، فأصعدوا به الجبل، فإذا بلغتم ذروته فإن رجع عن دينه وإلا فاطرحوه. فذهبوا به فصعدوا به الجبل فقال : أللهم أكفنيهم بما شئت. فرجف بهم الجبل فسقطوا!

وجاء يمشي إلى الملك، فقال له الملك : ما فعل أصحابك؟ قال : كفانيهم الله. فدفعه إلى نفر من أصحابه، فقال : اذهبوا به فاحملوه في قرقور فتوسطوا به البحر، فإن رجع عن دينه وإلا فاقذفوه. فذهبوا به. فقال : أللهم اكفنيهم بما شئت، فانكفأت بهم السفينة فغرقوا!

وجاء يمشي الى الملك، فقال له الملك : ما فعل أصحابك؟ قال : كفانيهم الله. فقال للملك : أنت لست بقاتلي حتى تفعل ما آمرك به! قال وما هو؟ قال : تجمع الناس في صعيد واحد، وتصلبني على جذع، ثم خذ سهما من كنانتي، ثم ضع السهم في كبد القوس، ثم قل : بسم الله رب الغلام، ثم ارمني. فإنك إذا فعلت ذلك قتلتني. فجمع الناس في صعيد واحد وصلبه على جذع، ثم أخذ سهما من كنانته، ثم وضع السهم

في كبـد القـوس، ثـم قال: باسم الله رب الغـلام ثم رمـاه فوقـع السهم في صدغه فوضع يده في صدغه في موضع السهم فمات!

فقـال النـاس: آمنـا برب الغلام، آمنا برب الغلام، آمنا برب الغلام. فأتي الملك، فقيل له: أرأيت ما كنت تحذر؟ قد والله نزل بك حِذْرك! قد آمن الناس، فأمر بالأخدود بأفواه السكك فخدّتْ، وأُضْرِم النيران، وقال: من لم يرجـع عن دينـه فأحمـوه فيهـا، أو قيـل له: اقتحم ! ففعلوا حتى جاءت امرأة ومعها صبي لها فتقاعست أن تقع فيها فقال لها الغلام: يا أمه اصبري فإنك على الحق. م ـ ١٠/ ٤٤٢.

تەرجەمە:

پێغـەمـەر ـ ﷺ ـ فەرمـووی: لەو میللەتـانـەی کە لە پێش ئێوەوە بوون پادشـایێ بوو ساحیـرێکی بوو، کە ساحیـرەکـەی پیربوو بە پادشاهەکەی وت: من پیر بووم کوڕێکم بنێرە لا فێری سیحری بکەم. کوڕێکی بۆ نارد کە سیحری فێر بکا، ئەو کوڕە کە ئەچوو بۆ لای ساحیرەکە ڕاهیبێکی لە ڕێـدا بوو کوڕەکـە لای دانیشت گوێی لە قسـەی گرت، قسـەکـانی پێ خـۆش بوو، لە دوای ئەوە کە ئەچـوو بۆ لای ساحیـرەکـە بە لای ڕاهیبـەکـەدا ئەڕۆیی و لای دائـەنیشت، لە پاشـا کە ئەچـوو بۆ لای ساحیـرەکـە لەبـەر ئەمـە کە درەنگی پێ چوە ساحیرەکە لێی ئەدا، شکاتی ئەوەی لای ڕاهیبەکە کرد. ڕاهیبەکە پێی وت: کە ترست لە ساحیرەکە بوو لێـت دا بڵێ: کەس و کارم درەنگیـان پێ چـوانـدم، لە کەس و کارت ترست بوو بڵێ: ڕاهیبەکە درەنگی پێ کردم.

كە ئەو كوڕە بەم نەوعــە لە ڕێــی ساحـیــرەكــەدا لای ئەدا بۆ لای ڕاهیبەكە گوێی لە وەعظی ئەگرت و دین فێرئەبوو. ڕۆژێ جانەوەرێكی زۆر گەورە ڕێی بردبوە بەست لە خەڵق. كوڕەكە وتی: ئیمڕۆ تێ‌ئەگەم كە ساحیرەكە چاترە یا ڕاهیبەكە چاترە. بەردێكی هەڵگرت وتی: خوایە ئەگــەر ئیشی ڕاهیبــەكــەت لە ئیشی ساحیـرەكـە لە لا مەحبـووبتـرە ئەو جانــەوەرە بكـوژە. بەردەكــەی گرتــە جانــەوەرەكــەو كوشتی، ڕێی خەڵق بەرەڵــڵا بوو، ڕۆیین. چوە لای ڕاهیبــەكــە خەبــەری دایێ، ڕاهیبــەكــە پێی‌وت: ئەی كوڕی خۆم تۆ ئیمڕۆ لە من چاتری، كارت بەوە گەییوە كە ئەیبینم، تۆیش موبتەلا ئەبی، كە موبتەلا بووی ڕاستیی من مەڵێ.

ئەو كوڕە وای لێ هات كوێری مادەرزادی، چاك ئەكردەوەو، بەڵەكی چاك ئەكردەوە، لە نەخۆشیی تریش بە دۆعا خەڵقی تەداویی ئەكرد. ئەو پادشــایــە وەزیــرێكی بوو كوێــر بووبــوو، خەبــەری ئەو كوڕەی بیست كە خەڵق چاك ئەكــاتــەوە، دیــارییێكی زۆری بۆ برد پێی‌وت: ئەگــەر شیفام بدەی لەم كوێــری‌یــە ئەمــانــەی كە لێــرەدایــە هەمــووی بۆ تۆ بێ كوڕەكە پێی‌وت: من شیفا نادەم هەر خوا شیفا ئەدا، ئەگەر ئیمان بە خوا بێنی دۆعات بۆ ئەكەم خوا شیفات ئەدا، وەزیرەكە ئیمانی هێنا خوا شیفای دا چاوی چاك بۆوە. چۆن لەوەپێش ئەچوە لای پادشاهەكە وا چوە لای‌و دانیشت، پادشــاهــەكــە لێی‌پــرسی: كێ چاوی چاك كردی‌یــەوە؟ وتی: خوای خۆم. وتی: بۆ غەیری من تۆ هیچ خوای ترت هەیە؟ وەزیرەكە وتی: خوای منیش و خوای تۆیش (الله)یە پادشاهەكە گرتی‌و عەذابی دا تا ڕاستیی لە كوڕەكە وت.

کورەکـەی بانـگ کردو هێنـایـان، پێی وت: کوڕی خۆم لە سیحـرا گەییوێتە ئەو پایەیە کە کوێری مادەرزادو بەڵەك چاك ئەکەیتەوە. وتی: من شیفا نادەم هەر خوا شیفا ئەدا. پادشا ئەو کوڕەی گرت هەر عەذابی دا تا خەبـەری لە راهیبـەکـە دا. راهیبـەکـە هێنـرا ئەمـری پێکـرا کە لە دین بگـەڕێتـەوە، نەگـەڕایـەوە، ئەمـری کرد شەقـەمشاریان هێنا مشارەکەیان لەســەر تەپڵی سەری دانـا، بە مشـارەکـە دایـان هێنـا تا کردیـان بە دوو لەتەوە، بەم لاو بەولادا کەوت.

لە پاشا وەزیرەکەیی هێنا پێیان وت: لە دین بگەڕێرەوە، ئیبای کرد، مشاریان نایە سەر تەپڵی سەری دایان هێنا تا لەتێکی بەم لاداو لەتێکی بەولادا کەوت.

لە پاشـا کورەکـە هێنـرا، پێیـان وت: لە دین بگەڕێرەوە، ئیبای کرد، دایە دەست چەند کەسێ لە پیاوانی خۆی، پێی وتن: بیبەنە سەر فلانە شاخە، کە گەیانتانە سەر تەپڵە سەرەکەی لەوێ بیخەنە خوارێ، بردیان کە سەریان خستە سەر شاخەکە، وتی: یاڕەببی بەچی ئیرادە ئەفەرمووی ئەمانەم لێ دەفع بکە! شاخەکە هاتە حەرەکەو هەموو کەوتنە خوارێو، هاتـەوەلای پادشـاهـەکـە. لێی پـرسی: رەفیقـەکـانت چییـان لێ هات؟ فەرمووی: خوا نەجاتی دام لە دەستیان.

لە دواییا دایە دەست چەند کەسێکی تر لە پیاوانی خۆی، پێی وتن: سواری سەفینـەییکی بکـەن، بیبـەنـە ناوەڕاستی بەحرەکە ئەگەر لە دینی گەڕایـەوە ظەریفـە، ئەگـەر نەگـەڕایـەوە بیخـەنە ناو بەحرەکەوە، بردیان،

وتی: یارەببی بە هەرچی لێمیان دەفع ئەکەی بیکە! سەفینەکە بەلادا هات و هەموو کەوتنە ناو بەحرەکەوە غەرق بوون، کورەکە هاتە لای پادشاهەکە وتی: رەفیقەکانت کوانێ؟ فەرمووی: خوا لێی دەفع کردم.

بە پادشاهەکەی وت: شتێکت پێ ئەمر ئەکەم تا ئەوە نەکەی ناتوانی من بکوژی. وتی: چیە؟ فەرمووی: ئەمر بکەی لە مەیدانێکا هەموو خەڵق کۆببنەوە، بمکەی بە دارێکا، تیرێ لە تیرکەشەکەم دەرێنی بیخەیتە ناو کەوانەکەوە، لە پاشا بڵێی (بسم الله رب الغلام) تێم بگری، کە ئەوەت کرد ئەمکوژی. پادشاکە وایکردو تیرەکەی تێگرت و دای لە لاجانگی، کورەکە دەستی نایە سەر جێ تیرەکەو وەفاتی کرد، خەڵقەکە هەموو بە جارێ دوو جار[1] وتیان: ئیمانمان هێنا بە رەببی غولام! ئەطرافی پادشاهەکە هاتنە لایو خەبەریان دایێ: وەڵڵاهی ئەوەی لێی ترسای تووشی بووی؛ هەموو کەس ئیمانی هێنا، پادشاکە ئەمری کرد: لەسەر هەموو کۆڵانان خەندەق هەڵبکەنن. خەندەق هەڵکەنراو ئاگری تیاکرایەوەو وتی: هەرکەسێ لە دینی وەرنەگەرایەوە بیخەنە ناو ئاگرەکەوە، خەڵقیان فرێدایە ناویەوە، تا ژنێ هات منالێکی بەرمەمکانی بە باوەشەوە بوو خۆی کێشایەدواوە کە خۆی نەخاتە ناو ئاگرەکەوە، منالەکەی پێیوت: دایە صەبر بکە تۆ لەسەر حەقی!

## خضر ﴿علیه السلام﴾

**٢٦/١٥٠٧ـ عن أبي هريرة ـ رضي الله تعالى عنه ـ عن النبي ـﷺـ إنما سمي الخضرَ أنه جلس على فروة بيضاء [أرض لا نبات فيها] فاذا هي**

(١) لە دەقی عەرەبیەکەدا سێ جار نووسراوە (آمنا برب الغلام).

تهتز من خلفه خضراء [بعد أن كان جَرْداء] ح ـ ٥/٣٨١.

تەرجەمە:

پێغەمەر ـ ﷺ ـ فەرموویەتی: بۆیە بە (خضر) ئەڵێن (خضر) چونکی لەسەر ئەرزێکی رووتی بێ گیا دانیشتبوو کە تێفکری لە پشتیەوە ئەو ئەرزە تیایا گیای سەوز کەروێشکە ئەکا[١].

إسمه: بلْيا بن مَلكان، ابن فالغ، بن عابر، بن شالخ، بن أرفخشد، بن سام، بن نوح ـ عليه السلام ـ فمولده قبل إبراهيم الخليل ـ عليه السلام ـ لأنه ابن عم جد إبراهيم ـ عليه السلام ـ.

## يونس ﴿عليه السلام﴾

٢٧/١٥٠٨ـ ابن عباس ـ رضي الله تعالى عنه ـ عن النبي ـ ﷺ ـ قال: لا ينبغي لعبد أن يقول أنا خير من يونس ابن متي. ونسبه إلى أبيه ح ـ ٥/٣٩٢، ٧٥، ٣٩٤. م ـ ٩/٢٤٨. وفيه أنه قال: يعني الله تبارك وتعالى لا ينبغي لعبد لي.

تەرجەمە:

پێغەمەر ـ ﷺ ـ فەرموویەتی: بۆ هیچ کەسێ ناشێ کە بڵێ: من لە یونسی کوڕی مەتی چاکترم. پێغەمەر ـ ﷺ ـ یونس ـ عليه السلام ـ ی نیسبەت دایە ئەلای باوکی. پێغەمەر ـ ﷺ ـ ئەم حەدیثە لە خواوە ـ عزوجل ـ ریوایەت ئەکا کە فەرمووی: هیچ عەبدێکی من بۆی نی یە

---

(١) دانەر ـ خ ـ مانای قسەکەی دوایی نەکردوە کە لە قەسطەلانیی وەگرتوە کە ناوو پشتەکانی خضری تیایەو، دەڵێ: لە پێش ئیبراهیمدا لە دایك بووە؛ چونکە ئامۆزای باپیری ئیبراهیم بوە ـ د ـ.

بلّێ: من چاکترم لە یونس.

## داود وسليمان ﴿عليهما السلام﴾

**٢٨/١٥٠٩ـ عن أبي هريــرة ـ رضي الله تعـالى عنـه ـ عن النبي ـﷺـ قال: خُفِّف على داود ـ عليـه السـلام ـ القـرآن، فكان يأمر بدوابه فتسرج فيقرأ القرآن [أي الزبور] قبل أن تسرج دوابه، ولا يأكل إلا من عمل يده. ح ـ ٥/٣٩٦.**

**تەرجەمە:**

پێغەمەر ـﷺـ فەرموویەتی: خوێندنی زەبوور بۆ داود ـ علیه السلام ـ سووك کرابـوو، ئەمـری ئەکـرد کە وڵاغـەکـانی زین بکـرێن، لە پێش ئەمەدا زین بکرێن زەبووری ئەخوێن، لە غەیری عەمەلی دەستی خۆی هیچی نەدەخوارد.

**٢٩/١٥١٠ـ أبـو هريـرة ـ رضي الله تعـالى عنـه ـ سمـع رسـول الله ـﷺـ يقول: مثلي ومثلُ الناس كمثَلِ رجل استوقد نارا فجعل الفراش وهذه الدواب تقع في النار [وقال أبو هريرة، فموقوف، أو النبي ـﷺـ فمرفوع] كانت امرأتان معهما ابناهما جاء الذئب فذهب بابن إحديهما، فقالت صاحبتها: إنما ذهب بابنكِ، وقالت الأخرى: إنما ذهب بابنكِ. فتحاكما إلى داود [عليه الصلاة والسلام] فقضى به للكبرى [لأن الولد كان في يدها] فخرجتا على سليمان بن داود [عليهما الصلاة والسلام] فـقـال: إئتـوني بالسكين أشقـه بينهمـا، فقـالت الصغـرى: لا تفعـل يرحمــكَ الله هو ابنهـا، فقضى به للصغـرى. قال أبـو هريـرة. والله إن**

سمعت بالسِّكِّين إلا يومئذ، وما كنا نقول إلا المُدْية. ح ـ ٥/٤٠٣. م ـ ٧/٢٨٨. ح ـ ١٠/٤٣٥.

تەرجەمە:

ئەبوهورەیرە ـ رضي الله تعالی عنه ـ لە پێغەمەر ـﷺـی بیستوە کە ئەیفەرموو: مەثەلی من و خەلْق وەك مەثەلی پیاوێ وایە کە ئاگرێ بکاتەوەو پەپوولەو ئەم حەیوانە وردانە خۆی ئەخەنە ناو. هەم پێغەمەر ـﷺـ فەرمووی: دوو ژن دوو کوڕیان پێبوو، گورگێ هات کوڕی یەکێکیانی فڕان، ئەوی تر وتی: کوڕی تۆی فڕانوە، ئەویش وتی: خەیر کوڕی تۆی فڕانوە. موحاکەمەیان بردە خزمەت حەزرەتی داود ـ علیه السلام ـ [چونکی کوڕەکە لە دەستی ژنە گەورەکەدا بوو] حوکمی بۆ ئەو کرد، لە خزمەتی کە چوونە دەرێ چوونە لای حەزرەتی سولەیمان ـ علیه الصلاة والسلام ـ [سولەیمان ـ علیه الصلاة والسلام ـ ئەو وەختە عومری دە ساڵ بوو] خەبەریان دایێ فەرمووی: کێردێکم بۆ بێنن ئەیکەم بە =دوو= لەتەوە لە بەینیانا، بچکۆلەکەیان [دڵەلەرزێی پێکەوت] وتی: رەحمەتی خوات لێبێ لەتی مەکە کوڕی ئەوە. بەوە حەزرەتی سولەیمان ـ علیه السلام ـ زانیی کە کوڕی بچکۆلەکەیانە حوکمی پێکرد. ئەبوهورەیرە ئەفەرموێ: وەڵڵاهی! هەر ئەو رۆژە (سکین)م =بیستوە= کە پێغەمەر ـﷺـ تەلەفوظی پێکرد، گینا ئێمە لەوەپێش بە کێردمان هەر (مُدیة) ئەوت.

[لەم قسەی ئەبوهورەیرەوە ـ رضي الله تعالی عنه ـ دەرەکەوێ کە لە پێغەمەر ـﷺـی بیستوەو حەدیثەکە مەرفووعەو مەوقووف نیيە].

[حەزرەتی سولەیمان حوکمی حەزرەتی داودی نەقض کرد؛ چونکی ژنە گەورەکە لە دواییدا ئیقراری پێکرد؛ چون کەسێ لای حاکم ئیقامەی شاهیدی زوور بکا، یا بە درۆ سوێن بخوا حاکم مەجبوور ئەبێ کە بە طەرەفی ئەوا حوکم بکا، لە پاشا ئەو کەسە بڵێ: حەقی من نی‌یە حەقی خەصمەکەمە مەحکەمەکە هەڵەوەشێ. یا حەزرەتی داود ـ علیه السلام ـ بە طریقی فەتوا وای فەرموە بە طەریقی حوکم نەیفەرموە، یا ئەو وەختە کە دەلیلێکی بەقووەتتر بیوایە لەسەر خیلافی حوکمێ ئەو حوکمە هەڵەوەشێنرا. وەك مەسئەلەی مەڕەکان کە زەراعەتەکەیان خوارد حەزرەتی داود ـ علیه السلام ـ مەڕەکەی دا بە صاحیب زەراعەتەکە. حەزرەتی سولەیمان مەڕەکانی نەدایێ هەر مەنفەعەتی مەڕەکانی دایێ تا زەراعەتەکە وەکوو پێشووی لێ بێتەوە. خوا ئەفەرموێ: ﴿ففهمناها سليمان، وكلا آتيناه حكما وعلما﴾(١) حوکمی ئەو مەسئەلەیەمان تەعلیمی سولەیمان کرد. عیلم و حوکممان بە هەردوکیان ئیعطا کردوە].

## زكريا ﴿عليه الصلاة والسلام﴾

**٣٠/١٥١١ـ عن أبي هريرة [رضي الله تعالى عنه] أن رسول الله ـﷺـ قال: كان زكريا نجارا. م ـ ٩/ ٢٥٠.**

**تەرجەمە:**

پێغەمەر ـﷺـ فەرموویەتی: کە حەزرەتی زەکەریا ـ علیه السلام ـ دارتاش بوە.

(١) أنبياء/ ٧٩.

[رەئیسی هەموو بەنی‌ئیسرائیل بە کەسب خۆیو ماڵ و مناڵی بەخەم کردوە. غەیری خوا مەمنوونی کەس نەبوە].

## عیسی ﴿علیه الصلاة والسلام﴾

**١٥١٢/٣١ـ أبـو هريـرة ـ رضي الله تعـالى عنـه ـ قال [سمعت]: قال رسول الله ـﷺـ:أنا أولى الناس بعيسى بن مريم في الدنيا والآخرة [قالوا: كيف يا رسـول الله؟ قال م] والأنبيـاء إخـوة لعـلّات أمهاتهم شتى، ودينهم واحد، [ليس بيني وبينه نبي. أخرى، خ، م] ح ـ ٤١٨/٥. م ـ ٢٣١/٩.**

**تەرجەمە:**

پێغەمەر ـﷺـ فەرمووی: من لە هەموو کەس ئەولاترم بە عیسای کوری مەریەم. عەرزیان کرد: بۆچی (یارسول الله)؟ فەرمووی: ئەنبیاء ئەولادی گەلێ هەوێن دایکیان جوێیە [باوکیان یەعنی] دینیان یەکێکە، لە بەینی من و ئەوا هیچ پێغەمەر نی‌یە.

[بـــرای دایکیی ئەولادی (أخیـافن) برای باوکیی ئەولادی عەلـلاتن] [یەعنی ئوصوولی دینمان یەکێکە کە عەقایدو ئەخلاقە، لە فورووعا لە یەك جوێین. فورووع دایکمانەو ئوصوولی دین باوکمانە؛ چونکی هیچ پێغەمەری مورسەلمان لە بەینا نی‌یە، من لە هەموو کەس بەو نزیکترم].

**١٥١٣/٣٢ـ عن أبي هريرة ـ رضي الله تعالى عنه ـ قال: قال ـﷺـ: كل بني آدم يطعن الشيطـان في جنبيـه بأصبعـه حين يولـد غيـر عيسى بن مريم ذهب يطعن فطعن في الحجاب. ح ـ ٢٨٧/٥. م ـ**

٢٣٣/٩ .

ح ـ ٧/ ٥٠ وفيه فيستهل صارخا من نخسة الشيطان. ثم قال أبو هريرة [رضي الله تعالى عنه] فاقرأوا، إن شئتم، : ﴿وإني أعيذها بك وذريتها من الشيطان الرجيم﴾[١٤] م ـ ٤٣٣/٩ وجميع الأنبياء يتشاركون في هذه الخصلة. نووي

١٥١٤/٣٣ـ عن أبي هريرة [رضي الله تعالى عنه] قال رسول الله ـﷺـ: صياح المولود حين يقع نزغة من الشيطان م ـ ٢٣٣/٩ .

تەرجەمە :

پێغەمەر ـﷺـ فەرمووی: هەر منالّێ کە لە دایك ئەبێ شەیطان بە پەنجەی لە هەردوو کەلەکەی ئەژەنێ، ئەو وەختە منالّەکە لەو تێوەژەنە ئەقیژێنێ و ئەگری، غەیری عیسای کوڕی مەریەم ـ علیه السلام ـ تەمای بوو تێـوەژەنێ پەنجـەی دا لەو پەردەی کە حەزرەتی عیسـای تیـابـوو، لە حەزرەتی =عیسـا= ـ علیـه السـلام ـی نەدا. ئەبـوهـورەیرە ئەفەرموێ: ئەگەر هەوەست یێنێ ئەو ئایەتە بخوێنەرەوە کە دایکی مەریەم لەو وەختەدا کە مەریـەمـی ئەبـێ ئەڵێ: یارەببی مەریـەم و ذوریيـەتی مەریـەم لە شەیطانی رەجیم ئەخەمە پەنای تۆوە.

لە ریوایەتەکەی ترا ئەفەرموێ: منالّ کە لەو وەختەدا ئەکەوێتە سەر ئەرزو ئەقیژێنێ لەو پەنجەلێدانەی شەیطانە.

١٥١٥/٣٤ـ عن أبي هريرة ـ رضي الله تعالى عنه ـ عن النبي ـﷺـ قال: رأى عيسى بن مريم [عليهما الصلاة والسلام] رجلا يسرق، فقال

(١٤) آل عمران/ ٣٦.

**له: أسرقت؟ قال: كلا والله الذي لا إله إلا هو! فقال عيسى: آمنت بالله وكذّبت عيني [نفسي. م] ح ـ ٤١٨/٥. م ـ ٢٣٣/٩.**

تەرجەمە:

پێغەمەر ـ ﷺ ـ فەرمووی: حەزرەتی عیسا پیاوێکی دی دزیی ئەکرد. فەرمووی: تۆ دزیت کرد؟ وتی: =نەء= قەسەم بەو خوایەی کە غەیری =ئەو= ئەولای بە پەرستش بێ هیچ کەس نییە. فەرمووی: باوەڕم بە خوا هەیەو چاوی خۆم، لە موسلیما: نەفسی خۆم بەدرۆ ئەخەمەوە.

[حەزرەتی عیسا ـ علیه السلام ـ پێی باوەڕ نەکرد ئەمما لە سوێنە درۆکەی ترساو بێدەنگ بوو].

**١٥١٦/٣٥ـ عن أبي هريرة [رضي الله تعالى عنه] عن النبي ـ ﷺ ـ قال: لم يتكلم في المهد إلا ثلاثة:**

**١ ـ عيسى [عليه السلام]**

**٢ ـ وكان في بني إسرائيل رجل يقال له: جريج [وفي حديث أبي سلمة إنه كان تاجرا، وكان ينقص تارة ويزيد أخرى، فقال: مافي هذه التجارة خير، لألتمسنّ تجارة هي خير من هذه، فبنى صومعة وترهب فيها. وعند أحمد: وكانت أمه تأتيه فتناديه فيشرف عليها فتكلمه. و] كان يصلي جاءته أمه فدعته، فقال أجيبها أو أصلي؟ [فلم يجبها بعد ما دعته ثلاثا] فقالت: اللهم لا تمته حتى تريَهُ وجوه المومسات [أي الزانيات].**

**وكان جريج في صومعته فتعرضت له امرأة [راعية أو بنت الملك] فكلمتْه، فأبى. فأتت راعيا فأمكنته من نفسها، فولدت**

غلاما، فقالت: من جريج [فأخذت، وكان من زنى منهم قتل أحمد. فذهبوا إلى الملك فأخبروه، فقال: أدركوه فأتوني به. أبو سلمة] فأتوه فكسروا صومعته، وأنزلوه وسبوه [وضربوه. فقال: ما شأنكم؟ قالوا: إنك زنيت بهذه. أحمد. وعنده أيضا: أنهم جعلوا في عنقه وعنقها حبلا، وجعلوا يطوفون بهما على الناس. وفي رواية أبي سلمة: أن الملك أمر بصلبه] فتوضأ وصلى [ركعتين، عمران. ودعا، وهب بن جرير] ثم أتى الغلام فقال: من أبوك يا غلام؟ فقال: الراعي. قالوا: نبني صومعتك من ذهب. قال: لا إلا من طين.

٣ ـ وكانت امرأة ترضع ابنا لها من بني إسرائيل، فمرَّ بها رجل راكب ذو شارة [حسن يتعجب منه ويشار إليه لحسنه وهيئته]فقالت: أللهم اجعل ابني مثله، فترك ثديها وأقبل على الراكب فقال: أللهم لا تجعلني مثله، ثم أقبل على ثديها يمصه. قال أبو هريرة: كأني أنظر إلى النبي ـﷺـ يمص أصبعه. ثم مُرَّ بأمة [تُضرب. وهب بن جرير] فقالت: أللهم لا تجعل ابني مثل هذه. فترك ثديها فقال: أللهم اجعلني مثلها. فقالت: لم ذاك؟ فقال: الراكب جبار من الجبابرة. وهذه الأمة يقولون: سرقتِ زنيتِ، ولم تفعل. [ورواية الأعرج: يقولون لها: تزني، وتقول: حسبي الله. ويقولون لها: تسرق، وتقول: حسبي الله]ح ـ ٥/٤١٣، م ـ ٩/٤٤٣. ح ـ ٥/٤٣٠. ليس فيه حديث جريج، ولا عيسى ـ عليه السلام ـ.

تەرجەمە:

ئەبوھورەيرە ـ رضي الله تعالى عنه ـ ئەفەرموێ: پێغەمەر ـﷺـ

فەرمووی: لە منالی بێشکە غەیری سێ کەس قسەی نەکردوە:
١ ـ عیسی ـ علیه السلام ـ.
٢ ـ لە بەنی ئیسرائیلا پیاوێ بوو جورەیجیان پێئەوت. [تاجیر بوو، بەعـزێ وەقت زەرەری ئەکـرد، بەعـزێ وەقت قازانجی ئەکـرد. فەرمووی: لەم تیجارەتەدا خێر نییە، ئەبێ تیجارەتێ بکەم کە لەمە خێرتـر بێ. عیبـادەتخـانەیێکی دروست کرد، لەوێدا دەستیکرد بە عیبادەتکردن . ئەبوسەلەمە . ئیمـامی ئەحمـەد ریـوایەت ئەکا: دایکی ئەهـاتـە لایی و بانگی ئـەکردو قسەی لەگەلا ئەکرد] رۆژێ لە عیبادەتخانەکەیا نوێژی ئەکرد دایکی هات بانگیکرد، لە دلی خۆیا وتی: نوێژەکەم بکەم یا جوابی دایکم بدەمەوە؟ [سێ دەفعە بانگی کردو جوابی نەدایـەوە. ئیختیـاری نوێـژەکـەی کرد. حەوشـەب ریـوایـەت ئەکـا لە پێغـەمـەرەوە ـﷺـ کە فەرمووی: ئەگەر جورەیج فەقیـە بوایـە ئەیـزانی کە جوابـدانـەوەی دایکی خێـرترە لە عیبادەتی خوا. یەعنی غەیری فەرزو، ئەو جوابدانەوە] کە لە دوای سێ دەفعە جوابـی دایکی نەدایـەوە دایکی وتی: یارەببی نەیمـرێنی تا رووی ژنـانی فاحیشـەی پێنیشـان ئەدەی! [چا بوو دوعـای لێنـەکرد کە تووشی زینا ببێ].

ژنە فاحیشەیێ هاتە لای لە صەومەعەکەیا طەلەبی لێکرد کە زینای لەگەل بکا نەیکرد ژنەکە چوو خۆی تەسلیمی شوانێ کرد، زینـای لەگـەلا کردو منـالێکی لێیبـوو، پێیـان وت: ئەو منالەت لە کێیـە؟ وتی: لە جورەیجـە. =هـاتنـەسـەری و عیبـادەتخـانـەکـەیان رووخان و هێنایانە خوارێ و جوێنیان پێئەداو [لێیان ئەدا! پێیوتن:

بۆچی وا ئەکەن؟ وتیان: زینات لەگەڵ ئەم ژنە کردوە. پەتیان خستە ملیو بەناو خەڵقا ئەیان گێراو، پادشای ئەوێ ئەمری کرد کە صەلبی[1] بکەن. وتی: مۆڵەتم بدەن دوو رکات نوێژ بکەم] دەستنوێژی شت و، دوو رکات نوێژی کردو [دوعایکرد] هاتە لای منالەکە پێیوت: ئەی غولام باوکی تۆ کێیە؟ منالەکە وتی: باوکی من ئەو شوانەیە. ئەو وەختە پێیان وت: صەومەعەکەت لە ئالتوون بۆ دروست ئەکەینەوە. وتی: خەیر هەر لە گڵ[2] دروستی بکەنەوە.

٣ ـ ژنێ بوو لە بەنیئیسرائیل شیری ئەدا بە منالێکی، سوارێکی بە شەوکەتی لیباس جوانیان بە لادا رابورد، ژنەکە وتی: یارەببی کورەکەم وەك ئەم سوارە لێ بکە. کورەکەی دەمی لە مەمکی دایکی بەرداو رووی کردە سوارەکەو وتی: یارەببی من وەك ئەو سوارە لێ مەکە، مەمکە بە وەك ئەو سوارە، لە پاشا دەمی نایەوە بە مەمکی دایکیەوە ئەیمژی. ئەبوهورەیرە ـ رضي الله تعالى عنه ـ ئەفەرموێ: ئێستە (کأنه) تەماشای پێغەمەر ـ ﷺ ـ ئەکەم کە پەنجەی موبارەکی خۆیی ئەمژی. لە پاشا بە لای ژنێکا رابورد [لێیان ئەدا] وتی: یارەببی کورەکەم مەکە بە وەك ئەم ژنە. کورەکەی وازی لە مەمکی دایکی هێناو وتی: یارەببی بمکە بە وەك ئەو ژنە. دایکی لێی پرسی: بۆچ وا ئەڵێی؟ وتی: ئەو پیاوە جەببارێکە لە جەبباران، ئەم ژنە پێی ئەڵێن: زینات کردووە نەیکردوە، پێی ئەڵێن: دزیت

(١) بیکەن بەدارا.
(٢) لە دەقە عەرەبییەکەدا (من طین)ە واتە (لە قور) نەك (لە گڵ).

کردووەو نەیکردوە.

[٤ ـ شاهیدی یوسف.

٥ ـ کوڕی سەرداهێنەری کچی فیرعەون کە فیرعەون تەمای بوو بیخاتە ناو ئاگرەوە بە دایکی وت: صەبر بکە تۆ لە سەر حەقی.

٦ ـ منداڵەکەی (أصحاب الأخدود) ـ رابورد ـ.

٧ ـ عند الضحاك يحيى ـ عليه السلام ـ.

٨ ـ واقیدیی ئەفەرموێ: پێغەمەر ـ ﷺ ـ کە تەشریفی هاتە دنیاوە. ئیبن وعەباس لە حەلیمەی سەعدیەوە ـ رضي الله تعالى عنهم ـ ریوایەت ئەکا کە لەو وەختەدا کە پێغەمەری ـ ﷺ ـ لە مەمك بڕیەوە فەرمووی: (الله أكبر كبيرا، والحمد لله كثيرا، وسبحان الله بكرة وأصيلا).

٩ ـ موعەیقیبی یەمانی ـ رضي الله تعالى عنه ـ ئەفەرموێ: لە حەجی وەداعا چووم بۆ حەج، چوومە ماڵێکەوە تەشریفی موبارەکی پێغەمەر ـ ﷺ ـ ی لێ بوو، شتێکی عەجایەبم لێ دی، پیاوێ لە ئەهلی یەمامەوە هاتە خزمەتی منداڵێکی ئەو ڕۆژە لەدایکبووی هێنایە خزمەتی. پێغەمەر ـ ﷺ ـ پێی فەرموو: ئەی غولام من کێم؟ فەرمووی: تۆ رەسوولوڵلای. پێغەمەر ـ ﷺ ـ = فەرمووی: = راستت وت (بارك الله فيك) لە پاشا ئەو غولامە تاگەورە بوو قسەی نەکرد. پێمان ئەوت: موبارەکی یەمامە. (رواه البيهقي.قسطلاني)]

**١٥١٧/٣٦ـ عن أبي هريرة قال: كان جريج يتعبد في صومعة فجاءت أمه. قال حميد: فوصف لنا أبو رافع صفة أبي هريرة لصفة رسول الله ـ ﷺ ـ أمه حين دعته كيف جعلت كفها فوق حاجبها ثم رفعت**

رأسها إليه تدعوه. فقالت: ياجريج أنا أمك كلّمني، فصادفته يصلي. فقال: اللهم أمي وصلاتي! قال: فاختار صلاته. فرجعت، ثم عادت في الثانية فقالت: يا جريج أنا أمك فكلمني. قال: اللهم أمي وصلاتي! فاختار صلاته فقالت: اللهم إن هذا جريج وهو ابني، وإني كلمته فأبى أن يكلمني. اللهم فلا تمته حتى تريه المومسات. قال: ولو دعت عليه أن يفتن لفتن.

قال: وكان راعي ضأن يأوي إلى ديره. قال: فخرجت امرأة من القرية فوقع عليها الراعي، فحملت فولدت غلاما، فقيل لها: ماهذا؟ قالت: من صاحب هذا الدير. قال: فجاؤا بفؤسهم ومساحيهم فنادوه، فصادفوه يصلي فلم يكلمهم. قال: فأخذوا يهدمون ديره، فلما رأى ذلك نزل إليهم، فقالوا: سل هذه، قال: فتبسم ثم مسح رأس الصبي، فقال: من أبوك؟ فقال: أبي راعي الضأن، فلما سمعوا ذلك منه قالوا: نبني ما هدمنا من ديرك بالذهب والفضة! قال: لا، ولكن أعيدوه ترابا كما كان ثم علاه. م ـ ٩/٤٤٢.

١٥١٨/٣٧ـ وعنه عن النبي -ﷺ- قال: لم يتكلم في المهد إلا ثلاثة: عيسى بن مريم، وصاحب جريج، وكان جريج رجلا عابدا، فاتخذ صومعة، فكان فيها، فأتته أمه وهو يصلي، فقالت: يا جريج. فقال: ياربي أمي وصلاتي! فأقبل على صلاته فانصرفت. فلما كان من الغد أتته وهو يصلي. فقالت: ياجريج، فقال: ياربي أمي وصلاتي! فأقبل على صلاته. فانصرفت، فقالت: اللهم لا تمته حتى ينظر إلى وجوه المومسات! فتذاكر بنو إسرائيل جريجا وعبادته، وكانت امرأة

بغي يتمثل بحسنها فقالت: إن شئتم لأُفْتننَّه لكم! قال: فتعرضت له فلم يلتفت إليها. فأتت راعيا كان يأوي إلى صومعته فأمكنته من نفسها فوقع عليها، فحملتْ، فلما ولدت قالت: هو من جريج. فأتوه فاستنزلوه وهدموا صومعته وجعلوا يضربونه. فقال: ماشأنكم؟ قالوا: زنيتَ بهذه البغي فولدتْ منك! فقال: أين الصبي؟ فجاؤا به، فقال: دعوني حتى أصلِّي فصلّى، فلما انصرف أتى الصبي فطعن في بطنه وقال: ياغلام من أبوك؟ قال: فلان الراعي. قال: فأقبلوا على جريج يقبّلونه ويتمسحون به، وقالوا: نبني لك صومعتك من ذهب. قال: لا، أعيدوها من طين كما كانت، ففعلوا.

وبينا صبي يرضع من أمه فمرَّ رجل راكب على دابة فارهة وشارة حسنة، فقالت أمه: أللهم اجعل ابني مثل هذا. فترك الثدي وأقبل إليه فنظر إليه، فقال: أللهم لا تجعلني مثله! ثم أقبل على ثديه فجعل يرتضع، قال: فكأني أنظر إلى رسول الله ـ ﷺ ـ وهو يحكي ارتضاعه بأصبعه السبابة في فمه فجعل يمصها. قال: ومروا بجارية وهم يضربونها ويقولون: زنيتِ سرقتِ، وتقول: حسبي الله ونعم الوكيل. فقالت أمه: أللهم لا تجعل ابني مثلها فترك الرضاع ونظر إليها. فقال: أللهم اجعلني مثلها. فهناك تراجعا الحديث:

دەستیان کرد بە قسەکردن لەگەڵ یەك.

فقالت: حلقى:

دایکەکەی پێی‌وت: سەرت بە تاشین چێ!

مرَّ رجل حسن الهيئة، فقلتُ: اللهم اجعل ابني مثله. فقلتَ:

اللهم لا تجعلني مثله. ومرّوا بهذه الأمة وهم يضربونها ويقولون زنيتِ سرقتِ، فقلتُ: اللهم لا تجعل ابني مثلها، فقلتَ: اللهم اجعلني مثلها؟ قال: إن ذاك الرجلَ كان جبّاراً فقلتُ: اللهم لا تجعلني مثله. وإن هذه يقولون لها: زنيتِ ولم تزنِ، وسرقتِ ولم تسرِق، فقلت: اللهم اجعلني مثلها. ـ ٤٤٣/٩.

ئەم سێ حەدیثە مەئالیان یەکێکە بەعزێ فەرقیان =تیایە= تەنها مەعنای فەرقەکەیان کافی‌یە:

لە ئەوەڵی حەدیثی دوەما ئەفەرموێ: پێغەمەر ـ ﷺ ـ تەصویری دایکی جورەیجی کرد کە دەستی موبارەکی نایە سەر بڕۆی‌و سەری هەڵبری‌و بانگی‌کرد: (یاجُریج).

لە حەدیثی سێیەما ئەفەرموێ: بەنوئیسرائیل قسەی زۆریان لە عیبادەتی جورەیج کرد، ژنێکی فاحیشە پێی‌وتن: ئەچم تووشی فیتنەی ئەکەم. باقیەکەی وەك حەدیثە ئەوەڵەکە وایە.

تمت أحاديث الأنبياء والحمد لله أولا وآخرا.
٩٤١/٣/٩

# باب البر للوالدين والأقربين والصِّلة للأرحام

﴿ووصينا الإنسان بوالديه حسنا . . . ﴾[1] الآية

١/١٥١٩- عن أنس بن مالك، وأبي هريرة - رضي الله تعالى عنهما - قال: سمعت رسول الله -ﷺ- =يقول=: من سره [أحب . أخرى . خ] أن يبسط له في رزقه، أوينسأ له في أثَره [أي بقية عمره] فليصل رحمه . ح - ١٦/٤ . ح - ٩/١٠/ . م - ٩/٤٤٩ .

تەرجەمە:

ئەنـەس و ئەبـو هورەیرە - رضي الله تعـالى عنهما - ئەفەرموون: لە پێغەمەر -ﷺ- م بیست ئەیفەرموو: هەرکەسێ ئەیەوێ کە رزقی واسیع بێ و ئەجەلی دوا بخرێ صیلەی رەحمی بەجێبێنێ.

[ئەبوموسای مەدینی - رحمه الله - لە عەبدوڵلای کوڕی عەمری عاصەوە ریوایەت ئەکا کە پێغەمەر -ﷺ- فەرمووی: ئینسان وا ئەبێ هەر سێ رۆژی لە دنیا ئەمێنێ صیلەی رەحم بە جێ بێنێ، خوا - عزوجل - سی ساڵ لە عومری زیاد ئەکا. وا ئەبێ سی ساڵی لە دنیادا ماوە قەطعی رەحم ئەکا، خوا - عزوجل - لە عومری کەم ئەکاتەوە تا وای لێ بێ کە هەر سێ رۆژی ئەمێنێ. ئەبوموسا ئەفەرموێ: ئەم حەدیثە حەدیثێکی حەسەنە.]

---

(١) عنکبوت/ ٨. دانەر - خ - مانای ئایەتەکەی نەنووسیوە، ئەمە ماناکەیەتی: ئامۆژگاری ئینسانم کردوە بەرابەر بە باوك و دایکی بە ئامۆژگاریەکی جوان کە بریتیە لە رەفتاری باش لەگەڵیانا لە کارو باری ژیانا بە هەموو جۆرێ.

ئەبـومـووسـا لە ئەبـوسـەعیـدي خدریی بە مەرفـووعیی لە تەوراتەوە ریوایەت ئەکا [یەعنی پێغەمەر -ﷺ- فەرموویەتی : ] لە تەوراتا نووسراوە : صیلەی رەحم، حوسنی خولق، چاکـەکـردن لەگـەڵ ئەقـریبـا. . . مەملەکەت ئاوا ئەکا، ماڵ زۆر ئەکا، لە ئەجەل زیاد ئەکا با ئەو قەومەی کە وا ئەکەن کافر بن. قسطلاني -٤-١٦.

**٢/١٥٢٠- عن أبي هريرة - رضي الله تعالى عنه - قال: جاء رجل إلى رسـول الله -ﷺ- فقـال: يارسـول الله من أحق [النـاس. م] بحسن صحـابتي؟ قال: أمـك. قال: ثم من؟ قال: [ثم. م] أمـك. قال: ثم من؟ قال: [ثـم. م] أمـك. قال: ثم من؟ قال: [ثم. م] أبـوك. ح - ٣/٩. م - ٤٣٩/٩ وفي أخرى ثم أدناك أدناك. م - ٤٤٠/٩. جه.**

تەرجەمە:

ئەبوهورەیرە - رضي الله تعالى عنه - ئەفەرموێ: پیاوێ هاتە خزمەت پێغەمەر -ﷺ- عەرزیکرد: (یارسول الله) کێ چاکترینی خەڵقە کە بە چاکێتی رەفیقایەتی لەگەڵ بگرم؟ فەرمووی: دایکت. عەرزیکرد: لە دوای ئەو کێ؟ - تا سێ جار - لە دەفعەی چوارەما فەرمووی: لە دوایی‌یا باوکت. لەحەدیثـەکـەی تری موسلیمـا ئەفـەرمـوێ: لە دواییدا کێ لێت نزیکتر بێ، لە دوای ئەو کێی تر لێت نزیك بێ.

**٣/١٥٢١- جبيـر بن مطعم [رضي الله تعـالى عنـه] أنـه سمـع النبي -ﷺ- قال [يـقـول. م]: لا يدخـل الجنـة قاطـع. ح - ٩/١٠. م - ٤٤٩/٩. وفيه: قال سفيان: يعني قاطع رحم. د،ت.**

تەرجەمە :

جوبـەیـری کوڕی موطعیم ـ رضي الله تعالى عنه ـ لە پێغەمەری ـ ﷺ ـ بیستـــوە کە ئەیفـــەرمـوو: قاطیعی رەحم ناچێتـە بەهـەشتـەوە. [یـەعنی لەگەڵ ئەوانەی کە =لە= پێش هەموو خەڵقا ئەچنە بەهەشت. یا خو بە بێ سەبـــەب، بە بێ شوبهـە بە حەلاڵی بزانێ عیلمیشی ببێ بەمـە کە حەرام کراوە؛ چونکی ئینکـاری شەرع ئەکـا. ئەممـا ئەگـەر بە حەرامی بزانێ‌و بیکا کافر نابێ وەك زیناو حەرام خواردن و موحەڕەماتی تر.]

١٥٢٢/٤ـ عن أبي هريرة [رضي الله تعالى عنه] عن النبي ـ ﷺ ـ قال: إن الله خلق الخلق حتى إذا فرغ من خلقه قالت الرحم: هذا مقام العـــائـذ بك من القطيعـة. قال: نعم أمـا ترضين أن أصـل من وصلكِ وأقطع من قطعكِ؟ قالت: بلى ياربي. قال: فهو لكِ. قال رسول الله ـ ﷺ ـ فاقرؤا إن شئتم: ﴿فهل عسيتم إن تولّيتم أن تفسدوا في الأرض وتقطعوا أرحامكم؟﴾[1] ح ـ ١١/٩. م ـ ٤٤٧/٩. وفيه الآية ﴿أم على قلوب أقفالها﴾[2] [سورة القتال] ح ـ ٣٢٨/٧. وفيه قال أبو هريرة: إن شئتم ن ح ـ ٤٣٤/١٠ وفيه: قامت الرحم فقال [تعالى]:مه قالت... وفيه أيضا: قامت الرحم فأخذت بحقو الرحمن. فقال [تعالى] له..

تەرجەمە :

ئەبـوهـورەیـرە ـ رضي الله تعـالى عنـه ـ ئەفـەرموێ: پێغەمەر ـ ﷺ ـ فەرمووی: خوا ـ عزوجل ـ خەلقی خەلق کرد، کە لە خەلق کردنی بۆوە

(١) محمد/٢٢.

(٢) محمد/ ٢٤.

ڕەحم ڕاوەستـا پشتێنی خوای گرت، خوا فەرمووی: پشتێنەکەم بەردە چیت دەوێ؟ عەرزی بارەگـای کرد: ئەم مەقـامـە ئەو مەقـامـەیە کە پەنای لێ ئەگیرێ لەوەی قەطعی ڕەحم بکرێ؟ خوا ـ عزوجل ـ فەرمووی: بەڵێ وایــە، بەوە ڕازی نابی کە هەرکــەسێ وەصلی تۆ بکـا [یـەعنی صیلەی ڕەحـم بکــا] منـیش صیـلەی ئەو بکــەم یەعـنـی ڕەحمی پێ بکــەم؟ =هەرکەسێ= قەطعی تۆ بکا منیش قەطعی ئەو بکەم؟ یەعنی ڕەحمی پێ نەکەم؟ عەرزیکرد: بەڵێ یارەببی بەوە ڕازی ئەبم. خوا ـ عزوجل ـ فەرمووی: ئەوە بۆ تۆ بێ.

پێغەمەر ـﷺـ لە ریوایەتەکەی ترا ئەبوهورەیرە ـ رضي الله تعالى عنه ـ فەرمــووی: ئەگــەر هەوەستــان یێنێ ئەو ئایـەتی ســوورەتی (الـذین کفروا)وە بخوێننەوە کە ئەفەرموێ: [هەر زەمانێ سوورەتێ نازڵ ببێ کە موحکەم بێو ئەمری بە موحارەبە تیا بێ ئەوانەی کە نەخۆشیی نیفاق لە دڵیانایە ئەبینی لە ترسی مردن وەك ئینسانی بێهۆش تێئەفکرن، وا چاکە بۆ ئەوان کە ئیطــاعـەتی تۆ بکــەن و قســەی باشت لەگـەڵ بکـەن کە موحارەبەکردن بە قەطعیی لەسەر ئێوە فەرز کرا، ئەگەر لەوەدا کە ئەڵێن ئیمـانمـان هەیـە بە تۆ ئیطـاعـەتت ئەکـەین ڕاستیی بکەن لەگەڵ خواداو درۆی تیــا نەکــەن بۆ ئەوان زۆر باش ئەبێ، ئەی مونــافیقــان] بۆ ئێـوە ئومێدتان وایە کە تەوەللاتان لە ئیمانی بەڕاستیی کرد بێنن فەساد لەسەر ئەرز بکـەن و قەطعی ڕەحم لەگـەڵ ئەقـاریبتـان بکەن و [شەڕیان لەگەڵ بکەن بچنەوە سەر عادەتی جاهیلییەت؟ ئەو موفسیدانە ئەوانەن کە خوا لەعنــەتی لێکـردوون و گوێی کەڕ کردوون، حەق نابیێن، چاوی کوێـر

کردوون حەق نابینن. ئایا ظەریف (تأمل) لە قورئان ناکەن تا لە حەق بگەن، یا دڵیان قفڵی لێ دراوەو داخراوە تێیَ ناگەن؟].

**١٥٢٣/٥ـ عن أبي هريـرة ـ رضي الله تعـالى عنـه ـ وعن عائشـة ـ رضي الله تعالى عنه ـ زوج النبي ـﷺـ عن النبي ـﷺـ قال: إن الرحم شجنـة [عـروق مشتبكـة مشتقـة] من الـرحمن فقـال الله تعـالى [لهـا ـ إسماعيلي]: من وصلكِ وصلته، ومن قطعك قطعته. ح ـ ١٢/٩.**

**تەرجەمە:**

ئەبوهورەیرە ـ رضي الله تعالى عنه ـ و حەزرەتی عایشەی حەرەمی پێغـەمـەر ـﷺـ ورضي عنهـا ـ ئەفـەرمـوون: پێغـەمەر ـﷺـ فەرمووی: رەحم رێگەو رەگی تێك ئاڵاوە هەموو ئەچنەوە سەر رەحمەتی رەحمان، لەفظـەکـەی لە کەلیمـەی رەحمـان دروست کراوە، خوا ـ عزوجـل ـ بە رەحمی فەرموو : هەرکەسێ صیلەی تۆ بەجێبێنێ صیلەی بەجێیێنم، هەرکەسێ قەطعی تۆ بکا، صیلەی رەحم نەکا، منیش قەطعی ئەو کەسە ئەکەم و رەحمی پێ ناکەم.

**١٥٢٤/٦ـ عن عائشة [رضي الله تعالى عنها] قالت: قال رسول الله ـﷺـ: الرحم معلقة بالعرش تقول: من وصلني وصله الله، ومن قطعني قطعه الله. م ـ ٤٤٨/٩.**

**تەرجەمە:**

عایشـە ـ رضي الله تعـالى عنهـا ـ ئەفـەرمـوێ: پێغـەمـەر ـﷺـ فەرمـووی: رەحم (معلق)ە بە عەرشـەوە ئەڵێ: هەرکـەس وەصڵی من

بکاو بەجێم بێنێ خوا صیلەی ئەو کەسە بکا، هەرکەس قەطعی من بکا خوایش قەطعی ئەو کەسە بکاو رەحمی پێ نەکا.

رەحم ئەمرێکی (إعتباری)یە لازمی رۆحە، خوا ـ عزوجل ـ مونەزەهە لە جیسمی یەت و لەمە کە قەدو پشتێنی ببێ، مونەزەهە لە هەموو عەواریضی حودووث کە وابێ ئەم حەدیثانەی کە دائیرن بە رەحم هەموو تەمثیل و مەجازن، موبالەغەیە لەمەداو ئەمری قەطعی یە بەمە کە ئینسان ئەبێ لەگەڵ هەموو کەسا بە رەحم بێ، با خوصووص، لەگەڵ خزم و ئەقریبادا، چۆن کەسێ ئیحتیاج بە کەسێ ببێ و لێی بپارێتەوە دەست ئەکا بە پشتێنیاو بە ذیللەت لێی ئەپارێتەوەو ئیحتیاجیی خۆیی عەرز ئەکا رەحم ئەوەندە لازمە کە ئینسان بە موقتەضای عەمەل بکا ئەگەر رۆح لەبەر بوایەو ئینسان بوایە، خوایش ـ تعالی وتقدس ـ (معاذ الله) جیسم بوایە بەو نەوعە رەحم دەستی ئەکرد بە پشتێنیاو لێی ئەپارایەوە. ئەمیش وەك دەست و پێ و (وجە) کە بە طەریقی مەجاز بۆ خوا لە قورئان و حەدیثا ئیستیعمال کراوە، حەتتا ئیستیعمالی کەلیمەی رەحمان و رەحیم و رەئووفیش بۆ خوا مەجازە، موراد غایەتی ئەو صیفەتانەیە.

**١٥٢٥/٧ـ عن عبد الله بن دينار عن عبد الله بن عمر [رضي الله تعالى عنهما] أنه كان إذا خرج الى مكة كان له حمار يتروح عليه إذا مل ركوب الراحلة، وعمامة يشد بها رأسه، فبينا هو يوما على ذلك الحمار إذ مرّ به أعرابي فقال: ألست ابن فلان بن فلان؟ قال: بلى. فأعطاه الحمار وقال: اركب هذا، والعمامة، قال: اشدد بها رأسك. فقال له بعض أصحابه: غفر الله لك أعطيت هذا الأعرابي حمارا كنت تَروَّحُ**

عليه وعمامة كنت تشد بها رأسك؟ فقال: إني سمعت رسول الله -ﷺ- يقول: إن من أبرِّ البرّ صلة الرجل أهل ودِّ أبيه بِعد أن يولّي، وإن أباه كان صدِّيقا لعمر [رضي الله تعالى عنه] م - ٩/٤٤٦.

تەرجەمە:

عەبدوڵڵای بنی دینار ـ رحمه الله ـ ئەفەرموێ: عەبدوڵڵای کوڕی عومەر ـ رضي الله تعالى عنهما ـ کە تەشریفی بچوایە بۆ مەککە گوێدرێژ یکی بوو کە =لە= سواریی وشتر ماندوو ببوایە بۆ ئیستیراحەت سواری گوێدرێژەکەی ئەبوو، مێزەرێکی بوو بەسەریەوە ئەبەست. لە رۆژێکا کە سواری گوێدرێژەکەی بووبوو بە لای عەرەبێکی بەڕانیدا رابوورد لێی پرسی: تۆ کوڕی فلاّنی کوڕی فلاّن نیت؟ عەرزی‌کرد: بەڵێ. گوێدرێژەکەی دایێ فەرمووی: سواری بە، مێزەرەکەی دایێ فەرمووی: بەسەرتی‌یەوە ببەستە. بەعزێ لە ئەصحابی عەرزی‌کرد: رەحمەتی خوات لێ بێ بەم عەرەبە بەڕانی‌یە گوێدرێژەکە کە ئیستیراحەتت لەسەر ئەکرد =دات پێی= مێزەرێکت دایێ کە سەرت پێ‌ئەبەست [ئەوانە بە کەمێ رازی ئەبن. أخری]؟ فەرمووی: لە پێغەمەر -ﷺ- م بیست ئەیفەرموو: چاکترینی چاکە ئەوەیە کە ئینسان چاکە بکا لەگەڵ دۆست و ئەحبابی باوکی لە دوای ئەمە کە باوکی پشتی‌هەڵکردو وەفاتی کرد. باوکی ئەم پیاوە ئەحباب و دۆستی عومەر بو. [ ـ رضي الله تعالى عنه ـ دۆست و ئەحبابی دایك و براو خزمی تریش هەرکەس بە پێی خزمایەتیی خۆی وایە صیلە بەجێهێنانیان خێرە بەوان].

١٥٢٦/٨- عن نواس بن سمعان [رضي الله تعالى عنه] قال: أقمت

مع رسـول الله -ﷺ- بالمـدينـة سنـة ما يمنعني من الهجـرة الى المدينة إلا المسألـة [لأن من توطَّن المـدينـة يفرحون بسؤال الغرباء دينهم عن النبي -ﷺ- وهم لا يسألونه كثيرا] كان أحدنا إذا هاجر لم يسأل رسول الله -ﷺ- عن شيء قال: فسألته عن البر والإثم، فقال رسول الله -ﷺ-: البر حسن الخلق، والإثم ما حاك في نفسك وكرهت أن يطلع عليه الناس. م - ٩/٤٤٧.

تەرجەمە:

نەوواسی کوڕی سەمعان ـ رضي الله تعالی عنه ـ ئەفەرموێ: ساڵێ لە مەدینــەدا لە خزمــەت پێغــەمــەرا -ﷺ- ئیقــامــەتم کرد. غەیـری سوئاڵ کردنی دین هیچ شتێ مەنعی نەئەکردم کە بە تەواویی هیجرەت بکەم بۆ [مەدینە؛ چونکی ئەوانی لە مەدینەدا بوون جەسارەتیان نەئەکرد کە شت لە پێغەمەر -ﷺ- بپرسن، حەزیان ئەکرد کە غەریب بێن سوئالی دینی خۆیانی لێ بکەن] ئێمەیش کە یەکێکمان هیجرەتی کرد سوئالی لە پێغەمەر -ﷺ- نەئەکرد [من هیجرەتم نەکرد تا بتوانم سوئالی لێ بکەم] لە چاکـەو گونـاه سوئـالم لێ کـرد فەرمووی: چاکە حوسنی خولقە [حوسنی خولق جامیعی هەموو صیفەتێکی چاکەیە] خراپە ئەوەیە کە بە دڵتا بێ و حەز نەکەی کە خەڵق پێی بزانن.

٩/١٥٢٧- عن أبي هريـرة [رضي الله تعـالى عنـه] عن النبي -ﷺ- قال: رغم أنفُ ثم رغم أنفُ ثم رغم أنفُ! قيل: من يارسول الله؟ قال: من أدرك أبويه عند الكبر أحدهما أو كليهما فلم يدخل الجنة. م - ٩/٤٤٥.

تەرجەمە:

ئەبوهورەیرە ـ رضي الله تعالى عنه ـ ئەفەرموێ: پێغەمەر ـﷺـ سێ دەفعـە فەرمـووی: لووتی لە ئەرز نیشێ! عەرزیـان کرد: (یـارسول الله) لووتی کێ؟ فەرمووی: لووتی ئەو کەسە کە بگا بە دایکی یا باوکی یا بە هەردوکیان لە وەختی پیرییاو نەچێتە بەهەشتەوە. یەعنی صیلەی رەحمیان لەگەڵ بەجێ نەهێنێ.

**١٥٢٨/١٠ـ عن عبـد الله بن عمـرو بن العـاص ـ رضي الله تعـالى عنهما ـ عن النبي ـﷺـ قال: ليس الواصل بالمكافيء، ولكن الواصل الذي إذا قَطَعْتَ رحمه وصلها. ح ـ ١٣/٩. د، ت.**

تەرجەمە:

صیلەی رەحم بەجێهێنـەر ئەو کەسـە نیـیە لە پاداشـا صیلە بەجێ بێنێ، ئەو کەسەیە کە تۆ صیلەی لەگەڵا بەجێنەهێنی ئەو بەجێی بێنێ.

**١٥٢٩/١١ـ عن أبي هريرة [رضي الله تعالى عنه] أن رجلا قال: يا رسول الله إن لي قرابة أصِلهم ويقطعوني، وأحسن إليهم ويسيئون إلي، وأحلم عنهم ويجهلون عليّ. فقال: لئن كنت كما قلت فكأنما تسفُّهم الملَّ، ولا يزال معك من الله ظهير عليهم ما دمت على ذلك. م ـ ٤٥٠/٩.**

تەرجەمە:

ئەبـوهـورەیـرە ـ رضي الله تعـالی عنـه ـ ئەفـەرموێ: پیاوێ عەرزی پێغـەمـەری کرد ـﷺـ: (یـارسـول الله) من بەعزێ خزمم هەیە صیلەی رەحمیـان بەجێیێنم ئەوان لەگـەڵ منـا بەجێی ناهێنن، چاکـەیان لەگەڵ

ئەکـەم ئەوان خراپـەم لەگـەڵ ئەکـەن، من حیلمیـان لەگەڵ ئەکەم ئەوان قسەی خراپم پێ ئەڵێن. پێغەمەر ـ ﷺ ـ فەرمووی: ئەگەر وەکوو ئەڵێی وابێ (كأنه) ژیلەمۆیان دەرخوارد ئەدەی، لە طەرەف خواوە لەسەر ئەوان بە دەوام پشتیوانێکت هەیە تا وابی لەگەڵیانا.

## الوصية بالجار

**١٢/ ١٥٣٠ـ عن عائشة ـ رضي الله تعالى عنها ـ عن النبي ـﷺـ قال: مازال جبـريـل [عليـه السـلام] يوصيني بالجار حتى ظننت أنه سيورِّثه ح ـ ٩/٢٣. م ـ ١٠/ ٦٠. ت، د، جه.**

**تەرجەمە:**

پێغـەمـەر ـﷺـ فەرمـووی: جیبـریـل ـ علیـه السـلام ـ ئەوەنـدەی دەرحەق دراوسێ وەصیەت پێکردم حەتا وام ظەن ئەبرد کە ئەیکا بە واریث.

**١٣/١٥٣١ـ عن أبي هريرة [رضي الله تعالى عنه] قال: قال رسول الله ـﷺـ:**

**١ ـ لا تحاسدوا.**

**٢ ـ ولا تناجشوا.**

**٣ ـ ولا تباغضوا.**

**٤ ـ ولا تدابروا.**

**٥ ـ ولا يبع بعضكم على بيع بعض.**

**٦ ـ وكونوا عباد الله إخوانا المسلم أخو المسلم**

٧ ـ لا يظلمه.

٨ ـ ولا يخذله. ولا يحقره. التقوى ههنا، ويشير الى صدره، ثلاث مرات. بحسب امرىء من الشر أن يحقِّر أخاه المسلم، كل المسلم على المسلم حرام: دمه، وماله، وعرضه . م ـ ٩/٤٥٤. وفي رواية زيادة: إن الله لا ينظر الى [صوركم وأموالكم. م] أجسادكم، ولا إلى صوركم، ولكن ينظر إلى قلوبكم [وأعمالكم. م] وأشار بأصبعه إلى صدره. م ـ ٩/٤٥٤.

١٤/١٥٣٢ـ وعنه أن رسول الله ـ ﷺ ـ قال: إياكم والظن فإن الظن أكذب الحديث، ولا تحسَّسوا، ولا تجسَّسوا [ولا تنافسوا. م] ولا تحاسدوا، ولا تباغضوا، ولا تدابروا، وكونوا عباد الله إخوانا. م ـ ٩/٤٥٣. ح ـ ٩/٤٦.

١٥/١٥٣٣ـ عن أنس بن مالك أن رسول الله ـ ﷺ ـ قال: لا تباغضوا، ولا تحاسدوا، ولا تدابروا، وكونوا عباد الله إخوانا، ولا يحل لمسلم أن يهجر أخاه فوق ثلاثة أيام. وزاد ابن عيينة: ولا تقاطعوا. ح ـ ٩/٤٦. م ـ ٩/٤٥٠.

١٦/١٥٣٤ ـ عن أبي أيوب الأنصاري [رضي الله تعالى عنه] أن رسول الله ـ ﷺ ـ قال: لا يحل لمسلم أن يهجر أخاه فوق ثلاث ليال، يلتقيان، فيُعرضُ هذا ويُعرضُ هذا، وخيرهما الذي يبدأ بالسلام. م ـ ٩/٤٥٢. ح ـ ٩/٥١.

[ولأبي داود بسند صحيح عن أبي هريرة ـ رضي الله تعالى عنه ـ: فإن مرَّت به ثلاث فلقيه فليسلِّم عليه؛ فإن ردَّ فقد اشتركا في الأجر،

وإن لم يرد فقد باء بالإثم، وخرج المسلِّم من الهجرة. قسطلاني ٥١/٩].

تەرجەمە:

مەئالی ئەم حەدیثانە بە جارێ ئەمەیە: لە ئەبوهورەیرەوە - رضي الله تعالى عنه - پێغەمەر - ﷺ - فەرمووی:

١ - حەسەد بە یەکتری مەبەن.

٢ - بە درۆ لەسەر نرخی ماڵ زیاد مەکەن بۆ خاتری ئەمە یەکێ بغەڵەتینن بۆ یەکێکی تر، یەعنی بێ ئەمە خۆتان طالیبی کرینی ماڵێ بن لەسەر نرخی زیاد بکەن بۆ خاتری ئەمە ئەو ماڵە زیاد لە قیمەتی خۆی بۆ یەکێ بفرۆشرێ.

٣ - یەکتری مەبوغزێنن. ٤ - لە رێ بەیەك گەیین روو لە یەك وەرمەگێڕن و پشت بکەنە یەك.

٥ - لەسەر بەیعی کەس بەیع مەکەن. یەعنی کەسێ سەودای شتێکی کرد کە بیکڕێو لەسەر نرخێ قەراریان =دا= مەچن ئەو شتە مەکڕن[(١)]

٦ - هەموو عەبدی خوا بن،ببن بە برای یەکتری، موسوڵمان برای موسوڵمانە، زوڵمی لێ نەکا، یەکێ زوڵمی لێ کرد لە یاریەدان مەحرورومی نەکا، هیچ کەس تەحقیر نەکا، ئیمان لێرەدایە (سێ جار ئیشارەتی سنگی موبارەکی خۆیی کرد) لە شەڕ ئەوەندە کافی‌یە بۆ ئینسان کە تەحقیری برای موسوڵمانی خۆی بکا.

(١) ئەگەر (بکڕن) بێ باشترە.

ئەبوموسای فەرموو: بیبه. له ریوایەتێکا ئەفەرموێ: چووم و شەهادەتم بۆ دا. له ریـوایـەتێـکـا: ئیمـامی عومـەر ئەفەرموێ: گوێمان لێت بوو، ئێمه لەو وەختەدا له شوغلا بووین بۆ ئیذنت نەخواست تا ئیذن بدرێی؟ عەرزم کرد: سێ دەفعه ئیذنم خواست وەك له پێغەمەر -ﷺ- م بیستوه. فەرمــووی: پشت و زکت ئازار ئەدەم، یا له سەر ئەوه شاهیــد بێنــه که پێغەمەر -ﷺ- وای فەرموه.

له ریـوایـەتـەکـەی ترا فەرمـووی: ئەبـوو مووسا گەڕایەوه بۆ شاهید ئیمامی عومەر - رضي الله تعالی عنه - فەرمووی: ئەگەر ئێوارێ له لای مینبـەرەکـەوه بی‌بینن شاهیـدی دەست کەوتـوه، ئەگەر نەیبینن شاهیدی دەست نەکـەوتـوه. که ئێـوارێ هات لای مینبـەرەکـەوه دییـان. ئیمامی عومەر - رضي الله تعالی عنه - =فەرمووی:= (یا ابو موسی) ئەڵێی چی؟ شاهیدت دەست کەوت؟ عەرزی‌کرد: بەڵێ ئوبەیی بنی کەعبه. فەرمـووی: عەدڵـه. لێی‌پـرسیی: ئەی (ابـو الطفیـل) ئەمه ئەڵێ چی؟ عەرزی‌کرد: له پێغەمەر -ﷺ- م بیست که وای ئەفەرموو، ئەی (ابن الخطاب)مەبه به عەذاب لەسەر ئەصحابی رەسولوڵلا -ﷺ-. ئیمامی عومەر فەرمووی: (سبحان الله) شتێکم بیست حەزم کرد تا تەواو لێم یەقین بێ.

## الرقـــــاق

ئەو حەدیثـانـەی کە دڵ لەطیف و نەرم ئەکـا، رەحمـەت و خەوفی خوای تیا پەیدا ئەکا. (ضد)ی رەقیق قەسوەتەو دڵ رەقی.

**١٦٠٦/١- عن ابن عمر - رضي الله تعالى عنه - قال: رأيتني مع النبي -ﷺ- [أي في زمنه] بنيت بيدي بيتا يُكنُّني من المطر، ويُظِلُّني من الشمس ما أعانني عليه أحد من خلق الله. ح - ٩/١٦٤ جه في الزهد.**

تەرجەمە:

ئیبن وعومەر - رضي الله تعالى عنهما - ئەفەرموێ: خۆم بینی لە زەمانی پێغەمەرا -ﷺ- کە بە دەستی خۆم خانوویێکم دروست کرد کە لە باران موحافەظەم بکاو لە رۆژ سێبەرم بۆ بکا، هیچ کەس لە مەخلووقی خوا یاریەی نەدام.

**١٦٠٧/٢- قال عمرو بن دينار: قال ابن عمر [رضي الله تعالى عنهما]: والله ما وضعت لبِنَةً على لبنة، ولا غرست نخلة منذ قبض النبي -ﷺ-. قال سفيان [بن عيينة] فذكرته لبعض أهله قال: والله لقد بنى. قال سفيان: قلت: فلعله قال قبل أن يبني. ح - ٩/١٦٤.**

تەرجەمە

سوفیانی کوڕی عویەینە ئەفەرموێ: عەمری کوڕی دینار فەرمووی کە: عەبدوڵلای کوڕی عومەر - رضي الله تعالى عنهما - فەرمووی: وەڵلاهی! لەو وەختەوە کە پێغەمەر -ﷺ- وەفاتی کردوە خشتێکم نەناوەتە سەر خشتێ خورمـایێکم دانەچەقانوە. سوفیان ئەفەرموێ: ئەمەم بۆ بەعـزێ کەس و کاری ئیبن وعـومـەر - رضي الله تعـالى عنهمـا - نەقـڵ کرد. وتی: وەڵـلاهی بینـای دروست کردوە. سوفیـان ئەفـەرموێ

ئیبن وعومەر - رضي الله تعالى عنهما - =ئەفەرموێ=: ئەم قسەی کە عەمر نەقڵی کردوە ڕەنگە لە پێش ئەمەدا بووبێ کە بینای دروست کردبێ.

## قلة غنـــاء الدنيا[1]

**قال الله - تعـالى -: ﴿إعلمـوا أنمـا الحياة الدنيا لعب، ولهو، وزينة، وتفـاخـر بينكم، وتكـاثـر في الأموال والأولاد، كمثل غيث أعجبَ الكفارَ نباتُه، ثم يهيج فتراه مصفرًا، ثم يكون حطاما، وفي الآخرة عذاب شديد ومغفرة من الله ورضوان، وما الحياة الدنيا إلا متاع الغرور﴾[2] [حديد].**

**ح - ٩/٢٢٦.**

حەیفە بۆ ئینسان ئەم نەوعە بەلاغەتە لە قورئانا ببینێ‌و بڕوای پێ نەکا.

خوا - عزوجل - ئەفەرموێ:

دنیـا هەر یاریی منـاڵانـەو، سمت بادانی کوڕچـەکـانـەو، زینـەتی ژنـانـەو، فەخـر بەسەر یەکاکردنی ئەقران و ئەمثالەو، بە زۆربوونی ماڵی دنیـــایی‌و ئەولادە. وەك بارانێ وایـە ئەو گیـایـەی کە ئەیـروێنێ کافـران ئەخـــاتـە حیـرەتـەوە، لە پاشـا خوا دەردێکی بۆ ئەنێـرێ بەم لاو بەولادا ئەکەوێ پەرێشان ئەبێ‌و، لە دوای سەوزیی بەزەردیی ئەیبینی‌و، لە پاشا ئەبێ بە پووش. لە ئاخیرەتا بۆ کافران عەذابێکی بەشیددەت هەیەو، بۆ موئمینـان عەفـوی خوایی‌و ڕەزای خوایی هەیـە. حەیـاتی دنیـا غەیـری

(١) زۆر گوێ‌نەدان بە دارایی دنیا.

(٢) الحديد/ ٢٠.

مەتاعێ کە ئینسانی پێ مەغروور ببێ هیچی ترنیە [یەعنی بۆچ بۆ موددەییێکی کەمی دنیا عەذابێکی دائیمیی ئیختیار ئەکەن و نیعمەتێکی ئەبەدیی لە کیس خۆتان ئەدەن؟].

**١٦٠٨/٣- عن أبي هريرة [رضي الله تعالى عنه] قال: قال رسول الله -ﷺ-: الدنيا سجن المؤمن وجنة الكافر. م - ١٠/٤١٥.**

**تەرجەمە:**

پێغەمەر -ﷺ- فەرمووی: دنیا حەبسخانەیە بۆ موسوڵمان و بەهەشتە بۆ کافران [یەعنی موسوڵمان با زۆر دەوڵەمەند بێ و روفاهی حاڵی ببێ دنیا بۆ ئەو زیندانە بە نیسبەت نیعمەتی ئاخیرەتەوە، کافر با شەل بێ و کوێر بێ و بە ئەنواعی دەردو فەقیریی موبتەلا بێ. دنیا بۆ ئەو وەك بەهەشت وایە بە نیسبەت عەذابی ئاخیرەتەوە - أعاذنا الله منها -]

**١٦٠٩/٤- عن عبد الله بن عمر - رضي الله تعالى عنهما - قال: أخذ رسول الله -ﷺ- بمنكبي فقال: كن في الدنيا كأنك غريب أو عابر سبيل، وكان ابن عمر [رضي الله تعالى عنهما] يقول: إذا أمسيت فلا تنتظر الصباحَ، وإذا أصبحت فلا تنتظر المساء، وخذ من صحتك [لسقمك. أحمد والترمذي] لمرضك، ومن حياتك لموتك ح - ٢٢٧/٩. ت.**

**تەرجەمە:**

عەبدوڵڵای کوری عومەر - رضي الله تعالى عنهما - ئەفەرموێ: پێغەمەر -ﷺ- شانی گرتم فەرمووی: لە دنیا وەك غەریب یا وەك رێبوار وابە [چۆن غەریب یا رێبوار دڵ بەو جێیە خۆش ناکا کە لێی بێ،

تەعميرى ناكا. . لەگەڵ دنيادا تۆيش وابە؛ چونكى بەجێى يێڵى].
ئيبن و عومەر ـ رضي الله تعالى عنهما ـ ئەيفەرموو: كە ئێوارێت بەسەرا هات مونتەظيرى بەيانى مەبە، كە بەيانيت بەسەرا هات مونتەظيرى ئێوارێ مەبە. [چەند كەسى وام ديوە بەيانى ساغ بووەو نەكەوتۆتە شەو، شەو ساغ بووەو نەكەوتۆتە ئێوارێ!]. بەعزێ لە زەمانى ساغيت هەڵگرە بۆ وەختى نەخۆشيت، نەختێ لە زەمانى ژيانت هەڵگرە بۆ وەختى مردنت [يەعني بە ساغيى زياد لەو وەظيفەى دينى يە كە هەتە عيبادەتى بەدەنى و ماڵى بكە؛ چونكى كە نەخۆش كەوتى ناتوانى عيبادەت بكەى، لە زەمانى حەياتتا عيبادەتى زۆر بكە كە مردى پەكى عيبادەتت ئەكەوێ. ].
لەيث ئەوەى لە حەديثەكە زيادكردوە كە پێغەمەر ـ ﷺ ـ بە عەبدوڵلاى فەرموو: ئەى عەبدوڵلا چونكى نازانى سبەينێ، يەعنى رۆژى قيامەت، ناوى تۆ چيە؛ شەقييت ناو ئەنێن يا سەعيدت ناوئەنێن.
[ئيبن و عەباس ـ رضي الله تعالى عنهما ـ ئەفەرموێ: پێغەمەر ـ ﷺ ـ وەعزى بۆ پياوێ دائەدا پێى فەرموو: پێنج شت لە پێش پێنج شتا بە غەنيمەت بزانە: جوانيت لە پێش پيربوونتا. ساغيت لە پێش نەخۆشيتا. دەوڵەمەنديت لە پێش فەقيريتا. دەست بەتاڵيت لە پێش ئەمەتا كە لەبەر مەشغووڵيت هيچت پێ نەكرێ. حەياتت لە پێش مردنتا؛ چونكە لەو پێنج وەختەدا ئەتوانى ئيحسان و عەمەلى باش بكەى، لە دواى =ئەو= پێنج وەختە دەستەڵاتى ئيشكردنت نامێنێ. حاكم].

**٥/١٦١٠- عن ابن عباس ـ رضي الله تعالى عنهما ـ قال: قال النبي -ﷺ-: نعمتان مغبون فيهما كثير من الناس: الصحة والفراغ. ح ـ ٢٢٥/٩. ت، ن، جه.**

**تەرجەمە:**

پێغەمەر -ﷺ- فەرمووی: دوو نیعمەت هەن کە گەلێ کەس تیایانا بە غەلەط چوە: صیحەتی بەدەن و، دەست بەتاڵی لە مەشغووڵ بوون بە وەجهی مەعیشەت. یەعنی ئینسان لەو دوو حاڵەتەدا لازمە لەسەری کە زۆر ئیش بکا بۆ ئاخیرەتی.

**٦/١٦١١- مستورد أخو بني فهر [رضي الله تعالى عنه] يقول: قال رسول الله -ﷺ-: والله ما الدنيا في الآخرة إلا مثل ما يجعل أحدكم إصبعه هذه ـ وأشار يحيى [أحد الرواة] بالسبابة ـ في اليم، فلينظر بم يرجع م ـ ٣٢٧/١٠.**

**تەرجەمە:**

موستەوریدی برادەری بەنی فەهر ـ رضي الله تعالى عنه ـ ئەفەرموێ: پێغەمەر -ﷺ- فەرمووی: وەڵڵاهی دنیا بە نیسبەت ئاخیرەتەوە وەك ئەوە وایە کە یەکێکتان ئەم پەنجەیەی بکا =بە= بەحراو دەری بێنێ تێفکرێ کە پەنجەی، چی لە بەحرەکە پێنێتە دەرێ. یەحیا کە یەکێکە لە راوی یان ئیشارەتی پەنجەی شەهادەتی خۆیی کرد. یەعنی ئەو تەڕی یەی کە بە پەنجەیەوە ئەنووسێ لە بەحرەکە دنیایە، بەحرەکە ئاخیرەتە.

**٧/١٦١٢- وقال علي ـ رضي الله تعالى عنه ـ [موقوفا عليه]: ارتحلت**

**الدنيا مدبرة، وارتحلت الآخرة مقبلة، ولكل واحد منهما بنون، فكونوا من أبناء الآخرة ولا تكونوا من أبناء الدنيا؛ فإن اليوم عملٌ ولا حساب، وغدا حسابٌ ولا عملَ. ح ـ ٢٢٨/٩.**

تەرجەمە:

عەلی ـ رضي الله تعالى عنه ـ بە مەوقووفیی ـ ئەفەرموێ: دنیا پشتـی هەڵکـردووە ئەڕوا، قیـامـەت رووی تێکـردووین و یێت، بۆ هەردوکیان ئەولاد [یەعنی طالیب] هەیە. لە ئەولادی ئاخیرەت بن لە ئەولادی طالیبی دنیا مەبن؛ ئیمڕۆ ڕۆژی عەمەلەو حیساب و لێپرسینەوە نیە، سبەینێ ڕۆژی حیسابەو ڕۆژی عەمەل نیە.

**١٦١٣/٨ـ عن جابر بن عبد الله [رضي الله تعالى عنهما] أن رسول الله ـﷺـ مرّ بالسـوق داخـلا من بعض العـاليـة والنـاس كَنَفَتَه، فمرّ بجدي أسك [گوێکورت] ميت، =فتناوله= فأخذ بأذنه، قال: أيكم يحب أن هذه له بدرهم؟ فقـالـوا: ما نحب أنـه لنـا بشيء، ومـانصنـع به؟ قال: أتحبون أنه لكم؟ قالوا: والله لو كان حيا كان عيبا فيه لأنه أسَكّ فكيف وهو ميت؟ فقال: فوالله! لَلدُّنيا أهون على الله من هذا عليكم. م ـ ١٠/٤١٥.**

**وفي أخرى مثله: فلو كان حيا كان هذا السَّكَك به عيبا. م.**

تەرجەمە:

جابیری کوڕی عەبدوڵڵا ـ رضي الله تعالى عنهما ـ ئەفەرموێ: پێـغـەمـەر ـﷺـ لە طەرەفـی لای ژووروی مەدیـنـەوە، خەڵـقی لە تەنیشتـەوە بوو، تەشـریفی هاتـە ناو بازاڕ بە بازارا ئەڕۆیی، بە لای کارژۆڵـەیـێکـی گوێکـورتـی مردارەوەبـووا ڕۆیـی، گوێـی گرت و

هەڵی گــرت و فەرمــووی: کێ حەزەکــا ئەمــەی بە درهــەمێ بێ؟ عەرزیان کرد: حەز ناکەین کە بە هیچ ئەوەمان ببێ، چی لێ بکەین؟ فەرمووی: حەزەکەن کە [هەروا] بۆ ئێوە بێ؟ عەرزیان کرد: وەڵڵاهی ئەگەر زینـدوو بوایـە گوێکـورتیـەکەی عەیب ئەبو تیایا؛ چونکی گوێ قوڵــە، کە وابێ چۆن حەزی لێ ئەکـەین کە مردارەوەبـوە؟ فەرمـووی: وەڵڵاهی دنیا لە لای خوا لەوە کەمترو حەقیرترە لە لای ئێوە. یەعنی ئەمە لای ئێوە چەندە سووك و بێ‌قیمەتە دنیا لە لای خوا لەوە سووکترو بێ‌قیمەتترە.

**٩/١٦١٤ـ عن مطرف عن أبيه [رضي الله تعالى عنه] قال: أتيت النبي ـﷺـ وهو يقرأ ﴿ألهاكم التكاثر﴾ قال: يقول ابن آدم:مالي مالي! وهل لك يا ابـن آدم من مالِــك إلا ما أكـلت فأفـنيت، أو لبست فأبليت، أو تصدقت فأمضيت؟ م ـ ١٠/٤١٥.**

**تەرجەمە:**

(مطرف) لەباوکیەوە ـ رضي الله تعالى عنه ـ ریوایەت ئەکا چوومە خزمـەت پێغـەمـەر ـﷺـ ﴿ألهـاکم التکـاثـرُ﴾ی ئەخـوێنـد فەرمووی: بەنـی‌ئــادەم ئەڵـێ: ماڵم ماڵم! ئەی بەنی‌ئــادەم بۆ تۆ غەیــری ئەوەی ئەیخــۆیت و بە فەنــادای ئەبــەیت و، ئەوەی کە لەبــەری ئەکــەیت و ئەیرزێنی و، غەیــری ئەوەی کە ئەیکـەی بە صەدەقـەو لە پێش خۆتـەوە ئەینێری هیچ ماڵی ترت هەیە؟

**١٠/١٦١٥ـ عن أبي هريرة [رضي الله تعالى عنه] أن رسول الله ـﷺـ قال: يقول العبد: مالي مالي! إنما له من ماله ثلاث: ما أكل فأفنى، أو لبس فأبلى، أو أعطى فاقتنى. وما سوى ذلك فهو ذاهب وتاركه للناس.**

م - ٤١٦/١٠ .

تەرجەمە :

پێغەمەر ـ ﷺ ـ فەرمووی: عەبد ئەڵێ: ماڵم ماڵم! عەبد لە ماڵی خۆی سێ شتی هەیە: ئەوی خواردوویەتیو نەیهێشتوە، ئەوی پۆشیویەتیو رزانوویەتی، ئەوی بەئیحسان داویەتی بە موستەحەق و پاشەکەوتی کردوە. غەیری ئەو سێ شتە ئەڕواو بۆ خەڵقی بەجێ ییڵێ.

١١/١٦١٦ـ عن عبد الله بن عمرو بن العاص ـ رضي الله تعالى عنهما ـ عن رسول الله ـ ﷺ ـ أنه قال: إذا فتحت عليكم فارس والروم أي قوم أنتم؟ قال عبد الرحمن بن عوف [رضي الله تعالى عنه]: نقول كما أمرنا الله. قال رسول الله ـ ﷺ ـ: أو غير ذلك؟ تتنافسون، ثم تتحاسدون، ثم تتدابرون، ثم تتباغضون، أو نحو ذلك. ثم تنطلقون في مساكين المهاجرين؛ فتجعلون بعضهم على رقاب بعض. م ـ ٤١٧/١٠ .

تەرجەمە :

پێغەمەر ـ ﷺ ـ فەرمووی: کە ئێوە فارس و رۆمتان فەتح کرد چۆن قەومێ ئەبن؟ عەبدوڕەحمانی کوڕی عەوف عەرزیکرد: ئەڵێین وەك خوا ئەمری پێکردووین وا ئەبین. پێغەمەر ـ ﷺ ـ فەرمووی: یا غەیری ئەوە ئەبن؟ نەفسانییەت لەگەڵ یەکا ئەکەن، حەسەد بە یەکتریی ئەبەن، پشتەکەنە یەك و قسە لەیەك دائەبڕن، بوغزی یەکتریی ئەکەن. یا وەك =ئەو= شتانە ئەکەن. لە پاشا ئەکەونە ناو موهاجیری فەقیرەوە کوشتاریان لێ ئەکەن ئەیان دەن بەسەر یەکا [وەك لیژنە دار].

دوو موعجیزەی گەورەی تیایە:

فارس و رۆم فەتح کرا کە بە خەویشیانا نەئەهات.

حەسەدو نەفسانیەت و ئەوانی تریشیان کرد.....

**١٦١٧/١٢ـ عامــر بن سعــد [بن أبي وقــاص] قال: كان سعــد بن أبي وقــاص [رضي الله تعــالى عنــه] في إبله فجاءه ابنه عمر فلما رآه سعد قال: أعـوذ بالله من شر هذا الـراكب فنـزل، فقـال له: أنزلت في إبلك وغنمك وتـركت النـاس يتنـازعون الملك بينهم؟ فضرب سعد في صدره، فقال: اسكت سمعت رســول الله ـﷺـ يقـول: إن الله ـ عزوجـل ـ يحب العبـد التقي الغني الخفي. م ـ ١٠/٤٢٠.**

**تەرجەمە:**

عامیری کوڕی سەعدی کوڕی ئەبووەقاص ـ رضي الله تعالى عنه ـ =ئەفەرموێ: سەعدی باوکی ـ رضي الله تعالى عنهما ـ = لە ناو وشترەکانیا بوو، عومەری کوڕی هات، کە سەعد چاوی بە عومەر کەوت فەرمووی: پەنا ئەگرم بە خوا لە شەڕی ئەم سوارە! کە دابەزیی بە سەعدی باوکی وت: بۆ لە ناو مەڕو وشترەکانتا دانیشتوویی و خەڵقت بەجێ‌هێشتوە لەسەر موڵك شەڕەکەن؟ سەعد ـ رضي الله تعالى عنه ـ بە سنگیا کێشاو فەرمووی: وز بە لە پێغەمەر ـﷺـ م بیست ئەیفەرموو: خوا ـ عزوجل ـ عەبدی صاحیب تەقواو دڵ غەنی‌و گۆشەگیری خۆی خۆشەوێ.

**١٦١٨/١٣ـ أبو عبد الرحمن الحبلي يقول: سمعت عبد الله بن عمرو بن العاص [رضي الله تعالى عنهما] وسأله رجل فقال: ألسنا من فقراء المهاجرين؟ فقال له عبد الله: ألك امرأة تأوي إليها؟ قال: نعم. قال: ألك مسكن تسكنه؟ قال: نعم. قال: فأنت من الأغنياء. قال: فإن لي**

**خادما، قال: فأنت من الملوك. قال أبو عبد الرحمن: وجاء ثلاثة نفر إلى عبد الله بن عمرو بن العاص وأنا عنده، فقالوا له: يا أبا محمد إنا والله لا نقدر على شيء: لا نفقة، ولا دابة، ولا متاع، فقال لهم: ما شئتم؟ إن شئتم رجعتم إلينا فأعطيناكم ما يسّر الله لكم، وإن شئتم ذكرنا أمركم للسلطان [. . . .] وإن شئتم صبرتم، فإني سمعت رسول الله ـﷺـ يقول: إن فقراء المهاجرين يسبقون الأغنياء يوم القيامة إلى الجنة بأربعين خريفا. قالوا: فإنا نصبر لا نسأل شيئا. م ـ ١٠ /٤٢٧.**

**تەرجەمە:**

ئەبو عەبدورەحمانی (حبلي) ئەفەرموێ: پیاوێ هات داوای شتی لە عەبدوڵڵای کوڕی عەمری کوڕی عاص کرد. عەرزیکرد: بۆ ئێمە لە فوقەرای موهاجیرین نین؟ عەبدوڵڵا ـ رضي الله تعالى عنه ـ لێی پرسی: ژنت هەیە کە بچیەوە لایو خزمەتت بکا؟ عەرزیکرد: بەڵێ. فەرمووی: خانووت هەیە تیا دانیشی؟ عەرزیکرد: بەڵێ. فەرمووی: کە وابێ تۆ دەوڵەمەندی. عەررزیکرد: خزمەتکارێکیشم هەیە. فەرمووی: کە وابێ تۆ پادشای.

ئەبوعەبدورەحمان ئەفەرموێ: سێ کەسی هاتنە خزمەت عەرزیان کرد: ئەی ئەبو محەممەد وەڵڵاهی ئێمە قودرەتمان بەسەر هیچا نیە؛ نە نەفەقەمان هەیە بیخۆین، نە وڵاخمان هەیە، نە مەتاعمان هەیە. . . فەرمووی: چیتان ئەوێ؟ ئەگەر هەوەستان یێنێ بێنەوە لام، خوا چیتان بۆ (میسر) بکا ئەتان ئەمێ، هەوەستان یێنێ حاڵی ئێوە بە قەراڵ ئەڵێم، هەوەستان ئێنێ صەبر بکەن، من لە پێغەمەر ـﷺـ م

بیست ئەیفەرموو: فوقەرای موهاجیرین لە ڕۆژی قیامەتا چل ساڵ لە پێش دەوڵەمەندا ئەچنە بەهەشتەوە. عەرزیان کرد: کە وابێ صەبر ئەکەین و داوای هیچ ناکەین.

**١٤/١٦١٩- جابر بن عبد الله [الأنصاري - رضي الله تعالى عنهما -] يقول: جاءت ملائكة إلى النبي -ﷺ- وهو نائم [ذكر منهم الترمذي في جامعه اثنين: جبريل وميكائيل. وفي حديث ابن مسعود - رضي الله تعالى عنه - وحسنه وصححه ابن خزيمة أنه -ﷺ- توسد فخذه فرقد، وكان إذا نام نفخ. قال: فبينا أنا قاعد إذ أنا برجالٍ عليهم ثياب بيض الله أعلم بما بهم من الجمال، فجلست طائفة منهم عند رأس رسول الله -ﷺ- وطائفة عند رجليه] فقال بعضهم: إنه نائم، وقال بعضهم: إن العين نائمة والقلب يقظان. فقالوا: إن لصاحبكم هذا مثلا، فاضربوا له مثلا، فقال بعضهم: إنه نائم، وقال بعضهم: إن العين نائمة والقلب يقظان. فقالوا: مثله كمثل رجل بنى دارا وجعل فيها مأدُبة [وليمة، إن ضُمَّت الدال] وبعث داعيا فمن أجاب الداعي دخل الدار وأكل من المَأدُبة.**

**[وفي حديث ابن مسعود - رضي الله تعالى عنه - عند أحمد: بنى بنيانا حصينا، ثم جعل مأدُبة فدعا الناس الى طعامه وشرابه، فمن أجابه أكل من طعامه وشرب من شرابه ومن لم يجبه عاقبه]**

**فقالوا: أوِّلوها له يفقهها، فقال بعضهم: إنه نائم، وقال بعضهم: إن العين نائمة والقلب يقظان. فقالوا: فالدار الجنة، والداعي محمد -ﷺ-.**

**[وفي حديث ابن مسعود - رضي الله تعالى عنه -: أما السيد فهو رب**

العالمين، وأما البنيان فهو الإسلام، وأما الطعام فهو الجنة، ومحمد -ﷺ- الداعي. فمن اتبعه كان في الجنة]. فمن أطاع محمدا -ﷺ- فقد أطاع الله، ومن عصى محمدا -ﷺ- فقد عصى الله. ومحمد [ﷺ] فرق بين الناس [المؤمن والكافر].

عن سعيد بن =أبي= هلال عن جابر - رضي الله تعالى عنه :- خرج علينا النبي -ﷺ- [وصله الترمذي بلفظ: خرج علينا النبي -ﷺ- يوما فقال: إني رأيت في المنام كأن جبريل عند رأسي وميكائيل عند رجلي يقول أحدهما لصاحبه: اضرب له مثلا، فقال: اسمع سمعت أذنك! واعقِل عقل قلبك! إنما مثلك ومثل أمتك كمثل ملك اتخذ دارا ثم بنى فيها بناء، ثم جعل فيها مائدة، ثم بعث رسولا يدعو الناس إلى طعامه؛ فمنهم من أجاب الرسول، ومنهم من تركه. فالله هو الملك، والدار الإسلام، والبيت الجنة، وأنت يا محمد رسول، من أجابك دخل الإسلام، ومن دخل الإسلام دخل الجنة، ومن دخل الجنة أكل مما فيها. وهذا الحديث منقطع لأن سعيد بن ميناء لم يدرك جابرا، ومعتضد بحديث ربيعة الجرشي، وبالحديث الثاني] ح - ١٠ / ٢٩١.

تەرجەمە:

سەعیدی کوڕی مینا ئەڵێ: لە جابیرم بیست [ئەمما سەعیدی بنی مینا جابیری نەدیوە، حەدیثەکەی مونقەطیعە ئەبێ تەئویل بکرێ] کە جابیر - رضي الله تعالى عنه - ئەفەرموێ: جەماعەتێ لە مەلائیکە هاتنە خزمەت پێغەمەر -ﷺ- وپێغەمەر -ﷺ- نوستبوو [ترمذي دوانی لێ ذیکر کردوون، لە حەدیثی ئیبن و مەسعوودا - رضي الله تعالى عنه - کە

ترمذیی ئەڵێ: (حسن)ەو ئیبن وخوزەیمە ئەڵێ: صەحیحە ئەفەرموێ: پێغـەمـەر ـﷺـ پاڵی دا بە رانیـەوەو خەوی لێ کـەوت، کە تەشـریفی بنـوسـتـایـە پرخـەی ئەهات. ئیبن ومەسعوود ئەفەرموێ: لە وەختێکا کە دانیشتبـووم تێفکـریم بەعـزێ پیـاو هاتن جلی سپییـان لەبـەرا بوو خوا ئەزانێ کە چەندە جوان بوون، بەعزێکیان لای سەریەوەو بەعزێکیان لای پێیـەوە دانیشتن] بەعـزێکیـان وتیـان: نوستـوە، بەعـزێکیان وتی: چاوی نوستوەو دڵی بەخەبەرە. وتیان: مەثەلێ بۆ ئەم رەفیقەتان بڵێن. بەعزێکیان فەرموویان: نوستوە [یەعنی نایبینێ] بەعزێکیان فەرموویان: چاوی نوستوەو دڵی وریایە [یەعنی تێ ئەگا]. فەرموویان: مەثەلی ئەو وەك مەثەلی پادشایێ وایە خانوویێکی دروست کردبێ‌و، ضیافەتێکی تیا کردبێ‌و پیاوێ بنێرێ خەڵق بانگ کا، هەرکەسێ ئیجابەتی ئەو پیاوەی کرد ئەچێتـە خانـوەکـەیـەوەو لە ضیـافـەتـەکـە ئەخـوا، ئەوی بەدەنگ بانـگ کەرەکـەوە نەچێ ناچێتـە ئەو خانـوەوەو لە ضیـافـەتـەکـە ناخـوا. فەرمـوویـان: تەئـویلی ئەم تەمثیلەی بۆ بکـەن تێی بگـا. بەعـزێکیـان فەرمووی: نوستوە [نایبینێ] بەعزێکیان فەرموویان: چاوی نوستوەو دڵی وریایە [تێ ئەگا] فەرموویان: خانوەکە بەهەشتە، بانگ کەرەکە محەمەدە ـﷺـ.

[لە حەدیثی ئیبن و مەسعوودا ـ رضي الله تعالی عنه ـ کە ئەحمەد ریوایەتی ئەکا ـ فەرموویانە: ئەو گەورەیەی کە بیناکەی دروست کردوە (رب العالمین)ە بیناکە ئیسلامە، طەعامەکە بەهەشتە، محەمەد ـﷺـ بانگ کەرەکەیە، هەرکەسێ تابیعی ببێ لە بەهەشتا ئەبێ.] هەرکەسێ ئیطـاعـەی محـەمـەد ـﷺـ بکـا ئەو کەسـە ئیطـاعـەی خوای کردوە.

هەركەسێ لە محەمەد ـ ﷺـ عاصی ببێ ئەو کەسە بە تەحقیق عیصیانی خوای کردوە. محــەمــەد ـ ﷺـ تەفــریـقـی لە بەیـنـی خەڵـقــا کردوە [موسوڵمان و کافرو صالیح و طالیحی لە یەك جویَکردۆتەوە].

سەعیـدی بنی هیلال لە جابیـرەوە ریـوایـەت ئەکـا پێغەمەر ـ ﷺـ رۆژێ تەشـریفی هاتـەلامـان. ح ـ ٢٩٢/١٠] ترمـذیی فەرمووی: لە خەوما دیم (كأنه) جیبریل لای سەرمەوەو میکائیل لای پێمەوە دانیشتن، یەکێکیــان بەوی تریـانی وت: مەثـەلێکی بۆ بڵێ، فەرمـووی: گوێت لێ بـێ خوا گوێـت بداتێ، تێبگــە خوا عەقڵت بداتێ. مەثــەلی تۆو مەثەلی ئوممەتی تۆ وەك مەثەلی پادشاهێکە خانوویێ دروست بکا، لە ناو ئەو خانوەدا بینایێ دروست بکا، لەو بینایەدا خوانێکی تیا دانێ، لە پاشـا پیـاوێ بنێـرێ خەڵق بانـگ بکـاتـە سەر طەعـامێ، هەر بەعـزێ ئیجابەتی دەعوەتەکەی کرد بە دەنگ پیاوەکەیەوە چوو، بەعزێ نەیکرد. خوا ئەو پادشایەیە، خانوەکە ئیسلامەتییە، بیناکە بەهەشتە، تۆیش ئەی محەمەد فرستادەکەی، هەرکەسێ ئیجابەتی تۆ بکا داخڵی ئیسلامەتی ی ئەبێ، هەرکەسی داخڵی ئیسلامەتی ببێ ئەچێتە بەهەشتەوە، هەرکەسێ بچێتە بەهەشتەوە لەوەی کە لە بەهەشتایە ئەخوا. بەم حەدیثی ئیبن و هیلالە حەدیثەکەی ئیبن و مینا ئەبێ بە (متصل)و (مرفوع).

لە حەدیثی (ابن مسعود)وا دیارە کە چاوی بەو مەلائیکەتانە کەوتووەو گوێی لە قسەیان بوە؛ چونکی خۆی حازری حادیثەکە بوە، پێغەمەر ـ ﷺـ کە وەحیەکە براوەتەوە تەشریفی چۆتە دەرێ خەوەکەی گێراوەتەوە. جابیریش یا حازر بوە یا لە پێغەمەری بیستوە ـ ﷺـ.

١٥/ ١٦٢٠- عن عبد الله [بن مسعود] - رضي الله تعالى عنه - قال: خط النبي -ﷺ- خطا مربعا، وخط خطا في الوسط خارجا منه، وخط خُطَطا [وبكسر ففتح] صغارا إلى هذا الذي في الوسط من جانبه الذي في الوسط وقال: هذا الإنسان، وهذا أجله محيط به، أو قد أحاط به. وهذا الذي هو خارج أمله، وهذه الخطط الصغار الأعراض، فإن أخطأه هذا نهشه هذا، وإن أخطأه هذا نهشه هذا. ح - ٩/٢٢٨. ن في الرقاق. ت، جه، في الزهد.

١٦/ ١٦٢١- عن أنس بن مالك [رضي الله تعالى عنه] قال: خطَّ النبي -ﷺ- خطوطا فقال: هذا الأمل وهذا أجله، فبينما هو كذلك إذ جاءه الخط الأقرب. ح - ٩/٢٢٩. ن.

صورته التي تستبان في تصويره - عليه الصلاة والسلام - هكذا:



تەرجەمە:

عەبدوڵڵای کوڕی مەسعوود - رضي الله تعالى عنه - ئەفەرموێ: پێغەمەر -ﷺ- خەتێکی مورەببەعی کێشا، خەتێکی لە ناوەڕاستا کێشا، لە مورەببەعەکە چوە دەرێ، چەند خەتێکی وردەڵەی لە تەنیشت ئەو خەتـەوە کێشـا لە ناو مورەببەعەکەدا، فەرمووی: ئەمە ئینسانە [بۆ ئەو نوقطـەی لە مورەببـەعـەکـەدایە] ئەوە ئەجـەلیـەتی [بـۆ مورەببـەعـەکە] ئیحـاطـەی بە ئینسـانـا داوە، ئەو خەطەی لە مورەببەعەکە چوەتە دەرێ ئەمـەلی ئینسـانـە. ئەم خەطـە وردانـەی کە لە ناوەوەیـە لە تەنیشت ئەو خەطە خاریجەکەوەیە نەخۆشیی و بەڵاو موصیبەتە کە بەسەر ئینسانا یێ، ئەگەر ئەو بەڵایەی بۆ نەیێ ئەم بەڵایە ئەیگرێ، ئەگەر ئەمیش نەیگرت ئەوی دوای ئەو ئەیگـرێ، یەعنی ئەو عەواریضـانـە نایێڵن ئینسـان بە ئەمەلی بگا، لە پێش ئەمەلەکەیا ئەجەلەکەی بۆ یێ.

ئەنەسی کوڕی مالیك - رضي الله تعالى عنه - ئەفەرموێ: پێغەمەر -ﷺ- چەند خەطێکی کێشا فەرمووی: ئەمە ئەمەلە. ئەمەیش ئەجەلە، لە وەختێکـا بە تەمـای ئەمـەلی بێ ئەو خەطـەی لێی نزیـك بێ کە مورەببـەعـەکـەیـە بۆی یێ ناگـاتـە ئەمـەلەکەی. یەعنی ئینسان ئەمەلی دوورو درێژ نەکا بە دەوام مونتەظیری مردن بێو فکری لێ بکاتەوە.

**١٦٢٢/١٧- عن أبي ذر [رضي الله تعالى عنه] عن النبي -ﷺ- فيما روى عن الله - تبارك وتعالى - أنه قال: يا عبادي إني حرمت الظلم على نفسي، وجعلتـه بينكم محـرمـا؛ فلا تظـالـموا يا عبادي كلكم ضال إلا من هديته فاستهـدوني أهـدكم. يا عبـادي كلكم جائـع إلا من أطعمته فاستطعموني**

أطعمكم. يا عبادي كلكم عار إلا من كسوته فاستكسوني أكسكم.يا عبادي إنكم تخطئـون بالليـل والنهـار وأنا أغفر الذنوب جميعا فاستغفروني أغفر لكـم. ياعبــادي إنـكم لن تبلغــوا ضرِّي فتضــروني ولن تبلغــوا نفعي فتنفعـوني. يا عبـادي لو أن أوّلكم وآخـركم، وإنسكم وجنكم كانـوا على أتقى قلب رجـل واحـد منكم ما زاد ذلـك في ملكي شيئـا. يا عبادي لو أن أولكم وآخركم، وإنسكم وجنكم كانوا على أفجر قلب رجل واحد منكم ما نقص ذلـك من ملكي شيئـا. يا عبـادي لو أن أولكم وآخركم، وإنسكم وجنكم قاموا في صعيد واحد فسألوني فأعطيت كل إنسان مسألته مانقص ذلك مما عندي إلا كما ينقص المخيط إذا أدخل البحر. يا عبادي إنما هي أعمالكم أحصيها لكم، ثم أوفيكم إياها فمن وجد خيرا فليحمد الله، ومن وجد غير ذلك فلا يلومن إلا نفسه.

قال سعيد بن عبد العزيز: كان أبو إدريس الخولاني إذا حدث بهذا الحديث جثا على ركبتيه. م - ١٠/٩٠.

تەرجەمە:

ئەبوذەڕ - رضي الله تعالى عنه - لە پێغەمەر -ﷺ- وە ئەویش لە خواوە - عزوجل - ریوایەت ئەکا کە خوا - تبارك وتعالى - فەرمووی: ئەی عیبادی من زوڵمم لەسەر خۆم حەرام کردوە، لە بەینی ئێوەیشا بە حەرامم گێراوە. زوڵم لە یەکتری مەکەن. ئەی عیبادی من هەموو رێتان لێ ون بوە ئەو کەسە نەبێ کە من هیدایەتم داوە هیدایەتم لێ طەلەب بکەن هیدایەتتان بدەم. ئەی عیبادی من غەیری ئەوەی کە من طەعامم داوەتێ هەمووتان برسین داوای طەعامم لێ بکەن طەعامتان بدەمێ.

ئەی عەبدانی من غەیری ئەوانەی کە من پۆشتەم کردوون هەموو رووتن داوای لیباسم لێ بکەن بتان دەمێ بی‌پۆشن. ئەی عەبدانی من ئێوە بە شەوو بە رۆژ گوناه ئەکەن من لە هەموو گوناه خۆش ئەبم داوای لە گوناەخۆشبوونتان لە من بکەن لێتان خۆش ببم. ئەی عیبادی من ئێوە ناگەنە مەرتەبەیێ زەرەر بە من بگەیێنن، قەت ئاگەنە دەرەجەیێ بتوانن نەفـع بە من بگـەیێنن، ئەی عیبـادی من ئەگـەر ئەوەڵتـان و ئاخـرتـان، ئینسانتان و جیننیتان لەسەر دڵی ئەو پیاوە بن کە لە هەمووتان صالحترو بە تەقواترە ئەوە هیچ شتێك لە موڵکی من زیاد ناکا. ئەی عیبادی من ئەگـــەر ئەوەڵ و ئاخـــرتـان ئینس و جینتـان لەســەر دڵی یەکێ بن کە لە هەمووتان فاسق و فاجیرترە ئەوە لە موڵکی من هیچ شتێ کەم ناکاتەوە. ئەی عیبادی من ئەگەر ئەوەڵ و ئاخرتان ئینس و جینتان لە یەك صەحرادا رابوەستن هەموو داوای شتم لێ بکەن بە کوللی ئینسانێ [بە هەموو جیننێ] ئەوی داوای کردوە بیئەمێ ئەوە لەوەی کە لامە ئیمجا بە قەد دەرزیێ کە بیکـەی بە بەحـرا کەم بکـاتـەوە. [ئـەوە تەقـریبـە لە ذیهنی خەڵقەوە گینا موڵکی خوا نیهایەتی نیە، بە عەطاو کەرەم هیچی لێ کەم نابێتەوە] ئەی عەبدانی من ئێمە هەر عەمەلی خۆتانە کە بۆتان حیساب ئەکـەم و ئەتـان ئەمـەوە کەسێ ئەگـەر لە ئاخیرەتا خێری دەست بکەوێ حەمـدی خوا بکـا، ئەگـەر غەیـری ئەوەی دەست بکـەوێ هەر خەتای خۆی بگرێو لەومی خۆی بکا.

سەعیدی کوڕی عەبدولعەزیز ئەفەرمۆی: ئەبوئیدریسی خەولانی کە ئەم حەدیثەی ریوایەت ئەکرد لەسەر هەردوو ئەژنۆی بەچۆکا ئەهات.

من بلغ ستين سنة فقد أعذر الله إليه في العمر[1] لقوله ـ عزوجل ـ: ﴿أوَلَم نعمِّركم ما يتذكر فيه من تذكر وجاءكم النذير؟﴾[2]

تەرجەمە:

هەرکەسێ عومری گەیی‌یە شەصت ساڵ ئیتر خوا عوذری ئەو کەسە نایێڵێ؛ چونکی خوا ـ عزوجل ـ فەرموویەتی: بۆ من ئەوەندەم عومر بە ئێوە نەداوە کە ئەوی فکر بکاتەوە بەرخۆی لەو عومرەدا فکری تیابکاتەوە لە گوناه لاداو تەقوا بکا بۆ ئەوەی کە ئێوە بترسێنێ وەك پیریی،یا وەك پێغەمەر ـﷺـ؟

ئەبوهورەیرە ریوایەت ئەکا: جەنگەڵستانی مردن لە بەینی شەصت و حەفتادایە. ئیبراهیمی کوڕی فەضل لە راویەکانیا ضەعیفە.

ئەبوهورەیرە ـ رضي الله تعالى عنه ـ ئەفەرموێ (مرفوعا) یەعنی پێغەمەر ـﷺـ فەرمووی: عومری ئوممەتی من لە بەینی شەصت و حەفتادایە، کەمیان هەیە لەوە تێپەڕ بکا. ترمذیی لە (زوهد)ا ریوایەتی کردوە.

١٦٢٣/١٨ـ عن أبي هريرة [رضي الله تعالى عنه] عن النبي ـﷺـ قال: أعذر الله إلى امرىء أخَّر أجله حتى بلَّغه ستين سنة. ح ـ ٢٣٠/٩.

(١) ئەمە حەدیث نیەو سەرەتای (باب)یکە لە بوخاریدا بەو ناونیشانە.
(٢) فاطر/ ٣٧.

تەرجەمە:

پێغەمەر -ﷺ- فەرمووی: خوا عوذری ئەو کەسەی نەهێشتوە کە تا ئەیگەیێنێتە شەصت ساڵ ئەجەلی دوا خستوە.

١٦٢٤/١٩- أبـو هريـرة - رضي الله تعالى عنه - قال: سمعت رسول الله -ﷺ- قال: لايـزال قلب الكبيـر شابـا في اثنتين: في حب الـدنيا، وطول الأمل. ح - ٢٣١/٩ . م في الزكاة، ن في الرقاق.

١٦٢٥/٢٠- عن أنس بن مالك - رضي الله تعالى عنه - قال =قال= رسول الله -ﷺ-: يكبر ابن آدم ويكبر معه اثنتان: حب المال، وطول العمر. وفي م - ٤٣٦/٤ : يهرم ابن آدم ويشب في اثنتان: الحب على المال، والحرص على العمر.

تەرجەمە:

پێغەمەر -ﷺ- فەرمووی: رۆژ بەرۆژ بەنیئادەم پیر ئەبێ لەگەڵ ئەو دوو شت گەورە ئەبـێ: حوبـی ماڵ و، طوولی ئەمــەل. لە موسلیمـــا فەرمـــووی: بەنیئـــادەم هەر پیـــر ئەبێ و دوو شت لەگـەڵ ئەو جەهێـڵ ئەبێتەوە: حوب لەسەر ماڵ و، حیرص لەسەر عومر.

## الزهد

١٦٢٦/٢١- عن أبي هريرة [رضي الله تعالى عنه] قال: ليس الغنى عن كثرة العرض، ولكن الغنى غنى النفس. ح - ٢٤٦/٩ . م - ٤٣٨/٤ .

تەرجەمە:

پێغـەمـەر -ﷺ- فەرمـووی: دەوڵـەمـەنـدیی لە مەتـاعی دنیاوە نیە،

دەوڵەمەندیی دەوڵەمەندیی دڵە.

## تمني الموت [1]

**١٦٢٧/٢٢ـ عن قيس [بن أبي حازم] قال: سمعت خبَّابا [رضي الله تعالى عنه] وقد إكتوىٰ يومئذ سبعا في بطنه، وقال: لولا أن رسول الله ـﷺـ نهانا أن ندعو بالموت لدعوت بالموت. إن أصحاب محمد ـﷺـ مضوا ولم تنقصهم الدنيا بشيء، وإنا أصبنا من الدنيا ما لا نجد له موضعا إلا التراب. ح ـ ٩/٢٣٦**

**١٦٢٨/٢٣ـ وعنه قال: أتيت خبابا وهو يبني حائطا له فقال: إن أصحابنا الذين مضوا لم تنقصهم الدنيا شيئا، وإنا أصبنا من بعدهم شيئا لا نجد له موضعا إلا التراب. ح ـ ٩/٢٣٦.**

**تەرجەمە:**

قەیسی کوڕی حازم ـ رحمه الله ـ ئەفەرموێ: خەبباب لە حەوت جێوە زکی داغ کردبو، لێم بیست ئەیفەرموو: ئەگەر پێغەمەر ـﷺـ نەهی لێ نەکردینایە لە دوعای مردن کردن دوعام ئەکرد بۆ مردن. ئەصحابی محەمەد ـﷺـ رابوردن دنیا هیچی لە ئەجری ئاخیرەت لێ کەم نەکردنەوە، ئێمە ئەوەندەمان لە دنیا پێگەییوە غەیری گڵ، یەعنی بیناکردن، جێیێ نادۆزینەوە کە ماڵی دنیای تێ بخەین. لە ریوایەتەکەی دوەما ئەڵێ: هاتمە لای خەبباب بینای دروست ئەکرد وای فەرموو.

**١٦٢٩/٢٤ـ عن أبي هريرة ـ رضي الله تعالى عنه ـ عن النبي ـﷺـ**

---

(١) مردن بەئاوات خواستن.

قال إن العبد ليتكلم بالكلمة من رضوان الله لا يُلقي لها بالا يرفع الله بها درجات، وإن العبد ليتكلم بالكلمة من سخط الله لا يلقي لها بالا يهوي بها في جهنم ح ـ ٢٦٢/٩. ما يتبين فيها يزل بها في النار أبعد مما بين المشرق ح ـ ٢٦١/٩، م ـ ٤٣٢/١٠ وفيه: والمغرب. ن في الرقاق، ت، في الزهد.

تەرجەمە:

ئەبـوهـورەيـرە ـ رضي الله تعـالى عنـه ـ ئەفەرموێ: پێغەمەر ـﷺـ فەرمووی: عەبد بە کەلیمەیێ تەلەفوظ ئەکاو هیچ موبالاتی پێ ناکا کە خێـرە یا شەڕە، فەقـەط ئەو کەلیمـەیـە ڕەضـای خوای تیـایە. بەوە خوا چەند دەرەجە بەرزی ئەکا. بە کەلیمەیێ لە سەخەطی خوا تەکەللوم ئەکاو چاك و خراپی لێك ناداتەوە بەوە ئەکەوێتە جەهەننەمەوە دوورتر لە بەینی مەشریق و مەغریب. أخری.

یەعنی خراپی یەکێك ئەڵێ لای گەورەیێ، یا بە خراپی ناوی ئەبا، یا ئیستیهزایێ بە کەسێ ئەکا، یا ئیستیخفافی کەسێ ئەکا، تا خەڵق بێنێتە پێکەنین (مثلا).

بۆ ئینسان لازمە کە زمانی خۆی لە قسەی پروپووچ بگرێو دیقەت لەو قسەی لە دەمی یێتەدەرێ بکا، چاك بوو بیڵێ خراپ بوو نەیڵێ.

٢٥/١٦٣٠ـ عن أبي هريـرة [رضي الله تعـالى عنـه] قال قال رسـول الله ـﷺـ: إن الله إذا أحب عبدا دعا جبريل ـ عليه السلام ـ فقال: إني أُحِبُّ فلانا فأَحِبَّه، قال: فيحبُّه جبريل ثم ينادي في السماء فيقول: إن الله يحب فلانـا فأحبـوه فيحبُّـه أهل السماء، قال: ثم يوضع له القبول في الأرض.

وإذا أبغض الله عبدا دعا جبريل فيقول: إني أبغض فلانا فأبغضه، قال: فيبغضه جبريل ثم ينادي في أهل السماء: إن الله يبغض فلانا فأبغضوه قال: فيبغضونه ثم يوضع له البَغْضاء في الأرض. م ـ ١٠/ ٦٧.

تەرجەمە:

پێغەمبەر ـ ﷺ ـ فەرمووی: خوا کە عەبدێکی خۆیی خۆش ویست جیبریل ـ علیه السلام ـ بانگ ئەکا ئەفەرموێ: من فلانم خۆشەوێ تۆیش خۆشت بوێ، فەرمووی: جیبریل ـ علیه السلام ـ خۆشی ئەوێ، لە پاشا جیبریل بانگ ئەدا بە ناو ئەهلی ئاسمانا ئەفەرموێ: خوا فلانی خۆشەوێ ئێوەیش خۆشتان بوێ، ئەهلی ئاسمانیش خۆشیان ئەوێ. فەرمووی: لە پاشا لە ئەرزا قوبووڵ کرانی بۆ دائەنرێ، یەعنی هەموو کەس خۆشیان ئەوێ. کە خوا عەبدێ ببوغزێنێ جیبریل ـ علیه السلام ـ بانگ ئەکا ئەفەرموێ: من فلان ئەبوغزێنم تۆیش بی‌بوغزێنە، جیبریل ـ علیه السلام ـ ئەیبوغزێنێ، لە پاشا جیبریل ـ علیه السلام ـ بە ناو ئەهلی ئاسمانا بانگ ئەکا: کە خوا فلان ئەبوغزێنێ ئێوەیش بی‌بوغزێنن. فەرمووی: ئەیبوغزێنن. لە پاشا لە ئەرزا بوغزی بۆ دائەنرێ.

ئومێدم وایە کە مەلا حسەین ـ سلمه الله ـ لە قیسمی ئەوەڵ بێ، خوا خۆم و هەموو ئەحباب و کەس و کارم لە قیسمی ثانی بەدوور کا. ئامین.

٢٦/ ١٦٣١ـ عن أبي صالح قال: كنا بعرفة فمر عمر [.......] بن عبد العزيز وهو على الموسم فقام الناس ينظرون إليه فقلت لأبي [ ]:

يا أبت إني أرى الله تعالى يحب عمر بن عبد العزيز، قال: وما ذاك؟ قلت: لِمَا لَه من الحب في قلوب الناس. قال: بأبيك أنت سمعت أبا هريرة يحدث عن رسول الله ـﷺـ؟ ثم ذكر بمثل الحديث السابق. م ـ ١٠/٦٩.

**تەرجەمە:**

ئەبوصاڵحی کوڕی...[1] فەرمووی: لە عەرەفاتا بووین عومەری کوڕی عەبدولعەزیز ـ رضي الله تعالى عنه ـ رابورد ئەو ئەمیری حەج بوو، خەڵق راوەستان تەماشایان ئەکرد، بە باوکمم وت: بابە وا ئەبینم کە خـوا عومەری کوڕی عەبدولعەزیزی خۆشەوێ. فەرمووی: بۆچی؟ عەرزم کرد: چونکی لە دڵی خەڵقا مەحەببەتی هەیە. فەرمووی: باوکم بەقوربانت بێ! لە ئەبوهورەیرە ـ رضي الله تعالى عنه ـم بیست؟ [حەدیثەکەی پێشووی ریوایەت کرد].

٢٧/١٦٣٢ـ عن عبد الله قال: جاء رجل الى رسول الله ـﷺـ فقال: يا رسول الله ـﷺـ كيف ترى في رجل أحب قوما ولما يلحق بهم؟ قال رسول الله ـﷺـ: المرء مع من أحبَّ. م ـ ١٠/٧٠.

**تەرجەمە:**

پیاوێ هاتە خزمەت پێغەمەر ـﷺـ عەرزیکرد: (یارسول الله) لات چۆنە پیاوێ قەومێکی خۆش بوێ ئێشتا خۆی لە عیبادەتا نەگەییبێتە ئەوان؟ پێغەمەر ـﷺـ فەرمووی: ئینسان لە قیامەتا لەگەڵ ئەوەیە کە خۆشی ئەوێ.

(١) دانەر بۆشایی بۆ ناوی باوکی صاڵح داناوە، منیش موسلیم گەڕام نەمدۆزییەوە.

[الحمد لله من و مەلا حسەین هەموو موسوڵمانانمان خۆشەوێ، خواو پێغـەمـەر -ﷺ- و ئەصحـابی کیـرام و، تابیعینی بە ئیحسـان و، عولەماو، صولەحاو، مەشایخمان خۆشەوێ].

**٢٨/١٦٣٣- عن أبي ذر [رضي الله تعالى عنه] قال: قيل لرسول الله -ﷺ-: أرأيت الرجل يرى العمل من الخير ويحمده الناس عليه؟ قال: تلك عاجل بشرى المؤمن. م - ١٠/٧٣.**

**تەرجەمە:**

عەرزی پێغەمەر -ﷺ- کرا: پیاو عەمەلێکی خێر ئەکاو لەسەر ئەوە خەڵق حەمدی ئەکا خەبەرم بدەرێ کە ئەوە چۆنە [یەعنی حەمدێکی مەمـدووحـە یا مەذمـوومـە]؟ فەرمـووی: ئەوە موژدەییێکی پێشـەکییـە بۆ موئمین [یـەعنی عەلامـەتی ئەوەیـە کە خەڵق خۆشی ئەوێ، ئەوەیش عەلامەتی ئەوەیە کە خوا خۆشی ئەوێ. بەو شەرتە کە خۆی شتێکی وا نەکا کە طالیبی حەمدی خەڵقی لێ دەربکەوێ].

**٢٩/١٦٣٤- عن أنس - رضي الله تعالى عنه - قال: كنا عند عمر - رضي الله تعـالى عنـه - [وعليه قميص في ظهره أربع رقاع فقرأ ﴿وفاكهة وأبا﴾[1] فقـال: هذه الفـاكهـة قد عرفنـاهـا، فمـا الأبُّ؟ ثم] قال: [مـه] نُهينـا عن التكليف. ح - ١٠/٢٩٨ ومـا في الأقـواس أخـرجـه أبـو نعيم عنـه. وفي أخـرى عنـه: فمـا الأبُّ؟ ثم قال: ياابن أم عمر إن هذا لهو التكلف، وما عليك أن لا تدري ماالأبُّ؟ عبد ابن حميد عن سليمان بن حرب. قسطلاني.]**

(١) عبس/ ٣١.

تەرجەمە:

ئەنەس ـ رضي الله تعالى عنه ـ ئەفەرموێ: لە خزمەت ئیمامی عومەرا بووین ـ رضي الله تعالى عنه ـ ئایەتی ﴿وفاكهة وأبا﴾ی خوێندەوە فەرمووی: ئەوە فاكیهە ئەزانین چیە ئەمما (أبّ) چیە؟ لە دواییدا فەرمووی: وازبێنە نەهیمان لێکراوە لە (تكلف) ئەی کوڕی دایکی عومەر ئەمەی کە تۆ وتت تەکەلوفە، چە زەرەرێکی بۆ تۆ هەیە کە نەزانی (أبّ) بە چی ئەڵێن؟ [أب:جێ لەوەڕی حەیواناتە]

**١٦٣٥/٣٠ـ عن أبي هريرة ـ رضي الله تعالى عنه ـ عن رسول الله ـﷺـ قال:انظروا إلى من هو أسفل منكم، ولا تنظروا إلى من هو فوقكم فهو أجدر أن لا تزدروا نعمة الله. م ـ ١٠/٤١٨. ح ـ ٩/٢٦٧ بمعناه فيه. وفي: م ـ ١٠/١٧ قال: إذا نظر أحدكم إلى من فضل عليه في المال والخلق فلينظر... إلخ.**

تەرجەمە:

پێغەمەر ـﷺـ فەرمووی: تەماشای ئەوە مەکەن کە لە ماڵ و جەمالا لە ئێوە زیاترن، تەماشای ئەوە بکەن کە لە خوار ئێوەوەیە؛ چونکێ تەماشاکردنی لە خۆتان کەمتر لایەقترە بەوە کە نیعمەتی خوا تەحقیر نەکەن.[1]

[چونکی تەماشاکردنی ژوور خۆی ئەکێشێتە سەر ئەوە کە بە بەشی خۆی ناشوکر بێ و، حەسەدبردن بەوەی کە لەو زیاترە].

(١) دانەر ـ خ ـ مانای زیادەکەی موسلیمی نەکرد کە ئاوایە: ئەگەر یەکێك لە ئێوە چاوی بە یەکێك کەوت کە لە داراییو ڕواڵەتدا لەو زیاترە با تە ماشای..

**١٦٣٦/٣١ـ عن أنس ـ رضي الله تعالى عنه ـ قال: إنكم لتعملون أعمالا هي أدق في أعينكم من الشَّعَر، إن كنا نَعُدُّ على عهد النبي ـﷺـ الموبقات. قال أبو عبد الله البخاري: يعني بذلك المهلكات ح ـ ٩/٢٦٩. ﴿وتحسبونه هينا وهو عند الله عظيم﴾[1]**

**تەرجەمە:**

ئەنەس ـ رضي الله تعالى عنه ـ ئەفەرموێ: ئێوە گەلێ عەمەل ئەکەن لە لاتان لە موو باریکترە [یەعنی بە کەمی ئەزانن] ئێمە لە زەمانی پێغەمەرا ـﷺـ بە گوناهی موهلیکمان حسێب ئەکرد. [وەك ئەو ئایەتە کە ئەفەرموێ: ئێوە بە سووکی ئەزانن کەچی لای خوا ـ عزوجل ـ زۆر گەورەیە. یەعنی گوناه ـ بوچووك و گەورەی ـ لازمە ئینسان خۆیی لێ بپارێزێ]

[ئەبو ئەییووبی ئەنصاریی ـ رضي الله تعالى عنه ـ ئەفەرموێ: ئینسان حەسەنات ئەکاو ئومێدی پێی هەیەو گوناهی وردەی لە فکر ئەچێتەوە کە ئەچێتە حوضووری خوا ـ عزوجل ـ ئەو گوناهانە دەورەی ئەگرن، ئینسان گوناه ئەکاو بە دەوام لێی ئەترسێ، کە ئەچێتە حوزووری خوا بە ئەمینی ئەچێ، یەعنی بە واسیطەی ترسی لە خوا، کە ترسیش بە عیبادەت حسێبە، گوناهەکەی مەحو ئەبێتەوە. أخرجه أسد بن موسى في الزهد. قسطلاني].

(١) النور/ ١٥.

## إخـــــلاص

١٦٣٧/٣٢- عن أبي هريـرة [رضي الله تعـالى عنه] قال: قال رسول الله -ﷺ-: قال الله - تبارك وتعالى -: أنا أغنى الشركاء عن الشرك، من عمل عمـلا أشـرك فيـه معي غيـري تركتـه وشـركـه. م- ١٠/ ٤٣١ وشـريكه، نسخة، وشركته نسخة.

تەرجەمە:

پێغـــەمـــەر -ﷺ- فەرمـووی: خوا - تبـارك وتعـالى - ئەفـەرمـوێ: هەرکـــەســێ ئیشێ بکـــاو لەو ئیشـــەدا غەیـــری من بکـــا بە شەریکم ئیشەکەیی‌و شەریکەکەی تەرك ئەکەم. یەعنی ئەو ئیشە قەبووڵ ناکەم ئەیهێڵمەوە بۆ شەریکەکەی، ئەو موکافاتی بداتەوە. عیبادەتێ ریای تیا بێ بەتاڵە خوا. قەبووڵی ناکا، ئەفەرموێ: من لە هەموو شەریکێ لە شەریکیی غەنی‌ترم.

١٦٣٨/٣٣- عن سلمة بن كهيل قال: سمعت جندبا [رضي الله تعالى عنه] يقول: قال النبي -ﷺ- ولم أسمع أحدا يقول قال النبي -ﷺ- غيره - فدنوت منه فسمعته يقول: قال النبي -ﷺ-: من سمَّع سمَّع الله به، ومن يرائي يرائي الله به. ح - ٩/ ٢٧٣. م - ١٠/ ٤٣١. جه في الزهد.

تەرجەمە:

سەلەمەی کوڕی کوهەیل ئەفەرموێ: گوێم لە جوندوب بوو - رضي الله تعالى عنه - ئەیفەرموو: پێغەمەر -ﷺ- فەرمووی: لە هیچ کەسێکم نەبیستبـوو غەیـری ئەو کە بڵێ لە پێغـەمـەرم بیست -ﷺ-. لێی نزیـك بوومەوە لێم بیست ئەیفەرموو: هەرکەسێ ئیظهاری عەمەلی خۆی بکا بۆ خەڵق بە ریا لە رۆژی قیامەتا لە ناو خەڵقا (مفتضح)ی ئەکاو نیبەتە

فاسیدەکەی بۆ خەڵق دەرەخا، یا کەسێ ئیشی چاکەی خۆی لە دنیادا بخاتە گوێی خەڵقەوە ئەوابی ئەو ئەوەیە کە خوا ئەو ئیشەی ئەخاتە گوێی خەڵقــەوە، لە ئاخیــرەتــا لە ئەوابی مەحــرورومــە. کەسێ ئیشی خۆی پێنیشـــانی خەڵق بدا، بە ریـیـا بیکـا، خوا لە ئاخیـرەتـا لە پێش چاوی خەڵق ئابرووی ئەبا بەوە کە ئەم ئیشەی بە ریـیا کردوە.

(سمعە) ئەوەیە لە لای ئەوانەی کە ئاگایان لە عیبادەتی نەبووبێ بەحث لە عیبادەتەکەی بکا. ریـیا ئەوەیە =لە= پێش چاوی خەڵق بیکا پێی بڵێن: پیاوێکی بە عیبادەت و تەقوایە. خولاصە نابێ بە عیبادەت غەیری ئیطاعەی خوا هیچ نییەتی تری ببێ، گینا ئەبێ بە گوناه

## إيذاء الولي[1] ـ أعاذنا الله تعالى منه ـ

٣٤/ ١٦٣٩ـ عن أبي هريـرة [رضي الله تعـالى عنه] قال: قال رسول الله ـ ﷺ ـ: إن الله تعالى قال: من عادى لي وليا فقد آذنته بالحرب، وما تقرَّب إليَّ عبـدي أحبَّ إليّ ممـا افتـرضت عليـه، ومـا يزال عبـدي يتقـرَّب إليّ بالنوافل حتى أحبَّه، فإذا أحببته كنت سمعه الذي يسمع به، وبصره الذي يبصـــر به، ويـــده التي يبطُش بهـــا، ورجله التي يمشي بهـا، وإن سألني لأعطينـه، ولئن استعـاذني لأعيـذنه، وما ترددت عن شيء أنا فاعله تردُّدِي عن نفس المؤمن يكره الموت وأنا أكره مساءته. ح ـ ٩/ ٢٧٥ [وعن عائشة ـ رضي الله تعـالى عنهـا ـ: وفؤاده الذي يعقل به، ولسانه الذي يتكلم به. أحمد، بيهقي. قسطلاني].

(١) ئازاردانی پیاوچاکان.

**تەرجەمە:**

بوخـاريى ـ رحمـه الله ـ ئەفـەرمـوێ: محـەمـەدى كوڕى عوثمانى كوڕى كەرامــە لە خاليــدى كوڕى مەخلەدەوە ئەويش لە سولــەيمـانى كوڕى بيلالەوە، ئەويش لە شورەيكى كوڕى ئەبونەميرەوە، ئەويش لە عەطا [ى كوڕى يەسار]ەوە، ئەويش لە ئەبوهورەيرەوە ـ رضي الله تعالى عنــه ـ بۆى ريــوايـەت كردم كە پێغـەمـەر ـﷺـ فەرمـووى: كە خوا ـ عزوجل ـ فەرمووى: هەركەسێ دوشمنيى لەگەڵ وەليێكى من بكا بە موحـەققـەقى من ئيعـلانى حەربى لەگـەڵ ئەكەم، عەبدى من بە هيچ شتێ لەوەى كە لە سەرم فەرزكردوە لەلام خۆشەويستر بێ (تقرب)ى نەكــردوە بە من [يـەعنى بە فەرز لە هەمـوو شتێ زيـاتـر بە من نزيـك ئەبێتەوە] عەبدى من بە دەوام بە عيبادەتى سونەت لێم نزيك ئەبێتەوە تا واى لێ بێ كە خۆشم ئەوێ، كە خۆشم ويست من بۆى ئەبم بەو گوێيەى كە شتى پێ ئەبيێ، ئەبم بەو چاوەى كە شتى پێ ئەبينێ، ئەبم بەو دەستەى كە شتى پێ ئەكاو ئەگرێ، ئەبم بەو پێيەى كە پێى ئەڕوا [ئەبم بەو دڵەى كە پێى لە شت ئەگا، ئەبم بەو زمانەى كە قسەى پێ ئەكـا. عن عائشـــة ـ رضي الله تعــالى عنهـا ـ] داواى شتم لێ بكـا ئەيدەمێ، پەنام پێبگرێ پەناى ئەدەم، لەو شتەى كە ئەيكەم لە هيچ شتێكيانا ئەو تەرەددودەم نيە كە لە قەبضى رۆحى موئمينا هەمە، ئەو لە بەر ئەذيەت مردنى پێ ناخۆشە منيش پێم ناخۆشە كە مەحزوونى بكەم. [يەعنى ئەيشبێ كە قەبضى رۆحى بكەم].

وەليى ئەوەيە: مولازيمى عيبادەت بێ، گوناه نەخاتە بەينيەوە، بە دەوام قيام بكا بە حوقووقى خوا لە تاڵيى و خۆشيدا. شەرتى وەليى وايە

کە مەحفــووظ بێ، وە پێغــەمـەران ـ علیهم الصـلاة والسـلام ـ ئەبێ مەعصووم بن. هەرکەسێ شەرع ئیعتیراز لە حەرەکەو سەکەنەی بکا ئەو کەسە مەغرووره شەیتان تەفرەی داوە.

قوشــەیـریی ـ قدس سره ـ ئەفـەرمـوێ: وەلیی ئەبێ بە دەوام خوا حیفظی لە زەللە بکا، شایەد زەللەییێکی لێ صادر ببێ دەرحاڵ خوا ـ عزوجـل ـ ئیلهـامی تەوبـەی ئەکـاتێ، نابێ تەمـادیی لە گونـاهـا بکا، گوناهێکی تەوبەی لە دواوە بێ خەلەل بە ویلایەتی ناگەیێنێ.

ریـوایـەتی ئەحمـەد وایـە: هەرکـەسێ ئەذیـەتی وەلییێکی من بکا. موراد لە فەرز عامــە لە فەرزی عەیــن و فەرزی کیـفــایــە. موراد لە نزیکبــوون گەورەیی دەرەجــەیــە نەك نزیکبــوونـەوە لە مەکـانـا، خوا مونــەززەهــە لە زەمــان و مەکـان. موراد لە (حُبّ) لازمی (حُبّ)ە کە ئیکرام و موکافاتە. موراد لەوەی کە فەرموویە: ئەبم بە چاوو، گوێو، دەست و، پێو، دڵ و، زمانی.. ئەوەیە ئەو ئیشانەی کە بەو ئەعضایانە ئەیکـا بە ئەمـرو ئیلهـامی منـەو، بە هیـدایـەتی منە کە نایێڵم سلوکی رێگەی خراپ بکاو بەو ئەعضایانە خراپی بکاو، لە غەیری مەوضوعی (لە)یانا لە عەمەلی بێنێ. خوا ـ عزوجل ـ مونەززەهە لە هەموو ئەمارەی حودووث.

موراد لە تەرەدودی خوا لە قەبـضـی رۆحـکـێـشــانـی موئمینــا.. تەرەدودی مەلائیکــەی قەبضی ئەرواحـە، وە مووسـا ـ علیـه السـلام ـ زللەییێکی دا لە عیزرائیل ـ علیه السلام ـ عیزرائیل ـ علیه السلام ـ

لەبەینی خوا ـ عزوجل ـ داو لە بەینی مووسا[1] ـ علیه السلام ـ هات و چوو تا مووسا موخەییەر کراو ئیختیاری لیقای خوای کرد ـ عزوجل ـ.

موراد لە کەراهـــەت و دڵ ناخـۆشکـردنی خوا هی موئمین تەمثیلەو تەقریبە وەك لە بەینی عیبادایە.

ئەم حەدیثـــە لە سەنـــەدەکـــەیـا خالیـدی کوڕی موخلەد هەیـە کە شیعـــەییێکی غەلیظـــە، ئەبـوداوود ئەفـەرمـوێ: ڕاستگـۆیـە. ئەحمـەد ئەفـەرمـوێ: گەلێ حەدیثی مونکـەری هەیـە. ئەبـوحـاتەم ئەفەرموێ: حەدیثی نەنووسرێو ئیستیدلالی پێ ناکرێ. ئیبن وسەعد ئەڵێ: (منكر الحديث)ە ئیبن وعەدیش وا ئەڵێو دە حەدیثی مونکەری هەڵژماردوە. ئەم حەدیثـەیشی لەوانـە عەدکـردوە، ئەڵێ: هەر بە تەنهـا ئەو ڕیوایەتی کردوە. ئەم حەدیثەیش حەدیثێکی زۆر غەریبە. ئەگەر لە بەر هەیبەتی صەحیحی بوخاریی نەبوایە خەڵق ئەم حەدیثەیشیان لە مونکەراتی خالید حسێب ئەکـرد. بە تەنهـا شورەیکی مامـۆستـای ـ مامـۆستـای ڕیوایەتی کردوە. شورەیکیش حافیظ نیە. غەیری بوخاریی ئەم مەتن و سەنەدەی ڕیـوایـەت نەکـردوە، لە موسنـەدی ئەحمـەدیشـا نیـە. ئیبن وحـەجەری عەسقەلانی فەرموویەتی: با وایش بێ کە وتوویانە بە گەلێ طەریقی تر ڕیوایەت کراوە، فەقەط ئەو طەریقانە یا ضەعیفن یا مونقەطیعن. ئەمما ئەو طەریقانە ئەگەیێنێ کە حەدیثەکە ئەصڵێکی هەیە.

١٧/٣/٩٤١. دووشەممە.

---

(١) بەم جۆرە نارێکەو دەبێ بگوترێ: لە بەینی خوا ـ ع ـ و مووسا ـ ع ـ داهات وچوو.

## رؤيـــــا[1]

٣٥/ ١٦٤٠- عن أنس بن مالــك [رضي الله تعـالى عنـه] أن رسـول الله -ﷺ- قال: الـرؤيـا الحسنـة من الرجل الصالح جزء من ستة وأربعين جزء من النبوة. ح - ١٠/ ١١٨. م - ٩/ ١١٨. ن، جه.

٣٦/ ١٦٤١- عن ابن عمـر [رضي الله تعـالى عنهمـا] قال قال رسول الله -ﷺ-: الرؤيا الصالحة جزء من سبعين جزء من النبوة. م - ٩/ ١١٩

٣٧/ ١٦٤٢- عن أيـوب السختيـاني، عن محمـد بن سيـرين، عن أبي هريـرة [رضي الله تعـالى عنـه] عن النبي -ﷺ- قال: إذا اقتـرب الزمان لم تكد رؤيا المسلم تكذب، وأصدقكم رؤيا أصدقكم حديثا، ورؤيا المسلم جزء من خمســة وأربعين جزء من النبـوة. والـرؤيـا ثلاثـة: فرؤيا الصالحة بشرى من الله، ورؤيا تحزين [تخويف. بخاري] من الشيطان، ورؤيا مما يحدث المرء نفسه؛ فإن رأى أحدكم ما يكره فليقم فليصل ولا يحدث به الناس، قال: وأحب القيد وأكره الغل. والقيد ثبات في الدين [فلا أدري هو في الحديث أم قاله ابن سيرين؟] ح - ١٠/ ١٣٩. م - ٩/ ١١٦. وفي أخـرى عنـه في هذا الحـديث: رؤيـا المؤمن جزء من ستـة وأربعين. م - ٩/ ١١٧. وفي أخـرى عنـه: وأدرج في الحـديث قوله: وأكره الغل... الخ وليس فيه جزء من ستة وأربعين. م - ٩/ ١١٧. ح - ١٠/ ١٣٩.

٣٨/ ١٦٤٣- عن عبـادة بن الصـامت وفي أكثـر الروايات عن أبي هريرة [رضي الله تعـالى عنهمـا] عن رسـول الله -ﷺ- قال: رؤيـا الرجل الصالح [رؤيــا الـمؤمـن. أخــرى] جزء من ستـــة وأربعين جزء من النبـــوة. م - ٩/ ١١٨. ت، ن. ح - ١٠/ ١٢١ عن عبادة - رضي الله تعالى عنه -.

---

(١) باسى خەوبينين.

**٣٩/١٦٤٤ـ عن أبي سعيد الخدري [رضي الله تعالى عنه] أنه سمع رسول الله ـﷺـ يقول: الرؤيا الصالحة جزء من ستة وأربعين جزء من النبوة. ح ـ ١٠/١٢٢.**

**تەرجەمە:**

ئەبوهورەیرە ـ رضي الله تعالى عنه ـ ئەفەرموێ: پێغەمەر ـﷺـ فەرمووی: کە زەمانە لێك نزیك بوونەوە [یەعنی شەوو رۆژ لەبەرابەر بوون نزیك بوونەوە، یا کە قیامەت نزیك بوو] نزیك نیە [یەعنی دوورە] کە خەوی موسوڵمان بە درۆ دەربچێ [یەعنی ئەکثەری راست ئەبێ، فاسق و فاجیر فەرقیان نیە، هەر موسوڵمانەتی شەرتە] کامتان قسە راستە ئەو کەسە خەوی لە خەوی ئەوانی تر راستترە، رۆئیای موسوڵمان جوزئێکە لە چل و پێنج جوزئی نوبووەت. لە باقی ریوایەتەکانی تریاو عوبادەی کوڕی صامیت و ئەبوسەعیدی خدریی و ئەنەسی کوڕی مالیك: جوزئێکە لە چل و شەش جوزئی نوبووەت. لە ریوایەتی ئیبن وعومەرا جوزئێکە لە حەفتا جوزئی نوبووەت.

[لە ریوایەتێکی ئەنەسا: جوزئێکە لە بیست و شەش جوزئی نوبووەت. لە ریوایەتی ئیبن وعەباسا ـ رضي الله تعالى عنهما ـ جوزئێکە لە پەنجا جوزئی نوبووەت، لە ریوایەتێکیا: جوزئێکە لە چل جوزئی نوبووەت. مەشهوورترینی ئەم ریوایەتانە ئەوەیە کە چل وشەش یەکی نوبووەت بێ. تەوجیهی ئەم ریوایەتە وا کراوە پێغەمەر ـﷺـ شەش مانگ لە پێش پێغەمەرێتیا بە خەو گەلێ شتی وەحی کراوە. بیست وسێ ساڵ پێغەمەر بوە، شەش مانگی پێش پێغەمەرێتی

چل و شەش یەکی بیست و سێ ساڵە. ریوایەتەکانی تریش حەمل کراوەتە سەر ئیختیلافی ئەحوالٚ و زەمان و دەرەجەی صەلاحی موسوڵمان و شتی‌تر... فەقەط مادام کە پێغەمەر -ﷺ- ئەمانەی فەرموە ئەویش - علیه الصلاة والسلام - ﴿وما ینطق عن الهوی﴾[1] ئەبێ پێی بروا بکرێ، حیکمەتی هەر خواو رەسوولی خوا ئەیزانێ. ئەگەر ئەم تۆجیهانە بۆ موعانید بکرێ موعانید بە چاوی خۆیان موعجیزەیان دیوەو وتوویانە سیحرە!]

رؤیا سێ نەوعە:

١ - روئیای صالیحە موژدەیە لە طەرەف خواوە بە موسوڵمان دراوە.

٢ - خەوێکە بە ئیرادەی خوا لە طەرەف شەیطانەوە بۆ مەحزوونکردنی موسوڵمانە.

٣ - خەوێکیش ئینسان زۆر فکر لە شت ئەکاتەوە بەو خەیاڵەوە ئەنوێ شەو بێتە خەوی. کە یەکێ لە ئێوە شتێکی ناخۆشی لە خەوا بینی هەڵسێ نوێژ بکاو لای هیچ کەس [نە دۆست نە دوشمن] نەیگێڕێتەوە. من حەز لە پێوەند [و کەلەپچە] ئەکەم حەز لە تەوق ناکەم، کە پێوەندە [ودەست] ئەباتە لە دینا.

ئەییووبی سەختیانی ئەفەرموێ: نازانم ئەم تەعبیری پێوەندە بە ئەبات لە حەدیثەکەیە یا تەعبیری (ابن سیرین)ە دەرجی حەدیثەکەی کردوە[2] یان نا؟ یونس ئەفەرموێ: ظەنم وایە کە پێوەند لە پێغەمەرەوە -ﷺ- ریوایەت کراوە. بوخاریی ئەفەرموێ: تەوق هەر لە ملا ئەبێ.

(١) النجم/ ٣. واتە: پێغەمەر -د- لە خۆیەوە قسە ناکا.
(٢) ئەم (یان نا) نەبێ باشترە.

قەسطەلانی ١٠ـ١٤٠ لە یاسینا.

**٤٠/١٦٤٥ـ عن أبي سعيد الخدري [رضي الله تعالى عنه] أنه سمع النبي ـ ﷺ ـ يقول: إذا رأى أحدكم رؤيا يُحبُّها فإنما هي من الله، فليحمد الله عليها، وليحدث بها،وإذا رأى غير ذلك مما يكره فإنما هي من الشيطان فليستعذ من شرِّها ولا يذكرها لأحد، فإنها لا تضره. ح ـ ١٢٠/١٠. ت، ن.**

**تەرجەمە:**

پێغەمەر ـ ﷺ ـ ئەفەرموێ: کە یەکێ لە ئێوە خەوێکی خۆشی دی ئەو خەوە لە طەرەف خواوەیە حەمدی خوا بکاو بیگێرێتەوە بۆ خەڵق [موسلیم ئەفەرموێ: هەر بۆ ئەحباب و خۆشەویستی بگێرێتەوە. لە ترمذیشا وایە. لە ریوایەتێکی تریا هەر بۆ عاقڵ یا بۆ دۆستی بگێرێتەوە، لە ریوایەتێکی تریا هەر بۆ عالیم و ناصیح و موشفیق خەو بگێرێتەوە.] ئەگەر غەیری ئەوە شتی ناخۆشی دی ئەوە هەر لە شەیتانەوەیە ئیستیعاذە بە خوا لە شەڕی بکاو بۆ هیچ کەسی نەگێرێتەوە، ئەو خەوە زەرەری بۆی نابێ.

**٤١/١٦٤٦ـ عن أبي هريرة [رضي الله تعالى عنه] يقول: سمعت رسول الله ـ ﷺ ـ يقول: لم يبق من النبوة إلا المبشرات. قالوا: وما المبشرات؟ قال: الرؤيا الصالحة. ح ـ ١٢٢/١٠.**

**تەرجەمە:**

پێغەمەر ـ ﷺ ـ ئەفەرموێ: لە نوبووەت هەر موژدەهێنەر ماوەتەوە. عەرزیان کرد موژدەهێنەر چیە؟ فەرمووی: خەوی باش و صاڵحە.

## رؤيـــة النبـــي -ﷺ-

٤٢/١٦٤٧- عن أبي هريـرة [رضي الله تعـالى عنه] قال: قال رسول الله -ﷺ-: من رآني في المنام فقد رآني، فإن الشيطان لا يتمثل بي م - ١٢١/٩.

تەرجەمە:

پێغەمەر -ﷺ- ئەفەرموێ: هەرکەسێ لە خەوا من ببینێ ئەو کەسە بە تەحقیق منی دیوە؛ چونکی شەیتان نایێتە شکڵی منەوە.

٤٣/١٦٤٨- وقـال: سمعت رســول الله -ﷺ- يقــول: من رآني في المنام فسيراني في اليقظة، أو لكأنما رآني في اليقظة، لا يتمثل الشيطان بي. وقال [ابن شهاب]: فقال أبو سلمة [بن عبد الرحمن بن عوف - رضي الله تعالى عنه -]: قال أبو قتادة [رضي الله تعالى عنه] قال رسول الله -ﷺ-: من رآني فقد رأى الحق. م - ١٢٣/٩.

تەرجەمە:

پێغەمەر -ﷺ- فەرمووی: هەرکەسێ لە خەوا من ببینێ لەمەولا لە بێدارییا [لە قیامەتا] ئەمبینێ. یا فەرمووی: وەك لە بێداریدا منی بینیبێ وایە؛ چونکی شەیتان نایێتە شکڵی منەوە. ئەبوقەتادە - رضي الله تعالى عنه - ئەفەرموێ: پێغەمەر -ﷺ- فەرمووی: کەسێ لە خەوا من ببینێ بە تەحقیق شتێکی حەقی دیوە.

ریوایەتی جابیرو ئەنەس و ئەبوسەعیدیش - رضي الله تعالى عنهم - وایە فەقەط لە ریوایەتی =جابیرا= ئەفەرموێ: لایەق نیە بە شەیتان کە خۆی بە من بشوبهێنێ. لە ریوایەتی ئەنەسا ئەفەرموێ: شەیتان نایێتە

شکڵی منەوە. لە ریوایەتی ئەبوسەعیدا ئەفەرموێ: ئەو کەسە شتێکی حەقی دیوە؛ چونکی شەیتان نابێ بە من.

٤٤/١٦٤٩ـ أبو سلمة عن أبي قتادة [رضي الله تعالى عنه] يقول: سمعت رسول الله ـﷺـ يقول: الرؤيا من الله والحلم من الشيطان؛ فإذا رأى أحدكم شيئا يكرهه فلينفث عن يساره ثلاث مرات، وليتعوذ من شرِّها [وليتحول من جانبه الذي كان عليه. أخرى. م] فإنها لن تضره [وإن الشيطان لا يتزايا بي ح ـ ١٠/١٢٩.] فقال [أبو سلمة]: إن كنت لأرى الرؤيا أثقل عليَّ من جبل، فما هو إلا أن سمعت بهذا الحديث فما أباليها. م ـ ٩/١١٥. ح ـ ٧/٣٧٧. ح ـ ١٠/١٢٩. د، ن، ج.

تەرجەمە:

پێغەمەر ـﷺـ ئەفەرموێ: روئیا لە خواوەیە، خەوی پاشەوپێشە لە شەیتانەوەیە، یەکێ لە ئێوە خەوێکی ناخۆشی بینی سێ جار تف کا بە لای چەپیا ئیستیعاذە لە شەڕی ئەو خەوە بکاو وەرگەڕێتە سەر لایەکەی تری ئەو خەوە زەرەری نابێ بۆی، شەیتانیش لە صوورەتی منا نابینرێ.

ئەبو سەلەمە ئەفەرموێ: خەوم ئەبینی لە سەرم لە کێو گرانتر بوو، هەر ئەوەندە بوو تا ئەم حەدیثەم بیست ئیتر هیچ موبالاتی پێ ناکەم. لە ریوایەتێکی تری ئەبوقەتادەدا ئەفەرموێ: خەوی ناخۆش بۆ کەس نەگێڕێتەوە، خەوی خۆش موژدە بدا ئەمما هەر بە دۆست.

قال أبو عبد الله [البخاري ـ رحمه الله ـ]: قال ابن سيرين [محمد: لا تعتبر رؤيته ـﷺـ إلا] إذا رآه في صورته [التي جاء وصفه بها في حياته ـﷺـ]. ح ـ ٩/١٢٨.

**تەرجەمە:**

چاوبەپێغەمەرکەوتن -ﷺ- وەختێ موعتەبەر ئەبێ کە ئەوی ئەیبینێ کە لە حەیاتیا چە شەکڵ و شەمائیلێکی بێ لەسەر ئەو شەکڵ و شەمائیلە ببینێ [یەعنی ئەو وەختە بە حەقیقەت پێغەمەری دیوە -ﷺ- (وإلا) خەوەکەت موحتاجە بە تەئویل حەقیقەت نیە، فەقەط صەحیح وایە بە هەر نەوعێکی ببینێ بە بینین حسێبە، لە سەر شەکڵ و شەمائیلی خۆی ببینرێ بە حەقیقەت ذاتی موبارەکی بینراوە، لەسەر غەیری شەکڵ و شەمائیلی خۆی چاوپێکەوتنی بینینێ میثالیەتی؛ چونکی پێغەمەران - علیهم الصلاة والسلام - ذاتی موبارەکیان ئەرز نایرزێنێ. ئیدراکی ذاتی پێغەمەر -ﷺ- حەقیقەتە، ئیدراکی صیفاتی ئیدراکی میثالیەتی. قسطلاني ١٢٨/١٠.

(ابن الباقلاني) ئەفەرموێ: مەعنای ئەو لەفظەی کە ئەفەرموێ: ئەوی ئەمبینێ بە تەحقیق منی دیوە یا حەقی دیوە وایە: چاوپێکەوتنی لە خەوا حەقەو صەحیحە (أضغاث أحلام)[1] نیە، لە تەشبیهاتی شەیتان نیە. هەم ئەفەرموێ: بەعزێ وەخت لەسەر خیلافی صیفەتی مەعلوومی ئەبینرێ. مەثەلا بە ریش سپێتی ببینرێ، یا لە زەمانێکا یەکێ لە مەشریق یەکێ لە مەغریب ببینێ، صەواب وایە بە هەر نەوعێ ببینرێ هەر ذاتی موبارەکیەتی غەیری ئەو نیە، لە سەر خیلافی شەمائیلی خۆی ببینرێ ئەو خەوە خەوی تەئویلە موحتاجە بە تەعبیر. (راجع نووي) ١٢٢/٩.

---

(١) خەوی پڕوپووچ وپەیدابوو لە ئەنجامی بیرکردنەوەوە.

٤٥/١٦٥٠ـ عن جابر [رضي الله تعالى عنه] عن رسول الله -ﷺ- أنه قال لأعرابيّ جاءه فقال: إني حلَمتُ أن رأسي قطع فأنا أتبعه فزجره النبي -ﷺ- وقال: لا تخبر بتلعب الشيطان بك في المنام. م - ١٢٤/٩.

٤٦/١٦٥١ـ وعنه قال: جاء أعرابي إلى النبي -ﷺ- فقال: يارسول الله رأيت في المنام كأن رأسي ضرب فتدحرج فاشتددت على إثره. فقال رسول الله -ﷺ-: لا تحدث الناس بتلعب الشيطان بك في منامك. وقال سمعت النبي -ﷺ- بعد يخطب فقال: لا يحدثن أحدكم بتلعب الشيطان به في منامه. م ـ ١٢٤/٩.

تەرجەمە:

جابیر ـ رضي الله تعالى عنه ـ ئەفەرموێ: ئەعرابییێ هاتە خدمەت پێغەمەر -ﷺ- عەرزیکرد: (یارسول الله) لە خەوما دیم وەك سەرم برابێ گلۆر بۆوە. بە شوێنیا هەڕام کرد، پێغەمەر -ﷺ- [مەنعی کرد] پێی فەرموو: خەبەر بە خەڵق مەدە کە شەیتان گاڵتەی پێ کردووی. فەرمووی: لە دوای ئەو حادیثەیە لە پێغەمەر -ﷺ- م بیست خوطبەی ئەخوێن فەرمووی: هیچ کەسێ لە ئێوە خەبەر نەدا بەوە کە لە خەویدا شەیتان گاڵتەی پێ بکا. لە ریوایەتێکا ئەفەرموێ: پێغەمەر -ﷺ- پێکەنی و فەرمووی: کە شەیتان گاڵتەی بە یەکێکتان کرد لە خەویا خەبەر بە خەڵق نەدا.

## رؤيـــا النبي -ﷺ-

٤٧/١٦٥٢ـ عن أنس بن مالك ـ رضي الله تعالى عنه ـ قال: قال رسول الله -ﷺ-: رأيت ذات ليلة فيما يرى النائم كانا في دار عقبة بن رافع فأتينا

لەسـەری نووسیـوە بیکـاو ئەم پێنج فەرزە بکـاو نەبێ بە کەفـارەتی ئەو گوناهانەی کە لە بەینی ئەو فەرزانەدا کردوویەتی.

**٢٧/١٦٨٥ ـ وعنـه أن عثمـان بن عفـان ـ رضي الله تعـالى عنـه ـ دعـا بوَضوء فتوضأ فغسل كفيه ثلاث مرات ثم تمضمض واستنثر [واستنشق أخرى. وفي رواية أبي داود وابن المنذر: فتمضمض ثلاثا واستنثر ثلاثا] ثم غسل وجهه ثلاث مرات [ويديه إلى المرفقين ثلاث مرار. أخرى] ثم غسل يده اليمنى إلى المرفق ثلاث مرات، ثم غسل يده اليسرى مثل ذلـك، ثم مسح رأسه [ثـلاثـا، أبـو داود] ثم غسـل رجله اليمنى إلى الكعبين ثلاث مرات، ثم غسـل اليسـرى مثـل ذلـك، ثم قال: رأيت رسول الله توضأ نحو وضوئي هذا. ثم قال رسول الله ـ ﷺ ـ: من توضأ نحو وضوئي هذا ثم قام فركع ركعتين لا يحدث فيهما نفسه غفر له ما تقدم من ذنبـه. ح ـ ١/٢٤٠. م ـ ٢/٢٣٨. م ـ ٢/٢٤٢ وفيـه: وكـانت صلاته ومشيه إلى المسجد نافلة. وفي أخرى: قال: ألا أحدثكم حديثا لولا آية ما حدثتكموه؟ إلخ. قال عروة: الآية: ﴿إن الذين يكتمون ما أنزلنا﴾[1] ح ـ ١/٢٤٠. م ـ ٢/٢٤٠.**

**تەرجەمە:**

حەمران ـ رحمه الله ـ ئەفەرموێ: عوثمان ـ رضي الله تعالى عنه ـ ئاوی دەزنوێژی ویست، دەزنوێژی شت، هەردوو دەستی یەکی سێ جار شت، لە پاشا سێ جار ئاوی لە دەمی وەردا، سێ جار ئاوی لە لووتی وەردا، لە پاشا سێ دەفعە دەم و چاوی شت، لە پاشا سێ جار

(١) البقرة/ ١٥٩.

دەستی راستی تا ئانیشکی، لە پاشا دەستی چەپیشی ئەوەندە شت، لە پاشا سێ جار سەری مەسح کرد، لە پاشا سێ جار پێی راستی تا قولەپێی شت، لە پاشا پێی چەپیشی ئەوەندە شت. لە پاشا فەرمووی: پێغەمەرم -ﷺ- دی دەزنوێژێکی وەك =ئەم= دەزنوێژی منە شت. لە پاشـا پێغـەمـەر -ﷺ- فەرمـووی: هەرکـەسێ دەزنـوێـژێکی وەك ئەم دەزنوێژی منە بشواو هەڵسێ دوو رەکعەت نوێژ بکاو لەو نوێژەدا هیچ قسەی دنیایی بە دڵیا نەهێنێ هەر گوناهێکی لەوەپێش کردبێتی خوا لێی خۆشەبێ. [نوێژەکەیی و چوونەمزگەوتی بە نافیلە، یەعنی بە زیادە، بۆ حسێب ئەکرێ].

**٢٨/١٦٨٦- عن أبي هريرة ـ رضي الله تعالى عنه ـ أن رسول الله -ﷺ- قال: الصلوات الخمس والجمعة إلى الجمعة كفارات لما بينهن ما لم تغش الكبائر. م ـ ٢/٢٤٧. وفي أخرى زيادة: ورمضان إلى رمضان مكفرات لما بينهن إذا اجتنب الكبائر. م ـ ٢/٢٤٨. ت، د.**

**تەرجەمە:**

ئەبـوهـورەیـرە ـ رضي الله تعـالى عنـه ـ ئەفەرموێ: پێغەمەر -ﷺ- ئەیفەرموو: پێنج وەقت نوێژ، لە جومعەوە تا جومعە، لە رەمەزانەوە تا رەمـەزان کەفـارەتی گونـاهی مابـەینیـانن بەو شەرتە لە کەبیرە ئیجتیناب بکرێ؛ یەعنی کوللی نوێژێ کەفارەتی گوناهی بەینی خۆی و نوێژی پێش خۆی، نوێـژی جومعـە کەفـارەتی گونـاهی مابـەینی دوو جومعەیە رەمەزانیش وەها.

**٢٩/١٦٨٧- عن أبي هريـرة ـ رضي الله تعـالى عنه ـ أن رسول الله -ﷺ-**

**قال: إذا توضأ أحدكم فليجعل في أنفه [ماء. م] ثم‌ليستنثر، ومن استجمر فليوتر، وإذا استيقظ أحدكم من نومه فليغسل يده قبل أن يدخلها في وضوئه؛ فإن أحدكم لا يدري أين باتت يده. ح - ١/ ٢٤٢. م - ٢/ ٢٥٨.**
**أورد هذا الحديث صاحب الكتب الستة.**

**١٦٨٨/٣٠- وعنه أن النبي -ﷺ- قال: إذا استيقظ أحدكم من منامه فليستنثر ثلاث مرات، فإن الشيطان يبيت على خياشيمه. م - ٢/ ٢٦٠**

**١٦٨٩/٣١- وعنه أن النبي -ﷺ- قال: إذا استيقظ أحدكم [من نومه أخرى م] فليفرغ على يديه ثلاث مرات قبل أن يدخل يده في إنائه، فإنه لا يدري فيم باتت يده. م - ٢/ ٣٢٧. (بەسە).**

**تەرجەمە:**

ئەبوهورەیرە - رضي الله تعالى عنه - ئەفەرموێ: پێغەمەر -ﷺ- فەرمووی: کە یەکێکتان دەزنوێژی شت ئاو لە لووتی وەربداو لە دواییدا هم بکا [و ئاوو (مستقذرات)ی لێ بێتەدەرێ] کەسێ بە بەرد ئیستینجای کرد [با بە کەمتریش پاك ببێتەوە، سێ جاری بکا، ئەگەر بە سێ جار پاك نەبۆوە بە جووت پاك بۆوە] بیکا بە تاق. لە خەو خەبەری بۆوە لە پێش ئەمەدا کە دەست بکا بە زەرفی ئاوەکەدا سێ جار دەستی بشوا؛ چونکی نازانێ شەو دەستی لە کوێ بوە. لە ریوایەتەکەی ترا: کە لە خەو خەبەری بۆوە سێ جار ئاو لە لووتی وەربدا؛ چونکی شەیتان بە شەو لە کونی لووتیا ئەنوێ. [ئەمە مەجازە مانیع لە حەقیقەتەکەیشی نیە؛ چونکی لە مومکیناتە. دەست شتن لە پێش ئەمەدا بیکا بە ئاوی دەزنوێژەکەیا سوننەتە لەبەر ئیحتیاط، واجب نیە.]

٣٢/١٦٩٠ـ عن عبد الله بن عمرو [بن العاص] ـ رضي الله تعالى عنهما ـ قال: تخلف النبي ـﷺـ عنا في سفرة فأدركَنا وقد أرهقنا، فجعلنا نتوضأ ونمسح على أرجلنا، فنادى بأعلى صوته: ويل للأعقاب من النار! مرتين أو ثلاثا. ح ـ ١٨٨/١٥٢/٢٤٣/١. م ـ ٢٦٤/٢.

٣٣/١٦٩١ـ وفي رواية عنه: رجعنا مع رسول الله ـﷺـ من مكة إلى المدينة، حتى إذا كنا بماء بالطريق تعجل قوم عند العصر فتوضؤا وهم عجال، فانتهينا إليهم وأعقابهم تلوح لم يمسها الماء. فقال رسول الله ـﷺـ: ويل للأعقاب من النار! أسبغوا الوضوء. م ـ ٢٦٤/٢.

٣٤/١٦٩٢ـ عن أبي هريرة ـ رضي الله تعالى عنه ـ أن النبي ـﷺـ رأى رجلا لم يغسل عقبه فنادى: ويل للأعقاب من النار! م ـ ٢٦٥/٢. وفي رواية: ويل للعراقيب [جمع عرقوب، وهو العصبة التي فوق العقب. ومعنى ويل لهم: هلكة وخيبة. نووي].

٣٥/١٦٩٣ـ عمر بن الخطاب [رضي الله تعالى عنه] أن رجلا توضأ فترك موضع ظفر على قدمه فأبصره النبي ـﷺـ فقال: ارجع فأحسن وضوءك فرجع ثم صلى. م ـ ٢٦٥/٢.

تەرجەمە:

عەبدوڵڵای کوڕی عەمری کوڕی عاص ـ رضي الله تعالى عنهما ـ ئەفەرموێ: پێغەمەر ـﷺـ لە سەفەرێکا لە ئێمە دواکەوت، پێمان گەیی وەختی عەصرمان بەسەرا درەنگ بووبوو، دەزنوێژمان ئەشت و پێمان مەسح ئەکرد، بە دەنگێکی بەرز بانگی فەرموو: واوەیلابێ بۆ پاژنەی پێ لە ئاگری جەھەننەم! دوو جار یا سێ جاری فەرموو.

لە ریـوایـەتـەکـەی تری موسلیمـا ئەفـەرموێ: لە خزمەت پێغەمەرا ـﷺـ لە مەکەوە گەراینەوە بۆ مەدینە تا لە رێ گەیینە سەر ئاوێ، لە وەختی عەصرا خەڵق عەجەلەی کرد بە عەجەلە دەزنوێژیان شت، کە گەیینە لایان پاژنەیان دەرەکەوت کە ئاوی لێ نەکەوتبو، پێغەمەر ـﷺـ فەرمووی: واوەیلا بۆ پاژنەتان لە ئاگر، دەزنوێژتان تەواو بشۆن .

لە ریوایەتی ئەبوهورەیرەدا ـ رضي الله تعالى عنه ـ پێغەمەر ـﷺـ چاوی کەوت بە پیاوێ پاژنەی نەشتبو. . . الخ .

لە ریوایەتی ئیمامی عومەرا ـ رضي الله تعالى عنه ـ ئەفەرموێ: پێغەمەر ـﷺـ پیاوێکی دی بە قەد نینۆکێکی =لە پێی= نەشتبوو ئەمری پێ فەرموو: بگەرێرەوە دەزنوێژەکەت باش بشۆ، گەرایەوەو [دەزنوێژەکەی تەواو شت و] نوێژی کرد.

لەم حەدیثانە دەرەکەوێ کە پاژنەی پێ تا قولەپێ بە تەواوەتی ئەبێ بشۆررێ، بە قەد ذەرەییێکی ئاوی لێ نەکەوێ دەزنوێژەکەی دروست نیـە. ئەممـا قولـەپێ شتن لە ئایـەتـەکـەی مائیـدەدایـە[1] لەم حەدیثـانـە دەرناکەوێ؛ چونکی (ویل للاعقاب)ی فەرموە (للكعاب)ی نەفەرموە. مەسحی پێ کافی نیە شتن لازمە.

## تیمن[1] لە ئەفعالی دائیر بە مەکاریمدا

**١٦٩٤/٣٦ـ عن عائشة [رضي الله تعالى عنها] قالت: كان النبي ـﷺـ يعجبــه التيمن في: تنعله، وتــرجله، وطُهــوره، وفي شأنـه كله. ح ـ**

(١) مەبەستی ﴿امسحوا برؤوسكم وأرجلَكم الى الكعبين﴾ە

(٢) تیمن: لە راستەوە دەستپێکردن.

١/٢٤٧ . م ـ ٢/٣٠٤ . م ـ ٢/٣٠٢ . قالت: ليحب التيمن في طهوره إذا تطهر، وفي ترجله إذا ترجل، وفي انتعاله إذا انتعل. ح ـ ٨/٤٣٣ . د، ت، ن، جه.

تەرجەمە:

پێغەمەر ـ ﷺ ـ لە هەموو ئیشێکا لە نەوعی تەکریم بێ، وەك: دەزنوێژ و، سەرداهێنان و، وەك کەوش لەپێ کردن [وەك جل لەبەرکردن، لە خەلا هاتنەدەرەوە، لە موصافەحەکردنا] لە لای راستەوە دەستپێکردنی حوببانوە. [لە خیلافی ئەوەدا وەك: کەوش داکەندن، لە حەیوان دابەزین، لە ماڵ هاتنەدەرەوە، چوونەخەلا، تارەت بەدەست گرتن، جل داکەندن = لەراستەوە دەستپێکردنی پێخۆش نەبوە= ئەمما دەست شتنی پێشەوەو گوێ مەسحکردن بە جارێکە لەوەدا تەیامون سوننەت نیە. (من نووي)]

## إلتمــاس الوَضـــوء[1]

١٦٩٥/٣٧ـ عن أنس بن مالــك ـ رضي الله تعــالى عنــه ـ قال: رأيت رســول الله ـ ﷺ ـ وحــانت صلاة العصـر، فالتمس النـاس الـوَضـوء فلم يجـدوه، فأتي رسول الله ـ ﷺ ـ بوَضوء، فوضع رسول الله ـ ﷺ ـ في ذلك الإنـاء يده، وأمـر الناس أن يتوضؤا منه. قال: فرأيت الماء ينبع من تحت أصـابعـه حتى توضؤا من عنـد آخرهم. ح ـ ١/٢٤٨ . م ـ ٩/١٣٩ . وفي أخرى مثله عنه: قلنا: كم كنتم؟ قال: ثمانين وزيادة. ح ـ ١/٢٦٨ . م ـ ٩/١٣٩ .

(١) بۆ ئاوی دەزنوێژگەڕان.

**تەرجەمە:**

رەنگە ئەم حەدیشانە لە موعجیزاتا نووسرابن (1) تەرجەمەیشی لەوێدابێ. عەطاء بە سەنەدێکی صەحیح ئەفەرموێ: زەرەری نیە مووی ئینسان گوریس و بەنی لێدروست بکرێ. زوهری ئەڵێ: سەگێ دەمی خستە ناو ئاوێکەوە ئەگەر ئاوی تری نەبێ دەزنوێژی پێبشوا. سوفیانی ثەورییش وا ئەفەرموێ. خوا فەرموویەتی: کە ئاوتان دەست نەکەوت تەیەموم بکەن. (2) ئەمە ئاوە.

بوخاریی ئەفەرموێ: ئەم قسەی سوفیانە لە دڵا شتێکی تیایە. یەعنی نەفس قێزی لێ ئەکا ئەو وەختە دەزنوێژی پێ بشوا [چونکی ئاوی دەست کەوتوە] تەیەمومیش بکا [چونکی ئیحتیمالی پیسبوونی ئەم ئاوە هەیە] فەقەط ئەم حەدیثی دواییە چی لێ ئەکەن؟! ح ـ ١/٢٤٩.

## سؤر الكلب (3)

**٣٨/١٦٩٧ ـ عن أبي هريرة ـ رضي الله تعالى عنه ـ قال: إن رسول الله ـ ﷺ ـ قال: إذا شرب الكلب في إناء أحدكم فليغسله سبعا. ح ـ ١/٢٥٠.**

**٣٩/١٦٧٠ ـ م ـ ٢/٣٣١. وفيه: فليُرِقْه، ثم ليغسله سبع مرار. وفي م ـ ٢/٣٣٢ عنه قال رسول الله ـ ﷺ ـ: طَهور إناء أحدكم إذا ولغ فيه الكلب**

(1) مەبەستی ئایەتی ﴿فتيمموا صعيدا طيبا...﴾ە. النساء/٤٣. المائدة/٦.

(2) بەڵێ ئەم حەدیثە وەك حەدیثی (٥٤٢/٤)ی موعجیزات وایە.

(3) پاشماوەی سەگ. مەبەست ئەو قاپ و شتەیە کە سەگ دەمی تێخستبێ.

أن يغسله سبع مرات أولاهن بالتراب. وعن ابن المغفل قال: أمر رسول الله ـﷺـ بقتـل الكـلاب ثم قال: ما بالهم وبـال الكـلاب؟ ثم رخص في كلب الصيـد وكلب الغنم، وقـال: إذا ولغ الكلب في الاناء فاغسلوه سبع مرات وعفروه الثامنة في التراب. م ـ ٢/٣٣٣. م ـ ٦/٤٥٥ إلى (وقال ولغ).

تەرجەمە:

ئەبـوهـورەيـرە ـ رضي الله تعـالى عنـه ـ ئەفەرموێ: پێغەمەر ـﷺـ فەرمووی: کە سەگ دەمی خستە ناو زەرفی یەکێ لە ئێوەو ئاوی لێ خواردەوە حەوت دەفعـە بیشـوا. لە ریوایەتي موسلیما: ئەو ئاوە برێژێ‌و زەرفەکە حەوت دەفعە بشوا. لە ریوایەتەکەی تریا: ئەوەڵ جاري بە گڵ بێ. لە ریـوایـەتی موغـەفـەلا پێغـەمـەر ـﷺـ: ئەمری کرد بە کوشتنی سەگ، لە پاشا فەرمووی: دەخڵیان چیە بەسەر سەگەوە؟ لە پاشا ئیذني دا بۆ سەگـی راوو سەگی شوان. فەرمـووی: کە سەگ دەمی خستـە زەرفێکەوە حەوت جاری بشۆن گڵیش هەشتەمین جاری بێ.

ئەحکـامي (ولـووغی کـەلب)[1] ئەوەیـە کە ئەم حەدیثـانـە دەلالـەت ئەکـەن لەسـەر مەذهـەبی ئیمـامی شافیعی ـ رضي الله تعـالی عنـه ـ چونکی طەهارەت یا لە حەدەثە یا لە (خبث)ە[2]، لێرەدا حەدەث نیە کە وابێ ئەبێ کەلب خەبیث بێ. ئەوی سەگ دەمی تێ ئەنێ ئەگەر مائیع[3] بێ خواردن و خواردنەوەی حەرامەو پیسە. ئەگەر پاك بوایە ئەمر

(١) ولووغی کەلب: ئەوەیە کە سەگ دەم بخاتە قاپ و قاچاخ.

(٢) خبث: پیسی.

(٣) مائیع: شتی شل و تەڕ.

بە رشتنی نەئەکرا؛ چونکی ئیضاعەی ماڵ حەرامە. ئەو سەگە حەزەکا سەگێ بێ کە ڕاگرتنی دروست بێ یا دروست نەبێ. سەگی بەدەویی بێ یا سەگی دێهات و شارستانیی بێ.

لە مەذهەبی مالیکا چوار قەول هەیە:

١ ـ پاش ماوەی پاکە.

٢ ـ پیسە.

٣ ـ ئەوی ڕاگرتنی دروست بێ پاکە ئەوی دروست نەبێ پیسە. ئەم سێ قەولـە قەولی نەفسی ئیمـامی مالیکـە. عەبـدولمـەلیکی (ماجشون) لە مالیکیی ئەفەرموێ: فەرق هەیە لە بەینی سەگی بەدەویی و خانونشینا.

لە حەدیثێکیانا ئەمرکراوە بە ڕژاننی، واجبە یا واجب نیە؟ ئەگەر زەرفەکە ئیستیعمال بکرێ واجبە. بەعزێك لە ئێمە ئەڵێن: واجب نیە سوننـەتـە. بەعـزێکمـان ئەڵێن: دەزبـەجێ ئەبێ برێـژرێ مەبـادا لە عەمەل بێنرێ‌و، لەبەر ئەمە کە ئینسان خۆی لە سەگ بپارێزێ. ئەوی سەگ دەمـی تێ‌خـسـت پیسـە، ئەبـێ حەوت دەفعـە بشـۆرێ، لە ڕیوایەتێکا ئەوەڵ جاری بە گڵ بێ. لە ڕیوایەتێکا ئاخر جاری بە گڵ بێ. لە ڕیوایەتێکا گڵ هەشتەمین بێ. لەم ڕیوایەتانەدا وا دیارە موراد نە ئەوەڵەو نە ئاخرە. هەر یەکێکیان بێ ـ هەر کامیان بێ ـ بە گڵ بێ. هەم لای ئێمە خیلاف نیە لەمەدا دەمی تێ نێ، یا بەولی، یا ڕەوثی،[1] یا خوێنی، یا عەرەقی، یا مووی، یا لیکی، یا ئەعزایێ لە

(١) بەول و ڕەوث: میزو پیسیی.

ئەعــزای بکــەوێتــە ناو شتـی شلەوە پیس ئەبـێ. بە تەڕیی لە شتێ بکەوێ، یا بە وشکی لە شتێکی تەڕ بکەوێ ئەو شتە پیس ئەکا. دوو یا سێ سەگ (مثلا) دەم خەنە شتێکەوە یا سەگێ چەند جار دەم بخاتە شتێکەوە. . . بۆ هەموویان حەوت جار شتن، کە جارێکی بە گڵ بێ، کافییــە. بەعــزێــك ئەڵێن: بۆ کوللی سەگێ بۆ کوللی جارێ حەوت دەفعە. بەعزێك ئەڵێن: سەگێ چەند جار دەمی تێ نێ حەوت دەفعە کافییە. گەلێ سەگ دەمی تێبنێن بۆ هەر سەگێ حەوت جار لازمە. ئەگەر پیسییێکی تریش بکەوێتە ناو ئەو زەرفەی کە سەگ دەمی تێ نابێ حەوت جار کافییە.

ئەبێ گڵەکە پاك بێ، شتی تر بری گڵ ناکەوێ. ئەگەر خوێنی یا پیسـایی سەگ ئەمجـا بە شەش جار پاك بێتـەوە . بەعـزێـك ئەڵێن: بە شەش جار حسێبــە، بەعـزێـك ئەڵێن: بە جارێ حسێبـە. بەعـزێـك ئەڵێن: بە هیچ حسێبە (خير الأمور أوساطها) بەرازیش وەك سەگە لای ئێمە، قەولێکی بە قووەتی شافیعیی هەیە کە ئەکثەری عولەمای لە سەرە کە بەراز حەوت دەفعەی پێ ناوێ.

ئەبـوحـەنیفـە ئەفـەرمـوێ: سەگ دەمی خستە شتێك بە سێ دەفعە شتن پاك ئەبێتەوە. [سائیری ئەعزای پاکە مەخرەجی قیاس لە دەمی کراوە. ئەم میقدارە لە نەووەوی بەسە]

**٤٠/١٦٩٨ـ عن عبـد الله بن عمـر [رضي الله تعـالى عنهما] قال: كانت الكلاب تقبل وتدبر =في المسجد= في زمان رسول الله ـﷺـ فلم يرشون شيئا من ذلك ح ـ ١/ ٢٥١، إسماعيلي. أبو نعيم.**

**تەرجەمە :**

عەبدوڵڵای کوڕی عومەر ـ رضي الله تعالى عنهما ـ ئەفەرموێ : لە زەمـانی پێغـەمـەرا ـﷺـ سەگ بە مزگەوتی نەبـەویـدا ـ عليـه الصـلاة والسلام ـ ئەهات و ئەچوو هیچ ئاویان بەسەرا نەئەرژان .

ئەم حەدیثـە دەلاڵـەت ئەکـا لەسـەر مەذهەبی ئەبوحەنیفە کە سەگ غەیری مەدخەل و مەخرەجی ، پاکە . دەلیلی شافیعیی قیاسی سائیری ئەعزایەتی لە دەمی . حەدیثەکە مەحمولەتە سەر بیدایەتی ئیسلام ، لە پاشا ئەمر کراوە بە ئیکرامی مەساجید . یەعنی ئەو هاتوچۆی سەگە بە مزگەوتا ئاخری ئەمر نیە .

**٤١/١٦٩٩ـ عن أبي هريرة ـ رضي الله تعالى عنه ـ أن رسول الله ـﷺـ قال : بينـا رجـل يمشي فاشتـد عليـه العطش ، فنزل بئرا فشرب منها ثم خرج ، فإذا هو بكلب يلهث [يرتفع نفسه ، او يخرج لسانه من العطش] = يأكـل الثـرى من العطش= فقـال : لقـد بلغ هذا مثـل الـذي بلغ بي [فـرحمـه ، فنـزل بئـرا] فملأ خفـه ثم أمسك بفيه ، ثم رقيَ فسقى الكلب [حتى أرواه . أخـرى] فشكـر الله له فغفـر له [فأدخله الجنـة . أخـرى] . قالوا : يارسول الله وإن لنا في البهائم أجرا؟ قال : في كل [ذي] كبد رطبة أجر. ح ـ ١٩٤/٤ . م ـ ٩٤/٩ . ح ـ ٢٥١/١ . د.**

**تەرجەمە :**

ئەبوهورەیرە ـ رضي الله تعالى عنه ـ ئەفەرموێ : کە پێغەمەر ـﷺـ فەرمووی : لە وەختێکا پیاوێ لە بەنیئیسرائیل بە رێدا ئەڕۆیی تینوێتی غەڵبەی لێکرد چوە ناو بیرێکەوەو ئاوی لێ خواردەوەو هاتە دەرێ ، کە دی سەگێ لە تینوانا نەفەسی توند بووبوو زمانی دەرکێشابوو =خوڵی

ئەخـوارد= ئەو پیـاوە وتی: ئەمـەیش وەکـوو منی لیٚ هاتـوە لە تینویٚتیا، رەحمی پیٚکرد، چوە ناو بیرەکەوە کەوشەکەی پرکرد لە ئاوو کەوشەکەی بە دەمی گرت کە بیٚتـەدەریٚ، لە پاشـا سەرکـەوت سەگـەکـەی ئاودا تا تیٚـراوی کرد. خوا شوکـری ئەو پیـاوەی کردو لیٚی خوٚش بوو بردیـە بەهـەشتـەوە. عەرزی پیٚغـەمـەریـان ـﷺ ـ کرد: بوٚ لە حەیواناتیشا ئیٚمە ئەجـرمـان هەیـە؟ فەرمـووی: لە کوللی صاحیب جەرگیٚکـا کە تەرِایی حەیات لە جەرگیا بیٚ ئەجر هەیە.

**١٧٠٠/٤٢ ـ وعنه عن رسول الله ـﷺ ـ قال: غفر لامرأة مومسة مرت بكلب على رأس ركيٍّ (بئر لم تطو) يلهث، قال: كاد يقتله العطش، فنزعت خفها فأوثقته بخمارها فنزعت له من الماء فغفر لها بذلك ح ـ ٣٠٥/٥. ن. م ـ ٩٦/٩ بفرق وفيه: بينما كلب يطيف بركية قد كاد يقتله العطش، إذ رأتـه بغيًّـا من بغـايا بني إسـرائيـل فنـزعت =لـه= بموقها... الخ.**

تەرجەمە:

ئەبـوهـورەیـرە ـ رضي الله تعـالى عنـه ـ ئەفەرمویٚ: پیٚغەمەر ـﷺ ـ فەرمـووی: ژنیٚکی زانیـە بە لای سەگیٚکـا رابـورد بە دەوری بیـریٚکی سەرنەگیراوا ئەهات،زمانی دەرکیٚشابوو نزیك =بوو= تینویٚتی بیکوژیٚ، کەوشەکەی داکەند لەچکەکەی سەری مەحکەم پیٚوەبەست، لە بیرەکە ئاوی بوٚ هەڵیٚنجا، خوا بەوە لیٚی خوٚش بوو.[1].

(١) دانەر ـ خ ـ جیاوازیی ریوایەتەکەی موسلیمی نەنووسی کە ئەمەیە: (سەگیٚ بە دەوری بیریٚکا ئەسوورِایەوە... داویٚن پیسیٚ لە داوین پیسانی بەنیئیسرائیل...).

## المســـح على الخـــف

٤٣/١٧٠١- عن عروة بن المغيـرة عن المغيـرة [رضي الله تعـالى عنـه] قال: تخلف رســول الله -ﷺ- وتخلفت معــه، فلمـا قضى حاجتـه قال: أَمَعَـك ماء؟ فأتيتـه بمطهرة فغسل كفيه ووجهه ثم ذهب يحسر عن ذراعيه فضاق كم الجبة، فأخرج يده من تحت الجبة، وألقى الجبة على منكبيه،

وغســل ذراعيـه، ومسـح بنـاصيتـه، وعلى العمامة وعلى خفيه، ثم ركب وركبت معـه، فانتهينـا إلى القـوم وقـد قامـوا إلى الصـلاة يصلي بهم عبد الرحمن بن عوف - رضي الله تعالى عنه - وقد ركع بهم ركعة، فلما أحس بالنبي -ﷺ- ذهب يتأخــر فأومأ إليــه، فلمــا سلم قام النبي -ﷺ- وقمت فركـعنــا الــركعــة التي سبقتنــا. ح - ١/٢٥٧، ٢٧٣. م-٣/٧٠/ م-٢/٣١٧. د، ن، جه. اللفظ لمسلم.

تەرجەمە:

موغیــره - رضي الله تعــالى عنــه - ئەفـەرمـوێ: پێغـەمـەر -ﷺ- دواکەوت، منیش لە خزمەتیا دواکەوتم، کە قەزای حاجەتی بەجێ‌هێنا فەرمــووی: ئاوت پێـیــە؟ مەتــارەییێکم بۆ برد، هەردوو دەستی شت، دەم وچاوی شت، تەمای بوو قۆڵی هەڵماڵێ قۆڵی جبەکەی تەنگ بوو، دەستی موبارەکی لەژێریەوە هێنایە دەرێو جبەکەی هاویتە سەر شانی، هەردوو بازووی شت و ناوچاوانی مەسح کرد [یەعنی سەری لە طەرەفی ناوچاوانیەوە] مەسحی عەمامەکەی کرد، مەسحی خوفەکانی کرد، لە دواییــدا تەشـریفی سواربــوو، لە خزمـەتیـا سواربــووم، کە گەیینە لای قەومەکە لە نوێژا وەستابوون، عەبدوڕەحمانی کوڕی عەوف - رضي الله

تعـالى عنـه ـ نوێـژی پێـئـەکـردن، کە فەرقی‌کرد بە تەشریفی پێغەمەر ـﷺـ هات بچێتە دواوە، پێغەمەر ـﷺـ ئیشارەتی فەرموویە کە نەچێتە دواوە، کە سەلامی دایەوە پێغەمەر ـﷺـ تەشریفی هەڵسا منیش هەڵسام ئەو رەکعەتەی کە لێمان پێش کەوتبوو کردمان.

**٤٤/١٧٠٢ـ وعنه أنه غزا مع النبي ـﷺـ تبوك، قال المغيرة ـ رضي الله تعالى عنه ـ:فتبرز رسول الله ـﷺـ قبل الغائط فحملت معه إداوة قبل صلاة الفجر، فلما رجع رسول الله ـﷺـ إليَّ أخذت أهريق على يديه من الإداوة، وغسل يديه ثلاث مرات، ثم غسل وجهه، ثم ذهب يخرج جبته عن ذراعيه، فضاق كُمَّا جبته، فأدخل يديه في الجبة حتى أخرج ذراعيه من أسفل الجبة، وغسل ذراعيه إلى المرفقين، ثم توضأ على خفيه، ثم أقبل.**

**قال المغيرة [رضي الله تعالى عنه]:فأقبلت معه حتى نجد الناس قد قدموا عبد الرحمن بن عوف [رضي الله تعالى عنه] فصلى لهم، فأدرك رسول الله ـﷺـ إحدى الركعتين فصلى مع الناس الركعة الآخرة، فلما سلم عبد الرحمن بن عوف [رضي الله تعالى عنه] قام رسول الله ـﷺـ يتم صلاته، فأفزع ذلك المسلمين فأكثروا التسبيح، فلما قضى النبي ـﷺـ صلاته أقبل عليهم، ثم قال: أحسنتم، أو قال: قد أصبتم. يغبطهم أن صلوا الصلاة لوقتها. م ـ ٣/٦٩. وفي أخرى: فانطلق رسول الله ـﷺـ حتى توارى عني فقضى حاجته. والباقي بمثله وليس فيه إمامة عبد الرحمن بن عوف. م ـ ٢/٣١٤. ح ـ ١/٢٧٣. د، ن، جه. والبخاري في اللباس أيضا وفي مواضع. وفي أخرى:فغسل ذراعيه ومسح برأسه ثم أهْوَيت لأنزع خفيه فقال: دعهما فإني أدخلتهما**

**طاهرتين، ومسح عليهما. م ـ ٢/٣١٥. ح ـ ١/٢٧٥.**

**عن بلال [رضي الله تعالى عنه] أن رسول الله ـﷺـ مسح على الخفين والخمار. م ـ ٢/٣٢١. وفي أخرى: فأردت تأخير عبد الرحمن بن عوف. فقال النبي ـﷺـ: دعه. م ـ ٣/٧٠.**

**تەرجەمە:**

موغیرە ئەفەرموێ: لە خزمەت پێغەمەرا ـﷺـ غەزای تەبووکی کرد. پێغەمەر ـﷺـ تەشریفی چوو بۆ قەزای حاجەت، مەتارەیێکم لە خزمەتیا هەڵگرت، وەقت لە پێش نوێژی سبەینێدا بوو، تەشریفی رۆیی تا لە من ون بوو،کە لە قەزای حاجەت تەشریفی گەڕایەوە لای من ئاوم کرد بە هەردوو دەستیا، سێ جار هەردوو دەستی شت، لە دواییدا دەم و چاوی شت، تەمای بوو جبەکەی لەسەر بازووی هەڵماڵێ هەردوو قۆڵی جبەکەی تەنگ بوو هەڵنەماڵرا دەستی لە ژێر جبەکەیەوە هێنایە دەرێ هەردوو دەستی تا ئانیشکی شت، سەری مەسح کرد، داهاتمەوە کە مەسحەکانی لە پێ دابکەنم، فەرمووی: لەسەر طەهارەت لەپێم کردوون وازی لێ بێنە، مەسحی لەسەر مەسحەکانی کرد، تەشریفی رووی کرد بۆ ئەو جێیەی کە ئەصحابی کیرامی لێ بوون، منیش لە خزمەتیا چووم، خەڵقەکەمان دی عەبدورەحمانی بنی عەوفیان پێش خستبوو، نوێژی بۆ ئەکردن، ئەوە موسوڵمانانی خستبوە ترسەوە گەلێ تەسبیحیان کرد، تەمام بوو عەبدورەحمان بێنمە دواوە، فەرمووی: لێی بگەڕێ، پێغەمەر ـﷺـ بە رەکعەتێ لە دوو رکاتەکەیا گەیی لەگەڵ خەڵق رکاتی دوایی کرد، کە

عەبدورەحمان سەلامی دایەوە، پێغەمەر ـ ﷺ ـ تەشریفی هەڵسا نوێژەکەی تەواوکرد، لە دوایيدا رووی‌کردە خەڵق فەرمووی: چاك چاكتان كردوه كە لە وەختی نوێژا نوێژتان كردوە، بەوە غیبطەی پێ بردن.

بۆ گەورە ئیستیعانە بە بوچووكی خۆكردن لە ئیحضاری ئەسبابی عیبادەتادروستە، مەسح لەسەر پاكیی لە پێ‌كرابێ مەسح لەسەركردنی دروستە.

ئەصڵی ئیمام لە ئەوەڵی نوێژا حازر نەبێ یەكێكی تر ببێ بە ئیمام دروستە،كە ئەصڵی ئیمام هاتەوە بۆ وەكیلەكەی هەیە كە بچێتە دواوەو ئەصڵی ئیمامەكە ببێ بە ئیمام و خەڵق ئیقتیدا بەو بكا. بۆ ئەصڵی ئیمامەكە هەیە كە ئیبقای وەكیلەكە بكا. بینا لەسەر حەدیثی بیلال مەسح لەسەر لەچكەوە دروستە، ئەمما ظاهیر وایە كەمێ مەسحی سەری كردبێ‌و تەمامی سەری لەسەر لەچكەوە مەسح كردبێ (والله أعلم).

كە ئەصڵی ئیمام هات وەكیل خەبەری نەبێ بە ئیشارەت خەبەرپێدانی دروستە. بۆ پیاوان بە تەسبیح، بۆ ژنان بە ئاهیستە بەری دەستی راستی بدا بەسەر پشتی دەستی چەپیا. (كما یجيء إن شاء الله تعالى).

**١٧٠٣/٤٥ـ عن شريح بن هانىء قال: أتيت عائشة [رضي الله تعالى عنها] أسألها عن المسح على الخفين، فقالت: عليك بابن أبي طالب [رضي الله تعالى عنه] فاسأله فإنه كان يسافر مع رسول الله ـ ﷺ ـ فسألناه،**

**فقال: جعل رسول الله ـ ﷺ ـ ثلاثة أيام ولياليهن للمسافر ويوما وليلة للمقيم [وفي أخرى: ائت عليا فإنه أعلم بذلك مني] م ـ ٢/ ٣٢٢.**

**تەرجەمە:**

شورەیحی کوڕی هانیء ئەفەرموێ: چوومە خزمەت حەزرەتی عایشە ـ رضي الله تعالى عنها ـ کە لە مەسحکردنی سەر مەسح لێی بپرسم، فەرمووی: بچۆرە لای عەلی ـ رضي الله تعالى عنه ـ [ئەو لە من بەوە عالمترە] چونکی لە خزمەت پێغەمەرا ـ ﷺ ـ سەفەری زۆری ئەکرد، چووم لە حەزرەتی عەلیم ـ رضي الله تعالى عنه ـ پرسی، فەرمووی: پێغەمەر ـ ﷺ ـ بۆ موسافیر سێ شەوو سێ رۆژی داناوە [یەعنی لە وەختی دەزنوێژشکانەوە تا ئەوەندە رائەبووری] بۆ موقیم شەوو رۆژێکی داناوە. [لەو وەختەوە کە دەزنوێژی ئەشکێ].

**٤٦/ ١٧٠٤ـ عن بريدة [رضي الله تعالى عنه] أن النبي ـ ﷺ ـ صلى الصلوات يوم الفتح بوضوء واحد ومسح على خفيه. فقال له عمر [رضي الله تعالى عنه]: لقد صنعتَ اليوم شيئا لم تكن صنعته. فقال: عمدا صنعته يا عمر. م ـ ٢/ ٣٢٤.**

**تەرجەمە:**

بورەیدە ـ رضي الله تعالى عنه ـ ئەفەرموێ: پێغەمەر ـ ﷺ ـ لە رۆژی فەتحی مەکەدا هەر پێنج فەرزی نوێژی بە تەنها دەزنوێژێ کرد، لە سەر مەسحەکانیەوە پێی مەسح کرد، عومەر ـ رضي الله تعالى عنه ـ عەرزیکرد: ئیمرۆ شتێکت کرد قەت نەتکردبێ. فەرمووی: بە عەمدەن وام کرد =ئەی عومەر= یەعنی تا خەڵق بزانن کە ئەوە دروستە.

**١٧٠٥/٤٧ـ عن عبد الله بن عمر عن سعد بن أبي وقاص [رضي الله تعالى عنهم] عن النبي ـﷺـ أنه مسح على الخفين، وأن عبد الله بن عمر سأل عمر عن ذلك، فقال: نعم إذا حدَّثك شيئا سعدٌ عن النبي ـﷺـ فلا تسأل عنه غيره ح ـ ١/٢٧٢. ن.**

**تەرجەمە:**

سەعدی کوڕی ئەبو وەقاص ـ رضي الله تعالى عنهما ـ لە پێغەمەرەوە ـﷺـ ریوایەت ئەکا کە پێغەمەر ـﷺـ لە سەر مەسح مەسحی کرد. عەبدوڵڵای کوڕی عومەر ـ رضي الله تعالى عنهما ـ ئەوەی لە ئیمامی عومەر پرسی ـ رضي الله تعالى عنه ـ ئیمامی عومەر ـ رضي الله تعالى عنه ـ فەرمووی: بەڵێ وایە کە سەعدی کوڕی ئەبو وەقاص شتێکی لە پێغەمەر ـﷺـ ریوایەت کرد ئیتر ئەو شتە لە هیچ کەسی تر مەپرسە.

مەسحی لەسەر مەسح لە هەشتا صەحابە زیاتر ریوایەت کراوە (عشرەی مبشرە) لەو صەحابانەن.

**١٧٠٦/٤٨ـ عمرو بن أمية [رضي الله تعالى عنه] قال: رأيت النبي ـﷺـ يمسح على عمامته وخفيه. ح ـ ١/٢٧٤.**

**تەرجەمە:**

عەمری کوڕی ئومەیە ـ رضي الله تعالى عنه ـ ئەفەرموێ: پێغەمەر ـﷺـ م دی لەسەر مێزەری و مەسحی ـ مەسحی سەری و پێی ئەکرد.

ئیمامی ئەحمەد ـ رضي الله تعالى عنه ـ ئەفەرموێ: ئەگەر مێزەرەکەی لە دوای مەسحی سەری بەستبێ بۆ دەزنوێژی تر دروستە

لەسەر مێزەر مەسحی سەر بکرێ. ئیمامی عومەرو ئیمامی ئەبوبەکریش - رضي الله تعالى عنهما - کردوویانە. پێغەمەر -ﷺ- لە حەدیثەکەی ئەبوقەتادەدا، کە لە موعجیزاتا رابورد، فەرموویەتی: ئەگەر خەڵق تابیعی ئەبوبەکرو عومەر ببن رێگەی صەواب ئەگرن. ئیتر بۆ تەئویل یا تەقیید بکرێ؟ خەطابیی ئەفەرموێ: مەسحی سەر یەقینی‌یە، مەسحی عەمامە قابیلی تەئویلە، لە یەقینی لانادرێ بۆ غەیری یەقینی. قیاسی لە مەسحی مەسح قیاسی (مع الفارق)ە؛ چونکی مەسح داکەندن زەحمەتە. وەلحاصل مەسئەلەکە خیلافی‌یە، تەقویەی جانیبی جەوازی مەسح کراوە، ئیحتیاط مەسحی سەرە.

## مەذیی پیسە ئەبێ بشۆررێ

**٤٩/١٧٠٧- عن محمد بن الحنفية - رحمه الله تعالى - قال: قال علي - رضي الله تعالى عنه -: كنت رجلا مذّاء فأمرت المِقداد أن يسأل النبي -ﷺ- فسأله، فقال: فيه الوضوء. ح - ١/٢١٨. م - ٢/٣٦٩. وفيه: أن السؤال وقع وعلي - رضي الله تعالى عنه - حاضر.**

**٥٠/١٧٠٨- وفي أخرى: فأمرتُ رجلا يسأل النبي -ﷺ-. لمكان ابنته، فقال: توضأ واغسل ذكرك. ح - ١/٣٢٠. م - ٢/٣٧١، ن. وعن ابن عباس - رضي الله تعالى عنهما - نحوه. م - ٢/٣٧١.**

**٥١/١٧٠٩- ابن عباس - رضي الله تعالى عنهما - أخبر [كريبا] أنه بات ليلة عند ميمونة [رضي الله تعالى عنها] زوج النبي -ﷺ- وهي خالته، فاضطجعت في عَرض الوسادة، واضطجع رسول الله -ﷺ- وأهله في طولها، فنام رسول الله -ﷺ- حتى انتصف الليل أو قبله بقليل أو بعده**

بقليـل، إستيقـظ رسـول الله ـ ﷺ ـ فجلس يمسح النوم عن وجهه بيده، ثم قرأ العشـر الآيـات الخـواتيم من سورة آل عمـران. ثم قام إلى شنٍّ معلقة فتوضأ منها فأحسن وضوءه، ثم قام يصلي. قال ابن عباس [رضي الله تعالى عنهما]: فقمت فصنعت مثل ما صنع، ثم ذهبت فقمت إلى جنبه [الأيسر] فوضع يده اليمنى على رأسي وأخذ بأذني اليمنى يفتلها. فصلى ركعتين ثم ركعتين، ثم ركعتين، ثم ركعتين، ثم ركعتين، ثم ركعتين، ثم أوتر، ثم اضطجع حتى أتاه المؤذن، فقام فصلى ركعتين خفيفتين، ثم خرج فصلى الـصبـح ح ـ ١/ ٢٥٨. ح ـ ٢/ ٣٣٤. ذكـره البخـاري في اثني عشـر موضعا. جه. م ـ ٤/ ٢٣٤.

٥٢/ ١٧١٠ـ وفي أخرى عنه قال: بت في بيت خالتي ميمونة [رضي الله تعـالى عنهـا] فبقيت كيف يصلي رسـول الله ـ ﷺ ـ. قال: فقـام فبـال، ثم غسل وجهه وكفيه، ثم نام، ثم قام إلى القربة فأطلق شناقها، ثم صب في الجفنـة أو القصعـة فأكبـه بيـده عليهـا، ثم توضأ وضوءً حسنا بين الوضوئين، ثم قام يصلي فجئت فقمت إلى جنبـه فقمت عن يســاره، قال: فأخـذني فأقامني عن يمينه، فتكاملت صلاة رسول الله ـ ﷺ ـ ثلاث عشرة ركعة، ثم نام حتى نفـخ، وكنـا نعـرف إذا نام بنفخـه، ثم خرج إلى الصلاة فصلى، فجعل يقول في صلاته، أو في سجوده: اللهم اجعل في قلبي نورا، وفي سمعي نورا، وفي بصـري نورا، وعن يميني نورا، وعن شمـالي نورا، وأمامي نورا، وخلفي نورا، وفوقي نورا، وتحتي نورا، واجعل لي نورا، أو قال: واجـعلني نورا. م ـ ٤/ ٤٣/ ٤٤/ ٤٥. وفي أخـرى: وفي لسـاني نورا. وفيها أيضا: واجعل في نفسي نورا وأعظم لي نورا. م ـ ٤/ ٤٤. ح ـ ٩/ ١٧٥.

تەرجەمە:

ئیبن و عباس - رضي الله تعالى عنهما - ئەفەرموێ: شەوێ‌لای حەزرەتی مەیموونەی پوورم - رضي الله تعالى عنها - مامەوە تا بزانم پێغەمەر -ﷺ- چۆن نوێژ ئەکا، من لە پانیی دۆشەکەدا ئەوان لە درێژی دۆشەکە نوستین، تا نیوەشەو یا نەختێ پێش نیوەشەو، یا نەختێ پاش نیوەشەو بوو پێغەمەر -ﷺ- تەشریفی لەخەو هەڵسا، خەوی ئەرەوانەوە لە دەم وچـاوی، دەستی پیـا ئەهێنـا، دە ئایـەتی ئاخـری ئالی عیمـرانی خوێن. هەڵسـا کوننـەیێ هەڵاوەسـرابـوو دەرکـەکـەی بەرەڵـڵاکـردو دەزنوێژێکی جوانی شت، لە پاشا بۆ نوێژ راوەستا، چووم ئەوی چی کرد منیش کردم، چووم لە تەنیشتی چەپیەوە وەستام دەستی راستی نایە سەرسەرم گوێی راستی گرتم بردمیە تەنیشتی راستیەوە، دوو رەکعەت دوو رکات دوانزە رکاتی کرد. لەپاشا وەتری کردو پاڵ کەوت، پرخەپرخ نوست، لە پاشا موئەذین هات، دوو رکات نوێژی خەفیفی کرد،[1] ئەمجا تەشریفی چوە مزگەوت نوێژی کرد، لە نوێژەکەیا یا لە سوجدەدا ئەو دۆعای نووری بە هەموو ئەعزای کرد. ئەم حەدیثە بە موختەصەری رابورد لە (١٦٦٧/٩)دا.

لەم حەدیثەدا وا دەرەکەوێ بە خەوو دەست لەژن دان دەزنوێژ ناشکێ.

(١) دانەر - خ - تەرجەمەی حەدیثەکانی (١٧٠٧/٤٩)و (١٧٠٨/٥٠)ی لەبیرچوە کە ئەمە پوختـەکـەیـەتی: حەزرەتی عەلی پیـاوێـك بوو مەذیی - کە ئاوێکـە دوای دەسبـازیو ئارەزووجوولان لە پیاو بێتە دەرەوە - زۆر بوو، لەبەر ئەوەی کە حەزرەتی فاطیمە خێزانی بوو شەرمی کرد کە لە پێغەمەر -ﷺ- بپرسێ میقدادی راسپارد ئەو لە پێغەمەری -ﷺ- بپرسی: فەرمووی بەس ئەیشواو دەزنوێژ ئەشوا، خۆشۆردنی لەسەر نیە.

## مسح الرأس كلـــه [1]

٥٣/١٧١١- عمـــرو بن أبـي حسن قال لعبـد الله بن زيـد [بن عاصم الأنصـاري - رضي الله تعـالى عنه -]: أتستطيع أن تريني كيف كان رسول الله -ﷺ- يتوضأ؟ فقال عبد الله بن زيد: نعم. فدعا بماء فأفرغ على يديه فغســل مرتين، ثم غسل وجهــه ثلاثــا، ثم غســل يديـه مرتين مرتين إلى المـرفقين [مَـرْفِق، مِرْفق، روايتـان] ثم مسـح رأسـه بيـديه، فأقبل بهما وأدبـر، بدأ بمقـدم رأسـه حتى ذهب بهما إلى قفاه، ثم ردهما إلى المكان الذي بدأ منه، ثم غسل رجليه. ح - ٢٦١/١. م- ٢٥٣/٢. وفيه: فدعا بإنـاء فأكفأ منهـا على يديـه فغسلهمـا ثلاثـا، ثم أدخـل يدْه فاستخرجها، فمضمض واستنشق من كف واحد، ففعل ذلك ثلاثا إلخ ت مختصراً، ن جه.

وفي أخـرى: فدعـا بتَـوْر من ماء فتوضأ لهم وضوء النبي -ﷺ-: فأكفأ على يديه من التور، فغسل يديه ثلاثا، ثم أدخل يده في التور، فمضمض واستنشق واستنثـر ثلاث [من ثلاث. م] غُرُفـات. ثم أدخـل يده، فغســل وجهـه ثلاثـا، ثم غســل يديـه مرتين إلى المـرفقين، ثم أدخل يده فمسح رأسه... إلخ ح - ٢٦٣/١.

وفي أخرى عنه: أنه رأى رسول الله -ﷺ- توضأ فمضمض ثم استنثر، ثم غسل وجهه ثلاثا ويده اليمنى ثلاثا، والأخرى ثلاثا، ومسح برأسه بماء غير فضل يده، وغسل رجليه حتى أنقاهما. م- ٢٥٦/٢.

---

(١) مەسحكردنى هەموو سەر.

**تەرجەمە:**

عەمـری کوڕی ئەبـوحـەسـەن بە عەبـدوڵڵای کوڕی زەیدی کوڕی عاصیمی وت: ئەتـوانی تەصـویـری دەزنـوێـژی پێغـەمەر ـﷺـ مان بۆ بکـەی؟ فەرمـووی: بەڵێ بۆتـان ئەکـەم. ظەرفێـك ئاوی طەڵەب کرد، بۆیان هێنا کردی بەسەر هەردوو دەستیا، دوو جار دەستی شت، لە پاشا دەستـی کرد بە ناو ظەرفـەکـەدا بە لوێـچـێ ئاوی لە دەمی وەرداو لە لووتیشی وەردا، سێ دەفعە وای کرد، لە پاشا سێ دەفعە دەم وچاوی شت، دوو دەفعە ـ دوو دەفعە هەردوو دەستی شت تا ئانیشکی، لە پاشیا بە هەردوو دەستی مەسحی سەری کرد لە پێشی سەریەوە دەستی پێکرد دەستی تا پشتی سەری برد، لە پاشا دەستی هێنایەوە بۆ پێشەوە تا ئەو جێیەی کە دەستی پێکردبوو، مەسحی سەری بە ئاوێ کرد غەیری ئەو ئاوەی لە شتنی دەستی مابووەوە، لە پاشا پیێ تا قولەپێی شت، تا تەواو پاکی کردنەوە. لە ریوایەتێکا دەستی سێجار سێجار شت.

ئاو لەدەم ولووت وەردان پێنج نەوعی هەیە:

نەوعێکی بە سێ لوێـــچ سێ جار دەمی بە سێ لوێـــچ، سێجـار لووتی بە سێ لوێچ بشوا.

٢ ـ بە سێ لوێچ بە هەر لوێچێك دەمیشیو لووتیشی بشوا.

٣ ـ بە لوێچێ سێ جار دەمی سێ جار لووتی.

٤ ـ بە لوێچێ جارێ دەمی جارێ لووتی، بەم نەوعە هەر بەو لوێچە تا سێ جار.

٥ ـ بە دوو لوێچ؛ بە لوێچێکی سێجار دەمی، بە لوێچێکی سێجار لووتی بشوا. نەوەویی ـ رحمه الله ـ تەصحیحی صوورەتی دووەمی

کردوە. (والله أعلم)

خۆلاصـــەی ئەم حەدیثـــانـە: دەست شتن و دەم وچـاوو قۆڵ و پێ سێ جـــار سێ جــار ئەکمـــەلی دەزنـــوێـــژە. تەواوی مەسحی سەریش ئەکمەلیەتی. یەك جار یەك جاریش دووجار دووجاریش ئەشۆررێ.

## وضـــــوء الرجال والنســـــاء معا(١)

**١٧١٢/٥٤ـ عن عبد الله بن عمر [رضي الله تعالى عنهما] أنه قال: كان الرجال والنساء يتوضؤن في زمان رسول الله ـﷺـ جميعا. ح ـ ١/٢٦٧. في إناء واحد، جه. ندلي فيه أيدينا، د.**

**تەرجەمە:**

عەبدوڵڵای کوڕی عومەر ـ رضي الله تعالى عنه ـ ئەفەرموێ: لە زەمـانی پێغـەمـەرا ـﷺـ پیـاوو ژن لە ظەرفێـك بەیـەکـەوە دەزنـوێژ یان ئەشت. دەستمان ئەکرد بە ناویا.

دەست خستنەناو ئاوی دەزنوێژ ئاوەکە موستەعمەل ناکا.

بە دەست لەژن دان دەزنوێژ ناشکێ.

ژن و پیاو لە ظەرفێکا دەزنوێژ بشۆن دروستە.

لە دوای ئایەتی حیجاب ئەم دروستبوونە هەر لە بەینی مەحاریمایە.

---

(١) دەزنوێژگرتنی پیاوو ژن بەیەکەوە.

## میقداری ئاوی دەزنوێژو غوسڵ

٥٥/١٧١٣- أنس [رضي الله تعالى عنه] يقول: كان النبي -ﷺ- يغسل أو كان يغتسل بالصاع إلى خمسة أمداد ويتوضأ بمدٍّ. ح - ١/ ٢٧١.

تەرجەمە:

پێغەمەر -ﷺ- بە صاعێ [کە چوار موددە] تا پێنج مود غوسڵی ئەکرد، بە موددێکیش [کە ریطلێك وسێیەکی ریطلێکە] دەزنوێژی ئەشت. [ریطلێ صەدوبیست و هەشت دیرهەم و چوار لە حەوت یەکی دیرهەمێکە]

روى الحديث الأربعة أيضا. م - ٢/ ٤٠٠. م - ٢/ ٣٩٩ وفيه عنه: بخمس مكاكيك[1]. وعن أبي بكر - رضي الله تعالى عنه - وعن سفينة - رضي الله تعالى عنه - نحوه. م - ٢/ ٤٠٠.

## الوضوء مما مست النار[2]

٥٦/١٧١٤- زيد بن ثابت [رضي الله تعالى عنه] قال: سمعت رسول الله -ﷺ- يقول: الوضوء مما مست النار. م - ٢/ ٤٣٣

٥٧/١٧١٥- أبو هريرة [رضي الله تعالى عنه] قال: سمعت رسول الله -ﷺ- يقول: توضؤا مما مست النار.

---

(١) دانەر - خ - مانای ئەمەی دوایی نەکرد، ئەمیش هەر وەك پێشووەکەیە؛ چونکە (مکوك) بە مانا (مد - مشتە) واتە بە پێنج مشت خۆی شتوە..

(٢) دەزنوێژگرتنەوە لە خواردنی شتێ ئاگری بەرکەوتبێ.

٥٨/١٧١٦ـ عائشة [رضي الله تعالى عنها] تقول: قال رسول الله ـ ﷺ ـ: توضؤا مما مست النار. م ـ ٢/٤٣٣.

٥٩/١٧١٧ـ عن ابن عباس [رضي الله تعالى عنهما] أن رسول الله ـ ﷺ ـ جمع عليه ثيابه ثم خرج إلى الصلاة فأتي بهدية: خبز ولحم، . فأكل ثلاث لقم، ثم صلى بالناس وما مس ماء. م ـ ٢/٤٣٥.

٦٠/١٧١٨ـ وعنه أن رسول الله ـ ﷺ ـ أكل كتف شاة ثم صلى. م ـ ٢/٤٣٥. ح ـ ١/٢٧٥، د.

٦١/١٧١٩ـ وعنه أن النبي ـ ﷺ ـ أكل عِرقا أو لحما ثم صلى ولم يتوضأ، أو لم يمس ماء. م ـ ٢/٤٣٣.

٦٢/١٧٢٠ـ جعفر بن عمرو بن أمية أن أباه أخبره أنه رأى رسول الله ـ ﷺ ـ يحتز من كتف شاة، فدُعي إلى الصلاة فألقى السكين فصلى ولم يتوضأ ح ـ ١/٢٧٦. م ـ ٢/٤٣٤. وعن ميمونة ـ رضي الله تعالى عنها ـ وبشير بن يسار ـ رضي الله تعالى عنه ـ أيضا عدم الوضوء. ح ـ ١/٢٧٧، ن/ح. م ـ ٢/٤٣١.

تەرجەمەیان:

جەماعەتێ لە صەحابە ـ رضي الله تعالى عنهم ـ ریوایەت ئەکەن کە پێغەمەر ـ ﷺ ـ ئەمری کردوە بە دەزنوێژشتنەوە لەوەی کە بە ئاگر برژابێ یا کوڵابێ. جەماعەتێکی تر ـ رضي الله تعالى عنهم ـ ریوایەت ئەکەن کە پێغەمەر ـ ﷺ ـ گۆشت و شتی تری کە بە ئاگر دروستکرابێ خواردوەو دەزنوێژی نەشتوەتەوە.

ئەوریی و، ئەوزاعیی و، ئەبوحەنیفەو، مالیك و، شافیعیی و خولەفای

راشیـدیـن و، جومهـووری صەحـابـە ـ رضي الله تعـالی عنهم ـ ئەفەرموون: دەزنـوێژ ناشكێنێ. عایشەو، ئەبوهورەیرەو، ئەنەس و، حەسەنی بەصریی‌و، عومەری بنی عەبدولعەزیز ئەفەرموون: ئەشكێنێ.

**١٧٢١/٦٣ـ جابر بن سمُرة [رضي الله تعالى عنه] أن رجلا سأل رسول الله ـﷺـ: أأتوضأ من لحوم الغنم؟ قال: إن شئت، وإن شئت فلا تتوضأ. قال: أتـوضأ من لحـوم الإبلِ؟ قال: نعم فتوضأ. قال: أصلِّي في مرابض الغنم؟ قال: نعم. قال أصلِّي في مبارك الإبل؟ قال: لا. م ـ ٢/٤٣٦.**

**تەرجەمە:**

جابیری كوڕی سەمورە ـ رضي الله تعالى عنه ـ ئەفەرموێ: پیاوێ لە پێغەمەر ـﷺـی پرسی: لە گۆشتی مەڕ دەزنوێژ بشۆمەوە؟ فەرمووی: هەوەست پێنێ بیشـۆرەوە هەوەست پێنێ مەیشـۆرەوە. عەرزی‌كـرد: لە گۆشتی وشتـر بیشـۆمـەوە؟ فەرمـووی: بیشـۆرەوە عەرزی‌كـرد: لە جێمـۆڵگـەی مەڕا نوێـژ بكـەم؟ فەرمـووی: بیكـە. عەرزی‌كـرد: لە جێمۆڵگەی وشتربیكەم؟ فەرمووی: مەیكە.

وا ئەگەینێ میزو پشقلی مەڕو بزن پاك بێ، هی وشتر پیس بێ، دەزنـوێـژ بە گۆشتی وشتـر بشكێ فەقـەط. ئەمـەیش لە بەینی عولەمادا خیـلاف هەیـە. مەذهـەبی شافیعی‌و ئەكثـەری عولـەما هەموویان پیسن دەزنوێژی پێ ناشكێ (من حیث الدلیل) غەیری مەذهەبی شافیعیی بە قووەتە.

**١٧٢٢/٦٤ـ أنس بن مالك ـ رضي الله تعالى عنه ـ قال: بينما نحن**

في المسجد مع رسول الله -ﷺ- إذ جاء أعرابي فقام يبول في المسجد، فقال أصحاب رسول الله -ﷺ-: مه، مه! [فزجره الناس فنهاهم النبي -ﷺ- ح - ١/٢٨٥] قال: قال رسول الله -ﷺ-: لا تُزْرِموه،دعوه، فتركوه حتى بال، ثم إن رسول الله -ﷺ- دعاه فقال له: إن هذه المساجد لا تصلح لشيء من هذا البول ولا القِذر، إنما هي لذكر الله، والصلاة، وقراءة القرآن. أو كما قال رسول الله -ﷺ-. قال: فأمر رجلا من القوم فجاء بدلو من ماء فشنه عليه. م - ٢/٣٤٣/٣٥٤. ح - ١/٢٨٤.

تەرجەمە:

ئەنەس - رضي الله تعالى عنه - ئەفەرموێ: لە وەختێکا کە لە مزگەوتا لە خزمەت پێغەمەرا -ﷺ- دانیشتبووین عەرەبێکی بەڕانی هات راوەستا دەستی کرد بە میزکردن لە مزگەوتەکەدا، ئەصحابی پێغەمەر -ﷺ- تێیان خوڕی؛ فەرموویان: مەکە، مەکە! پێغەمەر -ﷺ- فەرمووی: وازی لێبێنن میزەکەی پێمەبڕن. وازیان لێ هێنا تا میزەکەی کرد، لە پاشا پێغەمەر -ﷺ- بانگی کرد پێی فەرموو: ئەم مزگەوتانە بۆ میزکردن و پیسایی و شتی بێ مەعنا دروست نەکراون، بۆ ئەو نەوعە شتانە ناگونجێن، بۆ ذیکرو، بۆ نوێژو، بۆ خوێندنی قورئان دروست کراون، یا شتێکی وای فەرموو. لە پاشا فەرمووی بە یەکێ لە ئەصحاب دۆلکەیێ ئاوی هێنا کردیان بەسەر میزەکەدا.

ئەم نەوعە ریوایەتە لە موسلیما زۆرە.

صیانەتی مزگەوت لە پیسی و شتی موستەقذەرو هەروا شتی بێ مەعنا فەرزە.

کەسێ بە جاهێڵی ئیشێکی بێ مەعنای کرد ئەبێ بە حوسنی موعامەلە مەنع بکرێو زەرەری ئەو شتەی تێ بگەیێنرێ.
کە مزگەوت تەلویث کرا ئەبێ دەزبەجێ پاك بکرێتەوە.

## بـول الصبيـــان[1]

١٧٢٣/٦٥ـ عن عائشة [رضي الله تعالى عنها] أن رسول الله ـﷺـ كانَ يؤتى بالصبيان فيبرك عليهم ويحنكهم. فأتي بصبي فبال عليه، فدعا بماء فأتبعه بوله ولم يغسله. م ـ ٢/٣٤٥. ح ـ ١/٢٨٦. ن.

١٧٢٤/٦٦ـ عن أم قيس بنت مِحْصَن ـ رضي الله تعالى عنها ـ أنها أتت بابن [صغير] لها لم يأكل الطعام إلى رسول الله ـﷺـ فأجلسه رسول الله ـﷺـ في حجره فبال على ثوبه، فدعا بماء فنضحه ولم يغسله. ح ـ ١/٢٨٦. م ـ ٢/٣٤٦.

**تەرجەمە:**

عایشە ـ رضي الله تعالى عنها ـ ئەفەرموێ: منداڵیان ئەهێنایە خزمەت پێغەمەر ـﷺـ دوعای بەرەکەتی بۆ ئەکردن و، گوشی ئەکردن. مناڵێکیان بۆ هێنا، میزی بەسەر جلەکانیا کرد، ئەمری فەرموو: ئاویان بۆ هێناو بەسەریا پرژان و نەیشت.

حەدیثی (أم قیس)یش وایە ئەوەی زیادە کە مناڵەکە طەعامی نەخواردبو. میزی مناڵی نێرینەی شیرەخۆرە کە ئێشتا

(١) میزی مناڵ.

طەعامی نەخواردبێ شتنی پێ ناوێ. ئاولێپرژاننی بەسە.

**١٧٢٥/٦٧ـ عن حذيفة ـ رضي الله تعالى عنه ـ قال: رأيتني أنا والنبي ـﷺـ نتماشى فأتى سباطة قوم [مرمى الكناسة والتراب] خلف حائط [فبال قائما. أخرى] فقام كما يقوم أحدكم فبال، فانتبذت منه، فأشار إليَّ فجئته فقمت عند عقبه حتى فرغ [ثم دعا بماء فجئته بماء فتوضأ] ح ـ ١/ ٢٨٧/ ٨. م ـ ٢/ ٣٠٩. وفيه: فمسح خفيه. د، ت، ن. جه.**

**تەرجەمە:**

حوذەیفە ـ رضي الله تعالى عنه ـ ئەفەرموێ: لە پێش چاومە کە من و پێغەمەر ـﷺـ ئەڕۆیین. پێغەمەر ـﷺـ تەشریفی چوە سەرەنگوێلکی قەومێ، لە پشت دیوارێکەوە وەك ئێوە ڕائەوەستن بۆ بەولکردن ئەویش وا تەشریفی ڕاوەستاو بە پێوە بەولی کرد. من لێی دوورکەوتمەوە ئیشارەتی کردم، چووم لە پشتیەوە ڕاوەستام، لە پاشا ئاوی ویست بۆم بردو دەزنوێژی شت لەسەر مەسحەوە مەسحی کرد.

بە پێوە میزکردن، ئەگەر لە پرشك نەترسێ، دروستە.

لە خەڵق دوورکەوتنەوە سوننەتە.

کردنی ئینسان بە حائیل دروستە.

**١٧٢٦/٦٨ـ عن أبي وائل قال: كان أبو موسى الأشعري [رضي الله تعالى عنه] يشدد في [الاحتراز] عن البول ويقول:**

**إن بني إسـرائيل كان إذا أصاب ثوب أحدهم قرضه. فقال حذيفة [رضي الله تعالى عنه]:ليته أمسك. أتى رسول الله -ﷺ- سباطة قوم فبال قائما. ح - ١/ ٢٨٨.**

**تەرجەمە:**

ئەبوموسای ئەشعەریی - رضي الله تعالى عنه - زۆری تەشدید ئەکرد لە خۆپارازتنا لە میز، ئەیفەرموو: بەنی‌ئیسرائیل میز لە جێیێکیان بپرژایە ئەو جێیەیان ئەبری. حوذەیفە - رضي الله تعالى عنه - فەرمووی: خۆزگە لەم شیددەتە وازی ئەهێنا. پێغەمەر -ﷺ- تەشریفی چوە سەرەنگوێلکی قەومێ بە پێیانەوە بەولی کرد. یەعنی دیارە کە پریشکی لێ ئەپرژێ. فەقەط پێغەمەر -ﷺ- دیارە خۆی پارازتوە. ئیحتیمالی هەیە ئەو جێیەی کە تەشریفی لێی راوەستاوە بەرزبووبێ، ئەمین بوە لەوە پریشکی لێ‌بپەڕێ. دەلالەت ناکا لەسەر ئەمە کەنەجاسەتی کەم زەرەر ناگەیێنێ (والله أعلم). مالیك: بەقەد نووکی دەرزی عەفوی لێ دراوە. حەنەفیی: لە هەموو نەجاسەتێکی کەم عەفودراوە. شافیعیی: ئەبێ کەم و زۆری بشۆررێ.

**٦٩/١٧٢٧- عن أنس [رضي الله تعالى عنه] قال: كان النبي -ﷺ- يصلي،قبل أن يبني المسجد،في مرابض الغنم ح- ١/ ٢٩٥. م- ٢/ ٤٣٦. ت، ن. وقد مر قريبا بأبسط.**

**تەرجەمە:**

پێغەمەر -ﷺ- لە پێش ئەمەدا کە مەسجیدی نەبەویی بینا بکا،

لەجێ مۆڵی مەڕو بزن نوێژی ئەکرد. [دیارە ئەو جێیە خاڵی نیە لە میزو پشکڵی مەڕو بزن. ئەم حەدیثــە دەلالــەت لەســەر پاکییــان ئەکــا، تەئویلەکەی زۆر زەعیفە].

**١٧٢٨/٧٠ـ عن سليمان بن يسار قال: سألت عائشة [رضي الله تعالى عنها] عن المني يصيب الثوب فقالت: كنت أغسله من ثوب رسول الله ـﷺـ فيخرج إلى الصلاة وأثر الغسل في ثوبه بقع الماء. ح ـ ١/٢٩١. م ـ ٢/٣٥٠. د، ت، ن، جه. وفيه: وأنا أنظر الى أثر الغسل.**

**تەرجەمە:**

سولەیمانی کوڕی یەسار ئەفەرموێ: لەحەزرەتی عایشە ـ رضي الله تعالى عنها ـم پرسی: لە مەنی لە جلی ئینسان ئەکەوێ. [پاکە یا پیسە؟] فەرمووی: من مەنیم لە جلی پێغەمەر ـﷺـ ئەشت تەشریفی ئەچوو بۆ نوێژ ئەثەری شتنەکەی پەڵەپەڵە بە جلەکەیەوە بو [تەماشای ئەثەری جێ شتنەکەییم ئەکرد. م]

**١٧٢٩/٧١ـ عن عائشة [رضي الله تعالى عنها] قالت: كنت أفركه من ثوب رسول الله ـﷺـ م ـ ٢/٣٤٩.**

**١٧٣٠/٧٢ـ عبد الله بن شهاب الخولاني قال: كنت نازلا على عائشة ـ رضي الله تعالى عنها] فاحتلمت في ثوبيّ، فغمستها في الماء فرأتني جارية لعائشة [رضي الله تعالى عنها] فأخبرتها، فبعثت إليّ عائشة [رضي الله تعالى عنها] فقالت: ما حملك على ما صنعت بثوبيك؟ قال: قلت: رأيت مايرى النائم في منامه. قالت: هل رأيت فيهما شيئا؟ قلت: لا. قالت: فلو رأيت شيئا غسلته؟ لقد رأيتني واني لأحكه من ثوب**

رسول الله -ﷺ- يابسا بظفري. م - ٢/٣٤٩/٣٥٠.

**تەرجەمە:**

عائیشـــە - رضي الله تعـــالى عنهـا - ئەفـەرمـوێ: مەنییم لە جلی پێغەمەر -ﷺ- ئەپروان.

عەبدوڵلای کوڕی شەهابی خەولانی - رحمه الله - ئەفەرموێ: لە خزمەت حەزرەتی عایشەدا بە موسافیریی دابەزیی‌بووم، لە جلەکانما ئیحتیـلام بووم، لە ئاوم هەڵکێشـان، کارەکـەرێکی حەزرەتی عایشـە - رضي الله تعالى عنها - دیمی، خەبەری دا بە حەزرەتی عایشە - رضي الله تعـــالـی عنـهـــا - ناردیـــە لام: بۆ جلەکـــانـت لە ئاو هەڵکێشـــا؟ عەرزم کرد: شتـێـکی وام دی کە ئینسـانی نوستـــوو ئەیبینێ [یـــەعنی ئیحتیلام بووم]. حەزرەتی عایشە - رضي الله تعالى عنها - فەرمووی: هیچت دی بە جلەکـــانتـــەوە؟ عەرزم کرد:خەیـــر. فەرمـــووی: ئەگـەر شتێکیشت پیوە ببینیایە بۆچ هەر ئەتشت؟ [شتنی لازم نیە چونکی] وام خۆ ئەدی کە =لە= جلی‌پێغەمەر -ﷺ- م بە نینۆکم ئەکران [نەمەشت].

لای ئیمامی شافیعیی - رضي الله تعالى عنه - مەنیی ئینسان و حەیـــوانێ کە گۆشتی بخـــورێ پاکـــە؛ چونکی ئەصڵی ئینســـان و ئەو حەیوانە پاکەیە، ئەصڵێ پاك پاکە. لای ئیمامی مالیك و ئەبوحەنیفە - رضي الله تعالى عنهما - پیسە. ئیمامی ئەعظەم ئەفەرموێ: بە تەڕیی ئەشۆررێ، بە وشکیی گلۆفتنی کافیە.

ئیمامی =مالیك= ئەفەرموێ: تەڕو وشکی ئەبێ بشۆررێ. ئیمامی ئەحمـــەدیش ئەفـەرمـوێ: بە وشکیی پروانني کافیـە. مەنیی حەیـوانی

تریش ـ غەیـــری سەگ و بەرازو ئەوی لە یەکـــێ لەوان بووبـــێ، با گۆشتیشی نەخورێ ـ لای قەولی ئەصەح ئەویش پاکە ئەمما چونکی مەنیی موطلەقـا وەکـو چڵم و بەڵغـەم بێـزی لێ‌ئـەکـرێ بۆیـە حەزرەتی عائیشە ـ رضي الله تعالى عنها ـ بەعزێ وەقت شتوویەتی. کە وشك بوویێتـەوە بەعـزێ وەقت کرانـوویـەتی. بەعـزێـك ئەڵێ: با گۆشتیشی بخورێ مەنیەکەی پیسە. بەعزێ عولەما فەرقیان کردوە هی (مأکول اللحم)[1] پاکە، هی غەیری (مأکول اللحم) پیسە. نەوەویی.

زوهریی ئەفەرموێ: ئاو پیسایی بکەوێتە ناو تا تامی، یا رەنگی، یا بۆنی نەگـۆڕرێ پیس نابێ. حەممـاد ئەفـەرمـوێ: پەڕی مـردارەوەبوو پاکـە. زوهـری ئەفـەرمـوێ: ئێسقـانی مردارەوەبـوو پاکـە. لە عولەمای سەلـــەف گەلێکم دیـوە شانـەی ئێسکی فیلیـان لە عەمـەل هێنـاوە. لە ظەرفی عاجـا بە رۆنی بۆنخـۆش خۆیـان هەنـــووە. ئیبن وسیـــرین و ئیبـــراهیمی نەخـەعیی ـ رحمهمـا الله ـ ئەفـەرمـوون: تیجـارەتی عاج دروستە. ح ـ ١/٢٩٥.

**١٧٣١/٧٣ـ عن میمـونـة ـ رضي الله تعـالى عنهـا ـ أن رسـول الله ـ ﷺ ـ سئـل عن فأرة سقطت في سمْن، فقـال: ألقوها وما حولها واطرحوه وكلوا سمنكم. ح ـ ١/٢٩٦. د، ت، ن. ح ـ ٨/٢٨٢. [وإن كان مائعـا فلا تقربوه. عبد الرزاق. وان كان مائعا فاستصبحوا به وانتفعوا به.]**

---

(١) واتە: حەیوانێ گۆشتی بخورێ.

**تەرجەمە:**

حەزرەتی مەیمـوونـە ـ رضي الله تعـالی عنهـا ـ ئەفـەرمـوێ: لە پێغـەمـەر ـﷺ ـ یان پرسی: رۆنێ [کی تونـد] مشکی بکـەویتـە ناو [تیـابمـرێ پیسـە یا پاکـە؟] فەرمـووی: مشکـەکـەو ئەطـرافی مشکەکە [یـەعنی ئەوەی تەمـاسی مشکـەکـەی کردوە] فڕێی بدەن و رۆنـەکـەتان بخۆن. [ئەمما ئەگەر ئەو رۆنە (مثلا) شل بێ پیس ئەبێ. خواردنی دروست نیە. لای شافیعیی ـ رضي الله تعالی عنه ـ نایشفرۆشرێ. ئەمما دروستە ئینتیفاعی پێ بکرێ؛ بکرێ بە مۆم، بە صابوون. لای ئیمامی ئەعظەم ئەیشفرۆشرێ.]

**١٧٣٢/٧٤ـ أبـو هريـرة ـ رضي الله تعـالی عنـه ـ سمع رسول الله ـﷺ ـ يقول: لا يبولنّ أحدكم في الماء الدائم الذي لا يجري ثم يغتسل فيه. حـ ٢٩٧/١. م ـ ٢/٣٣٧. د، ت، ن، جه.**

**تەرجەمە:**

پێغەمەر ـﷺ ـ فەرمووی: هیچ کەسێ لە ئێوە میز نەکاتە ناو ئاوێکی راوەستاو کە لە بەری نەڕوا [یەعنی بەو شەرتە لە (قلتین) کەمتر بێ] لە پاشا غوسڵی تیا بکا. [یەعنی یا دەزنوێژی پێ بشوا، یا شتی تری پێ بشوا]. **وعن جابر أيضا نحوه. م ـ ٢/٣٣٤.**

**وعن(١) أبي هريرة ـ أيضا ـ: لا يغتسل أحدكم في الماء =الدائم= وهـو جنب، فقـال أبـو السـائب: كيف يفعـل يا أبا هريرة؟ قال: يتناوله تناولا. م ـ ٢/٣٣٩.**

(١) دانەر ـ خ ـ ژمارەی بۆ ئەم حەدیثە دانەناوە.

تەرجەمە:

پێغەمەر -ﷺ- فەرمووی: هیچ کەسێ لە ئێوە لە ناو ئاوی راوەستاوا غوسڵ نەکا. ئەبوسائیب فەرمووی: یا ئەبوهورەیرە ئەی چی بکا؟ فەرمووی: لە ئاوەکە هەڵبگرێو بیکا بە خۆیا.

**١٧٣٣/٧٥ـ عن ابن عباس [رضي الله تعالى عنهما] قال: تصدق على مولاة لميمونة بشاة فماتت، فمرَّ بها رسول الله -ﷺ- فقال: هلا أخذتم إهابها فدبغتموه فانتفعتم به! فقالوا: إنها ميتة. فقال: إنما حرم أكلها. م ـ ٢/٤٣٩. ح ـ ٧/٧٣.**

تەرجەمە:

مەڕی لە صەدەقە درا بە جارییەیەکی ئازادکراوی مەیموونە ـ رضي الله تعالى عنها ـ مەڕەکە مرد [فڕێیان دا] پێغەمەر -ﷺ- تەشریفی بە لایا رابورد، فەرمووی: بۆچی پێستەکەتان نەگوروەو لێی (منتفع) بن؟ عەرزیان =کرد=: مرداڕەوە بوە. فەرمووی: هەر خواردنی حەرامە.

**١٧٣٤/٧٦ـ وعنه قال: سمعت رسول الله -ﷺ- يقول: إذا دبغ الإهاب فقد طهر. م ـ ٢/٤٤١.**

تەرجەمە:

پێست کە دەباغ کرا پاك ئەبێتەوە.

**١٧٣٥/٧٧ـ أبو الخير قال: رأيت على ابن وعلة السبئي فروا، فمسسته، قال: ما لك تَمَسُّه؟ قد سألت عبد الله بن عباس [رضي الله تعالى عنهما] قلت: إنا نكون بالمغرب ومعنا البربر والمجوس نؤتى بالكبش قد ذبحوه ونحن لا نأكل ذبائحهم، ويأتوننا بالسقاء يجعلون فيه**

الودك. فقال ابن عباس [رضي الله تعالى عنهما]: قد سألنا رسول الله ـﷺـ عن ذلك، فقال: دِباغه طَهوره. م ـ ٢/٤٤٢.

تەرجەمە:

ئەبولخەیر ئەفەرموێ: لە بەر ئیبن و وەعلەی سەبەئیيا كەوڵێكم دی، دەستم لێدا، فەرمووی: بۆ دەستی لێ ئەدەی؟ لە عەبدوڵڵای كوڕی عەباس [رضي الله تعالى عنهما]م پرسی عەرزم كرد: ئێمە لە مەغریب ئەبین، بەربەرو مەجووسمان لەگەڵە، بەرانی سەربراومان بۆ ئەهێنن، ئێمە ئەوی كە ئەوان سەری ببڕن نایخۆین، هیزە ڕۆنمان بۆ ئەهێنن. ـ یەعنی ئەو گۆشت و ڕۆنە ئەخورێن یان نا؟ ـ فەرمووی: لە پێغەمەر ـﷺـ مان پرسی؛ فەرمووی: دەباغكردنی پاكبوونەوەیەتی.

١٧٣٦/٧٨ـ عن سودة [رضـي الله تعـالـى عنـهـا] زوج النبي ـﷺـ قالت: ماتت لنا شاة فدبغنا مسكها، ثم مازلنا ننتبذ فيها حتى صارت شنًا [قربة خلقة] م ـ ٢.

تەرجەمە:

سەودە ـ رضـي الله تعـالـى عنهـا ـی حەرەمی پێغـەمـەر ـﷺـ فەرمووی: مەڕێكمان بوو مرد، پێستەكەمان دەباغ كرد هەر نەبیذمان تیا ئەكرد، تا بوو بە مەشكاڵەو ڕزی.

دەباغ شت پاك ئەكاتەوە؟ خیلافێكی بێ سامانی تیایە (راجع نووي).

١٧٣٧/٧٩ـ عن أنس قال: بزق النبي ـﷺـ في ثوبه. ح ـ ١ ـ ٣٠٢.

**تەرجەمە :**

پێغەمەر ـ ﷺ ـ تفی کردە ناو لیباسیەوە. [تف پاکە].

**مسور ومروان . . . إذا توضأ النبي ـ ﷺ ـ كادوا يقتتلون على وضوئه .**

ح ـ ١/٢٦٥ .

[. . . . . .] میسوەر ئەفەرموێ: کە پێغەمەر ـ ﷺ ـ دەزنوێژی ئەشت لەسەر ئاوی دەزنوێژی نزیك بوو شەڕ بکەن.

١٧٣٨/٨٠ـ عەبدوڵڵای بنی مەسعوود ـ رضي الله تعالى عنه ـ ئەفەرموێ: پێغەمەر ـ ﷺ ـ لای بەیتەوە نوێژی ئەکرد، ئەبوجەهل و رەفیقەکانی دانیشتبوون بەعزێکیان بە بەعزێکیانی وت [ئەبوجەهل بەوانی تری وت]: کێ ئەچێ ئەو پەردە کە بێچوولەی وشتری تیا ئەبێ لە وەختی زایینیا هی ئەو وشترەی کە فلانەکەس سەری بریوە ئەیهێنێ ئەیخاتە سەر پشتی محەمەد کە سوجدەی برد؟ شەقیی‌ترینی ئەو قەومە [کە عوقبەی بنی ئەبی موعەیطە، باوەپیارەی حەزرەتی عوثمان ـ رضي الله تعالى عنه ـ (فسبحان الله) ئیمامی عوثمان ـ رضي الله تعالى عنه ـ کانی حەیا بوە عوقبە چەندە بێ‌حەیا بوە؟!] فرکەی کردو چوو هێنای، مونتەظیر بوو تا پێغەمەر ـ ﷺ ـ چوە سوجدە ئەو وەختە خستیە سەر پشتی، لە بەینی هەردوو شانی موبارەکیا.

[ئیبن و مەسعوود ـ رضي الله تعالى عنه ـ ئەفەرموێ: منیش تەماشام ئەکرد، هیچم لە دەست نەئەهات تا مەنعیان بکەم، کاشکی شتێکم پێ بکرایە! ئەوانیش پێ‌ئەکەنین و بەلادا ئەهاتن، ئەو ئیشە قەبیحەیان ئەهاویتە سەر یەکتری. پێغەمەر ـ ﷺ ـ لە سوجدەدا بوو سەری هەڵنەبڕی تا حەزرەتی (فاطمة الزهرا) [کە گەورەی هەموو ژنانی

ئەم ئوممەتەیە] تەشریفی هات ئەو پیسایی‌یەی لەسەر پشتی موقەددەسی فڕیدا. ڕووی کردە قەومەکەو جوێنی پێدان، هیچیان جوابی نەدایەوە].

ئەو وەختــە پێغــەمــەر -ﷺ- سەری لە سوجـدە هەڵبـری لە پاشـا فەرمووی: خوایا کوففاری قورەیش حەواڵە بەتۆ بن، تا سێ دەفعە وای فەرموو. [پێغەمەر -ﷺ- کە دوعای بکردایە سێ دەفعە دوعای ئەکرد، شتی طەلــەب بکــردایـە سێ جار طەلـەبی ئەکـرد. دەنگی پێغـەمـەر -ﷺ- یان بیست پێکـەنینـەکـەیـان برایـەوەو لە دوعـاکەی ترسان. م] لە بەریان ناخۆش بوو کە دوعای لێ کردن.

[ئیبن ومەسعوود - رضي الله تعالى عنه -] ئەفەرموێ: ئیعتیقادیان وا بوو کە دوعاکردن لەو شارەدا قەبووڵ ئەبێ. [یەعنی ترسەکەیان لەبەر ئەوە بوو، لەبـەر خوصـووصی دوعـای پێغـەمـەر -ﷺ- نەبـوو؛ چونکی ئیمـانیـان پێی نەبـوو، فەقـەط لە (نفس الأمـر)ا هیـچ شوبهـە نیـە کە قەبووڵی دوعاکەی هیچ سەبەبی تری نیە غەیری موعجیزەی پێغەمەر -ﷺ-].

لە پاش ئەو دوعــای عومـــوومیـــە بە خوصـــووصـیی ناوی بردن. فەرمـووی: خوایـا ئەبـوجـەهل لەسەر تۆبێ بە هیلاکی بەری، عوتبەی کوڕی ڕەبیعە لەسەر تۆ بێ، بۆ شەیبەی کوڕی ڕەبیعەو، وەلیدی کوڕی عوتبـەو، ئومـەییـەی کوڕی خەلـەف و، عوقبـەی کوڕی ئەبوموعەیط و، حەوتـەمیـان، کە ڕاویی لە فکـری چوەتـەوە کە کێیـە، بەو نەوعە ناوی بردن و دوعای لێ کردن.

ئیبن ومەسعوود - رضي الله تعالى عنه - ئەفەرموێ: قەسەم بەوەی نەفسم بە دەستی قودرەتیـەتی چاوم کەوت بەوانـەی کە پێغـەمـەر -ﷺ-

ناوی بردن هەموویان لە ناو بیری بەدرا لیێ کەوتبوون!

ئەم حەدیثــەم رەنگــە لە موعجیــزاتــا نووسیبێ بۆیــە مەتنــەکــەییم نەنووسی، لێرەدا بۆیە تەرجەمەکەم نووسی چونکی دەلالەت ئەکا لەسەر ئەمــە کە حەیــوانی پاك هەرچی لە ناوسکیــا بێ پاکــە. فەقــەط ئەم حادیثەیە لە مەکەدا بوە. حەدیثی ١٧٢١/٦٣ م ـ ٢/٤٣٦ لە مەدینەدا بوە. کێ کێی کوشت لە غەزەواتا رابورد. ح ـ ١/٣٠٠. م ـ ٢/٤٣٣.

**٨١/١٧٣٩ـ عن أبي موسى [رضي الله تعالى عنــه] قال: أتيت النبي ـﷺـ فوجدته يستن بسواك بيده، يقول: أع، أع، والسواك في فيه كأنه يتهوّع. ح ـ ١/٣٠٤. م ـ ٢/٢٨١. د، ن.**

**تەرجەمە:**

پێغەمەر ـﷺـ م دی[1] سیواکی لە عەمەل ئەهێنا سیواکەکەی بەدەستەوە بوو لە دەمیا بوو وەك هێڵنج بدا ئەیفەرموو: ئوع، ئوع.

**٨٢/١٧٤٠ـ عن حذيفة [بن اليمان ـ رضي الله تعالى عنه ـ] قال: كان النبي ـﷺـ إذا قام من الليل [ليتهجد. م] يشوص فاه بالسواك. حـ ١/٣٠٥. د، ن، جه. م ـ ٢/٢٨٢.**

**تەرجەمە:**

حوذەیفە ـ رضي الله تعالى عنه ـ ئەفەرموێ: پێغەمەر ـﷺـ کە شەو تەشریفی لە خەو هەڵەستا =بۆ شەونوێژ= سیواکی دەمی ئەکرد.

(١) دانەر ـ خ ـ سەرەتای باسەکەی تەرجەمە نەکرد کە بەم جۆرەیە: ئەبو مووسا ـ خ ـ ئەفەرموێ: چوومە خزمەت پێغەمەر ـ د ـ ...

١٧٤١/٨٣ـ عن ابن عُمــر [رضي الله تعــالى عنهمـا] أن النبي ـ ﷺ ـ قال: أراني أتسـوك بسـواك، فجـاءني رجـلان أحدهما أكبر من الآخر، فنـاولت السـواك الأصغـر منهمـا، فقيـل لي: كبِّـر، فدفعتـه إلى الأكبر منهما. م ـ ١٢٩/٩. م ـ ٤٤٠/١٠. ح ـ ٣٠٥/١.

تەرجەمە:

ئیبن وعومەر ـ رضي الله تعالى عنهما ـ ئەفەرموێ: پێغەمەر ـ ﷺ ـ فەرمووی: شەوێ لە خەوما بە سیواكێ سیواكم ئەكرد، دوو كەس هاتنە لام؛ یەكێـكیـان لە یەكێكیـان گەورەتـر بوو، سیـواكـەكـەم دا بە بچووكەكەیان، پێیان وتم: لە گەورەوە دەست پێ‌بكە. سیواكەكەم دا بە گەورەكەیان.

١٧٤٢/٨٤ـ عن المقدام بن شريح قال: سألت عائشة [رضي الله تعالى عنها] قلت: بأي شيء كان يبدأ النبي ـ ﷺ ـ إذا دخل بيته؟ قال: بالسواك. م ـ ٢/ ٢٨٠.

١٧٤٣/٨٥ـ عن أبي هريرة [رضي الله تعالى عنه] عن النبي ـ ﷺ ـ قال: لولا أن أشـق على الـمؤمنين ـ وفي حديث زهيـر: على أمتي ـ لأمــرتهم بالسواك عند كل صلاة. م ـ ٢/ ٢٨٠.

تەرجەمە:

میقدامی كوڕی شورەیح ئەفەرموێ: لە حەزرەتی عائیشە ـ رضي الله تعالى عنها ـ م پرسی: پێغەمەر ـ ﷺ ـ كە تەشریفی ئەهاتەماڵەوە لە پێش هەموو شتا دەستی بە چی ئەكرد؟ فەرمووی: بە سیواك.

ئەبـوهـورەیـرە ـ رضي الله تعـالى عنـه ـ ئەفەرموێ: پێغەمەر ـ ﷺ ـ

فەرمووی: ئەگەر لەسەر موئمینان ـ لە ریوایەتێکا ئەگەر لەسەر ئوممەتم ـ بەزەحمەتم نەزانیایە بۆ کوللی نوێژێ ئەمرم بە سیواککردن پێ‌ئەکردن.

**٨٦/١٧٤٤ـ ابن عباس ـ رضي الله تعالى عنهما ـ حدَّث أنه بات عند نبي الله ـﷺـ ذات ليلة، فقام نبي الله ـﷺـ من آخر الليل فخرج فنظر إلى السماء ثم تلا هذه الآية في آل عمران: ﴿إن في خلق السماوات والأرض، واختلاف الليل والنهار...﴾ حتى بلغ ﴿فقنا عذاب النار﴾ [أي ﴿لآيات لأولي الأباب الذين يذكرون الله قياما وقعودا وعلى جنوبهم ويتفكرون في خلق السماوات والأرض، ربنا ماخلقت هذا باطلا سبحانك فقنا عذاب النار﴾[1]] ثم رجع إلى البيت فتسوك وتوضأ، ثم قام فصلى، ثم اضطجع، ثم قام فخرج فنظر إلى السماء فتلا هذه الآية. ثم رجع فتسوك فتوضأ ثم قام فصلى. م ـ ٢/٢٨٢.**

**تەرجەمە:**

ئیبن وعەباس ـ رضي الله تعالى عنهما ـ ئەفەرموێ: شەوێ لە خزمەت پێغەمەرا ـﷺـ مامەوە. پێغەمەر ـﷺـ لە ئاخری شەوا تەشریفی هەڵسا چوەدەرێ تەماشای ئاسمانی کرد، ئەم ئایەتی ئالی عیمرانەی خوێندەوە کە تەرجەمەی وایە: بە تەحقیق لە خەلقکردنی ئەرزو ئاسماناو ئیختیلافی شەوو رۆژا کە تەعقیبی یەکتری ئەکەن و، گاه شەوکورت ئەبێ و گاه رۆژ کورت ئەبێ، گەلێ دەلیلی لەسەر وجوودو عیلم و ئیرادەو قودرەت و سائیری صیفاتی ذاتیەو جەلالیەو

(١) آل عمران/ ١٩٠، ١٩١.

جەمالیەی تیایە بۆ ئەوانەی صاحیب عەقل و صاحیب مەغزو ناوکدارن، پووچ نین، ئەوانەی بە پێیانەوەو بە دانیشتنەوەو بە پاڵکەوتنەوە ذیکری خوا ئەکەن، و تەفەکور لە خەلقی ئەرزو ئاسمان ئەکەنەوە، یەعنی ئیستیدلال بە مەصنووعات ئەکەن لەسەر صانیع و کەمالی صنعەتەکەی ئەڵێن: یا رەببی تۆ بە خۆڕایی و بێ حیکمەت ئەمەت خەلق نەکردوە، تەنزیهـ وتەقدیسی تۆ ئەکەم، لە هەموو نیشانەی نەقص، کە وابێ لە ئاگری جەهەننەم حیفظم بکە. ئەمجا تەشریفی هاتەوە ژوورێو سیواکی کردو دەزنوێژی شت و نوێژی کردو نوست، لە پاشا تەشریفی هەڵسا چوە دەرێ تەماشای ئاسمانی کرد ئەم ئایەتەی خوێندەوە، لە پاشا گەڕایەوە سیواکی کردو دەزنوێژی شت و راوەستاو نوێژی کرد.

**١٧٤٥/٨٧- عن أبي هريرة [رضي الله تعالى عنه] عن رسول الله -ﷺ- أنه قال: الفطرة خمس: الإختتان، والإستحداد، وقص الشارب، وتقليم الأظفار، ونتف الإبط. م - ٢/٢٨٣. ح - ٨/٤٤٨/٤٤٩. بتقديم وتأخير بعض على بعض.**

**١٧٤٦/٨٨- عن أنس - رضي الله تعالى عنه - أنه قال: وقت لنا في قص الشارب، وتقليم الأظفار، ونتف الإبط، وحلق العانة أن لا تترك أكثر من أربعين ليلة. م - ٢/٢٨٨.**

**تەرجەمە:**

ئەبوهورەیرە - رضي الله تعالى عنه - ئەفەرموێ: پێغەمەر -ﷺ- فەرمووی: فیطرەتی ئیسلام پێنجە: خەتەنەکردن. مووی (ظهار)[1]

(١) مووی بەر.

تاشین [بە گوێزان یا بە دەرمان] نینۆك كردن، بەرسمێڵ كردن، مووی بن باخــەڵ هەڵكـەنـدن. ئەنـەس ئەفـەرمـوێ: وەختی ئەمـانـەمـان بۆ تەعیین كراوە كە لە چل رۆژ تێپەڕ نەكرێ.

**١٧٤٧/٨٩ـ عن عائشة [رضي الله تعالى عنها] قالت: قال رسول الله ـﷺـ: عشر من الفطرة: قص الشارب، وإعفاء اللحية، والسواك، واستنشاق الماء، وقص الأظفار، وغسل البراجم، ونتف الإبط، وحلق العانة، وانتقاص الماء، قال زكريا: قال مصعب: ونسيت العاشرة إلا أن تكون المضمضة. زاد قتيبة: قال وكيع: إنتقاص الماء، يعني الاستنجاء. م ـ ٢/٢٩١.**

**تەرجەمە:**

عایشــە ـ رضي الله تعــالی عنهــا ـ فەرمــووی: پێغـەمـەر ـﷺـ فەرمـووی: دە شت لە فیطـرەتـە [پێنجی لە ئەبـوهـورەیـرە زیاد كردوە]: ئاولەدەم وەردان كە موصعەب لە فكری چوەتەوە، جومگەی پەنجەی، ئاو كەم لەعـەمـەل هێنـان، ریش بەردانـەوە، خەتـەنەی تەرك كردوە ئاو لەلـووت وەردان، سیـواك كردن، ئەوی موصعـەب لە فكـری چوەتـەوە رەنگە خەتەنە بێ[1].

**١٧٤٨/٩٠ـ عن سلمـان [رضـي الله تعـالـى عنـه] قال: قال لنـا المشركون: إني أرى صاحبكم يعلمكم حتى يعلمكم الخراءة! فقال:**

---

(١) دانـەر ـ خ ـ لە تەرجـەمـەی ئەم حەدیثـەدا پێنجـەكـەی كە لە حەدیثی پێشـوودا تەرجەمە كرد.. بوارد. زیاد لەوەیش تەرجەمەكەی زۆر رەوان نیەو، (جومگەی پەنجەی) ـ كە لە تەرجەمەكەدایە ـ باش مانای نایێت و دەبێ كەوتنی تیا بێت.

أجل إنه نهانا أن يستنجي أحدنا بيمينه، أو يستقبل القبلة، ونهانا عن الـروث والعظـام، وقـال: لايستنجي أحـدكم بدون ثلاثـة أحجـار. م ـ ٢٩٨/٢. قال: قيـل له: قد علمـكـم نبـيكـم ـ ﷺ ـ كل شيء حتـى الخراءة. والباقي نحوه م ـ ٢٩١/٢.

تەرجەمە:

سەلمـــان ـ رضي الله تعـــالى عنـــه ـ ئەفەرموێ: موشـريكـان پێیان وتم: وا ئەبینم کە پێغەمەرەکەتان ـ ﷺ ـ هەموو شتێکتان فێر ئەکا، حەتتا چوونەسەراویشتان فێر ئەکا! سەلمان ـ رضي الله تعالى عنه ـ فەرمـــووی: وتم: بەڵێ نەهی لێ‌کـردووین کە لە سەراوا روو بکـەینـە قیـبـلە، یا بە دەسـتـی راسـت تارەت بگـریـن، یا بە (رەوث)[1] یا بە ئێسقان ئیستینجا بکەین، یا بە کەمتر لە سێ بەرد ئیستینجا بکەین.

٩١/١٧٤٩ـ عن أبي هريرة [رضي الله تعالى عنه] أن رسول الله ـ ﷺ ـ قال: اتَّقوا اللَّعانَيْن. قالوا: وما اللعانان يارسول الله؟ قال: الذي يتخلّى في طريق الناس أو في ظلهم. م ـ ٣٠٤/٢.

تەرجەمە:

پێغـەمـەر ـ ﷺ ـ فەرمـووی: خۆتـان لە دوو لەعنـەت کەر بپارێزن. عەرزیـان =کـرد=: ئەو دوو لەعنەتکەرە کێن؟ فەرمـووی: =ئـەوانەن= ئەچن لە سەرەرێی خەڵق یا لە سێبەریانا دائەنیشن ئیشی سەراو ئەکەن. [ئەڵێن: لەعنەت لەوە بێ کە ئەم پیسایی‌یەی کردوە].

(١) رەوث: شیاکە.

٩٢/١٧٥٠ـ عن أبي هريـرة [رضي الله تعـالى عنـه] قال: قال رسـول الله: جزّوا الشوارب وأرخوا اللحى، خالفوا المجوس. م ـ ٢/٢٨٩.

عن ابن عمـر [رضي الله تعـالى عنهمـا] عن النبي ـﷺـ [خـالفـوا المشركين. أخرى. م] أحفوا الشوارب، وأعفوا اللحى. م ـ ٢/٢٨٩.

تەرجەمە:

پێغـەمـەر ـﷺـ فەرمـوويـەتی: سمێـڵ لە كۆتەرە بدەن، ريش زۆر بكەن، بەوە موخالەفەی موشريك بكەن.

٩٣/١٧٥١ـ عن عقبة بن عامر ـ رضي الله تعالى عنه ـ قال: كانت علينا رعاية الإبل، فجاءت نوبتي فروحتها بعشي، فأدركت رسول الله ـﷺـ قائما يحدث الناس فأدركت من قوله: مامن مسلم يتوضأ فيُحْسن وضوءه ثم يقوم فيصلي ركعتين مقبل عليهما بقلبه ووجهه إلا وجبت له الجنة. قال: فقلت: ماأجود هذه! فإذا قائل بين يدي يقول: التي قبلها أجود. فنظرت فإذا عمر قال: إني قد رأيتك جئت آنفا. قال: مامنكم من أحد يتوضأ فيبلغ أو فيسبغ الوضوء ثم يقول: أشهد أن لا إله إلا الله [وحده لاشريك له. أخرى. م] وأن محمدا عبده ورسوله إلا فتحت له أبواب الجنة الثمانية يدخل من أيها شاء. م ـ ٢/٢٥١.

تەرجەمە:

عەقەبەی كوڕی عامير ـ رضي الله تعالى عنه ـ ئەفەرموێ: ئێمە شوانیی وشترمان لەسەر بوو بيكەين، نۆبەت هاتە سەر من، ئێوارێ وشتـرەكـانم بردەوە، بە پێغـەمـەرا ـﷺـ گەييم بە پێـوە بوو خوطبـەی بۆ خەڵق ئەخـوێنـد، لە فەرمـوودەی گەييم بەوەدا كە ئەيفـەرمـوو: هيـچ

موسوڵمانێ نیە کە دەزنوێژێکی باش و جوان بشواو راوەستێ و دوو رکاتت نوێـژ بکـاو بە دڵ و بە روو - روو بکـاتـە سەر ئەو دوو رکـاتـە [یـەعنی خەیـاڵـی شتـی تری نەبێ] کە جەننـەتی بۆ واجب نەبێ. عەقـەبـە ئەفەرموێ: وتم: چە شتێکی باشە! کەچی یەکێ لە بەردەممەوە وتی: ئەوی لە پێش ئەمەوە فەرمووی لەمە خۆشترە. کە تێفکریم ئەو کەسە ئیمامی عومەر بو - رضي الله تعالی عنه - فەرمووی: وا بزانم تۆئێستە هاتووی! پێغەمەر -ﷺ- لە پێش ئەمەوە فەرمووی: هیچ کەسێ نیە لە ئێـوە کە دەزنـوێـژ بشـواو دەزنـوێـژەکەی [بە فەرزو سوننەت و ئادابیەوە] بگەیێنێتە حەددی کەمال و لە پاشا بڵێ: (أشهد أن لا إله إلا الله وأن محمدا عبده ورسوله) هەر هەشت دەرگای بەهەشتی بۆ نەکرێتەوە، لە هەرکامێکی خۆی هەوەسی یێنێ بچێتە ژوورێ.

[خۆشترینی ئەم فەرموودەی ئەوەیە کە بە مەحزی دەزنوێژەکە بێ ئەمە نوێژی پێوە بکا هەموو دەرگای بەهەشتی بۆ ئەکرێتەوە، لە هەشت لاوە، مەلائیکە مونتەظیری ئەبن، نوێژکردنەکەی بۆی ئەبێ بە سەبەبی رەفعی دەرەجات].

لە ریوایەتەکەی ترا لە دوای (إلا الله)وە (وحده لاشريك له)ی زیادە.

**١٧٥٢/٩٤- عن أبي هريـرة [رضي الله تعـالى عنـه] أن رسول الله -ﷺ- قال: إذا توضأ العبـد المسلم أو المؤمن فغسـل وجهه خرج من وجهه كل خطيئة نظر إليها بعينيه مع الماء أو مع آخر قطر الماء، فإذا غسل يديه خرج من يديـه كل خطيئـة كان بطشتهـا يداه مع الماء أو مع آخر قطر الماء. فإذا**

**غسـل رجليـه خرجت كل حطئيـة مشتهـا رجـلاه مع المـاء أو مع آخر قطر الماء، قال: حتى يخرج نقيا من الذنوب. م ـ ٢ / ٢٦٧.**

**٩٥ / ١٧٥٣ـ عن عثمان بن عفان [رضي الله تعالى عنه] قال: قال رسول الله ـ ﷺ ـ: من توضأ فأحسن الـوضـوء خرجت خطـايـاه من جسـده حتى تخرج من تحت أظفاره، م ـ ٢ / ٢٦٨.**

**تەرجەمە:**

پێغەمەر ـ ﷺ ـ فەرمووی: عەبدی موسوڵمان، یا فەرمووی عەبدی موئمین، کە دەزنوێژی شت، کە دەم وچاوی شت هەر گوناهێ بە چاو تەماشای کردبێ لەگەڵ ئاوەکە، یا فەرمووی: لەگەڵ ئاخر قەترەی ئاوەکە ئەچێتە دەرێ. کە دەستی شت هەر گوناهێ بە دەست کردبێتی، کە پێـی شت هەر گونـاهـێ کە بە پێ بۆی چووبـێ لەگـەڵ ئاوەکـە یا فەرمووی: لەگەڵ ئاخر قەترەی ئاوەکە ئەچێتە دەرێ، فەرمووی: تا لە هەموو گوناه پاك ئەبێتەوە.

ئیمامی عوثمان ـ رضي الله تعالى عنه ـ ئەفەرموێ: پێغەمەر ـ ﷺ ـ فەرمـووی: هەرکـەسێ دەزنـوێـژێکی جوان =بشوا= هەموو گوناهی لە بەدەنیەوە ئەچێتە دەرێ، تا لە ژێر نینۆکیەوە ئەچێتە دەرێ.

ئەمما کەس بەوە مەغروور نەبێ؛ چونکی لە قورئاناو ئەحادیثی ترا ئیجتیناب لە کەبیرەی شەرت کردوە.

**٩٦ / ١٧٥٤ـ نعيم المُجْمِر [رحمـه الله تعـالى] قال: رأيت أبـا هريرة [رضي الله تعالى عنه] يتوضأ فغسل وجهه فأسبغ الوضوء، ثم غسل يده اليمنى حتى أشـرع في العضـد [أي أدخـل الغسـل فيه] ثم يده اليسرى**

**حتى أشرع في العضد، ثم مسح برأسه، ثم غسل رجله اليمنى حتى أشرع في الساق، ثم غسل رجله اليسرى حتى أشرع في الساق، ثم قال لي: هكذا رأيت رسول الله -ﷺ- يتوضأ. وقال: قال رسول الله -ﷺ-: أنتم الغُرُّ المُحجَّلون يوم القيامة من إسباغ الوضوء، فمن استطاع منكم فليطل غرته وتحجيله. م - ٢/٢٦٩.**

**تەرجەمە:**

نەعیمی موجمیر - رحمه الله - ئەفەرموێ: چاوم کەوت بە ئەبوهورەیرە دەزنوێژی ئەشت، دەم وچاوی شت بە تەواویی [یەعنی لە سەریشی دایە دەمی] لە پاشا دەستی راست و دەستی چەپی شت تا قۆڵیشی خستەسەر. لە پاشا مەسحی سەری کرد. لە پاشا هەردوو پێی شت، قاچیشی لە گەڵا شت. لە دواییدا پێی وتم: وام چاوکەوت بە پێغەمەر -ﷺ- دەزنوێژی ئەشت، ئەیشی فەرموو: کە پێغەمەر -ﷺ- فەرمووی: ئێوە لە رۆژی قیامەتا ناوچاوان نوورانیی و دەست وپێ نوورانین لەبەر ئاثاری دەزنوێژ، هەرکەسێ ئەتوانێ نووری ناوچاوانیو پێشەسەریو دەست و پێی تا بەرەوژوورتر ببا. [یەعنی زیاد لەوەی کە شتنی فەرزە بشوا، بە قەدەر ئەو زیادە زینەتی ئەعزای دەزنوێژی زیاد ئەبێ.]

**١٧٥٥/٩٧- عن أبي حازم [رحمه الله] قال: كنت خلف أبي هريرة [رضي الله تعالى عنه] وهو يتوضأ للصلاة فكان يمدُّ يده حتى يبلغ إبطه،**

**فقلت له: يا أبا هريرة ما هذا الوضوء؟ فقال: يا بني فروخ**[1] بۆ ئێوە لێرەن؟! ئەگەر بمزانیایە کە ئێوە لێرەن ئەم دەزنوێژەم نەئەشت. لە خەلیلی خۆمم ـﷺـ بیستوە ئەیفەرموو: زینەتی موئمین ئەگاتە ئەو جێیەی کە دەزنوێژی ئەگاتێ. م ـ ٢/٢٧٦.

**٩٨/١٧٥٦ـ عن أبي هريرة [رضي الله تعالى عنه] أن رسول الله ـﷺـ قال: ألا أدلكم على ما يمحو الله به الخطايا ويرفع به الدرجات؟ قالوا: بلى يا رسول الله. قال: إسباغ الوضوء على المكاره، وكثرة الخطا إلى المساجد، وانتظار الصلاة بعد الصلاة فذلكم الرباط. مـ ٢/٢٧٧.**

**تەرجەمە:**

پێغەمەر ـﷺـ فەرمووی: ئایا خەبەرتان بدەمێ کە بە چی خوا گوناە مەحو ئەکاتەوە [لە دەفتەری ئەو مەلائیکەی کە نووسیویەتی]و دەرەجەی ئینسان بڵند ئەکاتەوە؟ عەرزیان کرد: بەڵێ. فەرمووی: بە صەبرکردن لەسەر سەرما دەزنوێژی تەواوشتن و، هەنگاوی زۆر بۆ مزگەوت چوون [یەعنی مزگەوت تا دوورتر بێ خێری زیاترە] لە دوای نوێژکردنیش [لە مزگەوتا مانەوەو] مونتەظیربوونی نوێژێکی تر. (رباطی في سبيل الله) ئەوەیە [ئەوە وەك ئەوە وایە خۆیو ولاخ و ماڵی بۆ غەزا حەبس کردبێ.]

**٩٩/١٧٥٧ـ عن أنس [رضي الله تعالى عنه] قال: كان رسول الله**

(١) دانەر ـ خ ـ لێرەدا عەرەبیەکەی نەنووسیوە کە ئەمە دەقەکەیەتی: «أنتم ههنا؟ لوعلمت أنكم ههنا ما توضأت هذا الوضوء. سمعت خليلي ـﷺـ يقول: تبلغ الحلية من المؤمن حيث يبلغ الوضوء».

**-ﷺ- يتبرز لحاجته، فآتيه بالماء فيغتسل به. م ـ ٩/٣٠٧.**

**تەرجەمە:**

ئەنــەس ـ رضي الله تعــالى عنـه ـ ئەفـەرمـوێ: پێغـەمـەر -ﷺ- تەشريفی ئەچوو بۆ قەزای حاجەت، ئاوم بۆ ئەبرد خۆی پێ ئەشت.

**١٠٠/١٧٥٨ـ عن همام قال بال:جرير [رضي الله تعالى عنه] ثم توضأ ومسح على خفيه. فقيل: أتفعل هذا؟ قال: نعم رأيت رسول الله -ﷺ- بال ثم توضأ ومسح على خفيه. قال إبراهيم [الراوي] كان يعجبهم هذا الحديث؛ لأن إسلام جرير كان بعد نزول المائدة. مـ ٢/٣٠٨.**

**تەرجەمە:**

هەممام ـ رحمه الله تعالى ـ ئەفەرموێ: جەرير ـ رضي الله تعالى عنه ـ ميزی كرد، =دوایی= دەزنوێژ ی شت و مەسحی لەسەر مەسحەوە كرد، عەرزیان كرد: تۆ بۆ مەسح ئەكەی؟ فەرمووی: بەڵێ پێغەمەرم دی -ﷺ- بەولی كردو دەزنــوێــژ ی شت و مەسحی كرد. ئیبــراهیم كە یەكێكە لە راوییان ئەفەرموێ: خەڵق ئەم حەدیثی جەریرەیان ـ رضي الله تعالى عنه ـ لە لا خۆش بوو، چونكی جەرير ـ رضي الله تعالى عنه ـ دوای نوزوولی سوورەتی مائیدە ئیسلام بوە.

یەعنی ئەگەر جەرير ـ رضي الله تعالى عنه ـ لە پێش نوزوولی مائیدەدا موسوڵمان ببوایە ئیحتیمالی هەبوو كە بە ئایەتی دەزنوێژ كە ئەمر ئەكا بە شتنی پێی نەسخ بووبێتەوە، ئەمما چونكی دواكەوتوە لە نوزوولی ئایەتەكە ئەو حەدیثە بەیانی ئەوە ئەكا كە پێ شتن مەخصووصە بەو كەسەوە كە مەسحی لە پێدا نەبێ.

# كتـــاب الغســـل وما يوجبـــه[1]

(١) باسی خۆشۆردن و ئەو شتانەی بە پێویستی دەگێڕن.

١٧٥٩/١ـ عن أبي سعيد الخدري ـ رضي الله تعالى عنه ـ قال: خرجت مع رسول الله ـﷺـ يوم الإثنين إلى قباء حتى إذا كنا في بني سالم وقف رسول الله ـﷺـ على باب عِتبان فصرخ به، فخرج يجر إزاره، فقال رسول الله ـﷺـ: أعجلنا الرجل. فقال عتبان: يارسول الله ـﷺـ: أرأيت الرجل يُعجل عن امرأته ولم يمن ماذا عليه؟ قال رسول الله ـﷺـ: إنما الماء من الماء. م ـ ٢/٤٢٦.

تەرجەمە:

ئەبوسەعیدی خدریی ـ رضي الله تعالى عنه ـ ئەفەرموێ: رۆژی دووشەممە لە خزمەت پێغەمەرا ـﷺـ چووینە قوباء تا هاتینە ناوَ بەنی سالم، پێغەمەر ـﷺـ لە بەردەرگای ماڵی عیتبَانا تەشریفی راوەستا، بانگی عیتبانی کرد، هاتەدەرێ پێش گیرەکەی رائەکێشا. پێغەمەر ـﷺـ فەرمووی: عەجەلەمان لە پیاوەکە کرد [یەعنی لە کەیفمان دا] عیتبان عەرزیکرد: (یارسول الله) خەبەرم بدەرێ کە کەسێ لەگەڵ ژنی دروست ببیٚ و عەجەلەی لیٚبکرێ مەنیی نەییٚتەوە چی لەسەرە؟ [یەعنی غوسڵی لەسەرە یان نا؟] فەرمووی: ئاو [بەخۆداکردن] لە ئاوەوە لازم ئەبێ [یەعنی تا ئینزالی مەنیی نەبێ غوسڵ کردن لازم نیە].

[حەقیقەتەن وا ئیجاب ئەکا فەقەط ئەوەندەیان لێ کۆڵیوەتەوە بە زۆر لەسەر خۆیان فەرزکردوە. لە زەمانی پێغەمەرا ـﷺـ و حەزرەتی ئەبوبەکرا فەرز نەبوە، ئیمامی عومەر فەرزیکرد. ئیمامی عوثمان و عەلی و ئوبەیی بنی کەعب و ئەبوئەییوبی ئەنصاریی بەوە غوسڵیان

نەکردوە، لە دوای ئەوە ئیجماع لەسەر غوسڵە] ئەبولعەلاء ئەفەرموێ: بەعزێ حەدیثی پێغەمەر ـﷺـ بەعزێ حەدیثی نەسخ ئەکاتەوە. [یەعنی ئەم حەدیثە مەنسوخە بە حەدیث] م ـ ٢/٤٢٦.

**٢/١٧٦٠ـ عن أبي سعيد الخدري [رضي الله تعالى عنه] أن رسول الله ـﷺـ مر على رجل من الأنصار، فأرسل إليه فخرج، ورأسه يقطر فقال: لعلنا أعجلناك؟ قال: نعم يارسول الله. قال: إذا أعجلت أو أقحطت فلا غسل عليك، وعليك الوضوء. م ـ ٢/٤٢٧. ح ـ ١/٢٥٦، ليس فيه (لا غسل عليك).**

**تەرجەمە:**

ئەبوسەعیدی خدریی ـ رضي الله تعالى عنه ـ ئەفەرموێ: پێغەمەر ـﷺـ بەلای ماڵی یەکێ لە ئەنصارا (عیتبان) تەشریفی رابورد، ناردی بە شوێنیا، کە هات ئاوی لەسەر ئەتکا، پێغەمەر ـﷺـ فەرمووی: رەنگە عەجەلەمان لێ کردبێ! عەرزیکرد: بەڵێ. پێغەمەر ـﷺـ فەرمووی: کە عەجەلەت لێ کرا یا قاتیی ئاوت لێ هات. یەعنی[1] غوسڵت لەسەر نیە دەزنوێژت لەسەرە.

**٣/١٧٦١ـ عن أبي أيوب عن أبي بن كعب [رضي الله تعالى عنهما] قال: [يارسول الله إذا جامع الرجل المرأة فلم ينزل. خ] سألت رسول ـﷺـ عن الرجل يصيب من المرأة ثم يكسل، فقال: يغسل ما أصابه من المرأة ثم يتوضأ ويصلي. ح ـ ١/٣٣٣. م ـ ٢/٤٢٧.**

---

(١) لە دەسخەتەکەدا وایەو لەبیرچوونێکی تێدایە، رەنگە ویستبێتی بڵێ: «یەعنی کە ئاوت نەهاتەوە...»

تەرجەمە:

ئوبەیی کوڕی کەعب ـ رضي الله تعالى عنه ـ ئەفەرموێ: لە پێغەمەر ـ ﷺ ـ م پرسی: (یارسول الله) ئینسان جیماعی لەگەڵ ژنی کردو ئینزالی نەبێ و پەکی بکەوێ [چی بکا غوسڵ بکا یا نەکا؟] فەرمووی: ئەو میقدارەی لە ژنەکەی کەوتوە (ذکر)ی بشوا لە پاشا دەزنوێژ بشواو نوێژ بکا.

٤/١٧٦٢ـ عن زيد بن خالد الجهني أنه سأل عثمان بن عفان [رضي الله تعالى عنه] فقال: أرأيت إذا جامع الرجل إمرأته فلم يُمن! قال عثمان [رضي الله تعالى عنه]: يتوضأ كما يتوضأ للصلاة ويغسل ذكره. [لأنه غالبا، بل أبدا، لا يخلو من المذي، لا لأن رطوبة الفرج نجس. والله أعلم] قال عثمان: سمعته من رسول الله ـ ﷺ ـ [قال زيد]: فسألت عن ذلك علي بن أبي طالب [رضي الله تعالى عنه] والزبير بن العوام، وطلحة بن عبيد الله وأبي بن كعب [رضي الله تعالى عنهم] فأمروه بذلك. وسمع ذلك أبو أيوب ـ رضي الله تعالى عنه ـ عن رسول الله ـ ﷺ ـ ح ـ ١/٣٣٢، ٢٥٥. م ـ ٢/٤٢٨.

قال أبو عبد الله [البخاري]: الغسل أحوط وذاك الأخير [أي آخر الأمرين، أي عدم الغسل آخر الأمرين]. إنما بيننا لاختلافهم. ح ـ ١/٣٣٣.

تەرجەمە:

زەیدی کوڕی خالیدی جوهەنیی لە ئیمامی عوثمان ـ رضي الله تعالى عنه ـی پرسی، کەسێ جیماع لەگەڵ ژنیا بکاو ئینزالی نەبێ [چی لەسەرە]؟ ئیمامی عوثمان ـ رضي الله تعالى عنه ـ فەرمووی:

وەك چۆن دەزنوێژ ئەشوا ـ دەزنوێژ بشواو ذەکەری بشوا [چونکە خاڵی لە وەزیی نیە] ئیمامی عوثمان ـ رضي الله تعالى عنه ـ فەرمووی: لە پێغەمەرم -ﷺ- بیست. زەید ئەفەرموێ: لە ئیمامی عەلیو لە زوبەیری کوڕی عەووام و طەلحـــەی کوڕی عوبـەیـدیللاو ئوبـەیی کوڕی کەعبم پرسـی ـ رضـي الله تعــالـی عنهم ـ هەمـــوو وایـــان ئەمـــر پێکـــردم. ئەبـوئـەییـوبیش ـ رضي الله تعـالى عنـه ـ ئەفەرموێ: ئەوەم لە پێغەمەر -ﷺ- بیست.

بوخاریی ـ رحمه الله ـ ئەفەرموێ: غوسڵ کردن ئیحتیاطی زیاتر تیا هەیـە، غوسـڵ نەکـردن دواتـرە لە کردن، یەعنی نەسـخ نەبوەتەوە بەڵکو ناسیخی غوسڵە.

بۆیێکم ئەو حەدیثی دائیـــر بە غوســـڵ نەکـردنـە ذیکـر کرد چونکی ئیختیلاف هەیە لە غوسڵ کردن و نەکردنا.

**١٧٦٣/٥ـ عن أبي هريرة [رضي الله تعالى عنه] أن نبي الله -ﷺ- قال: إذا جلس بين شعبها الأربع ثم جهدها فقد وجب عليه الغسل. وفي حديث مطر: وإن لم ينزل. م ـ ٢/ ٤٢٩.**

**تەرجەمە:**

ئەبـوهـورەیـرە ـ رضي الله تعـالى عنـه ـ ئەفەرموێ: پێغەمەر -ﷺ- فەرمـــووی: کە ئینســـان لە بەینی چوار (شعبـە)ی ژنـەکـەیـا دانیشت هەنـــاســـەبـــرکێی پێخست غوسڵی لەســـەر واجب ئەبێ. لە حەدیثی (مطر)ا ئەو زیادەیە هەیە کە ئەفەرموێ: با ئینزالیشی نەبێ.

موراد له چوار (تلْنك)[1] هەردوو ران و هەردوو قاچی ژنەکەیە، یا هەردوو کەناری ئەم لاو ئەولای فەرجیەتی، کە چوارە.

٦/١٧٦٤- عن عائشة [رضي الله تعالى عنها] زوج النبي -ﷺ- قال: **إن رجلا سأل رسول الله عن الرجل يجامع أهله ثم يكسل هل عليهما الغسل؟ وعائشة جالسة. فقال رسول الله -ﷺ-: إني لأفعل ذلك أنا وهذه، ثم نغتسل.** م ـ ٢/٤٣١.

تەرجەمە:

پیاوێ له پێغەمەر -ﷺ-ی پرسی: پیاو لەگەڵ ژنی خۆی جیماع ئەکا ئینزالی نابێ پەکی ئەکەوێ.. غوسڵیان لەسەرە یا نیە؟ حەزرەتی عایشەی له خزمەتا دانیشتبوو. پێغەمەر -ﷺ- فەرمووی: من و ئەمەیش وا ئەکەین و له پاشا غوسڵ ئەکەین. ئەم حەدیثە ناسیخە یا مەنسووخە؟ تەعیینی لازمە.

٧/١٧٦٥- عن أبي بردة عن أبي موسى [رضي الله تعالى عنه] قال: **اختلف في ذلك رهط من المهاجرين والأنصار؛ فقال الأنصاريون: لا يجب الغسل إلا من الدفق أو من الماء. وقال المهاجرون: بل إذا خالط فقد وجب الغسل. قال: قال أبو موسى: فأنا أشفيكم من ذلك، فقمت فاستأذنت على عائشة [رضي الله تعالى عنها] فأُذن لي، فقلت لها: يا أماه أو يا أم المؤمنين إني أريد أن أسألك عن شيء، وإني أستحييكِ. فقال: لا تستحي أن تسألني عما كنتَ سائلا عنه أمك التي ولدتك، فإنما أنا أمك. قلت: فما يوجب الغسل؟ قالت: على الخبير سقطتَ. قال رسول**

(١) بەم وشە مانای (شعب) لێ دەداتەوە، بەلام من ئەم وشەم نەبیستوە.

**الله ـ ﷺ ـ: إذا جلس بين شعبها الأربع ومسَّ الختانُ الختانَ فقد وجب الغسل. م/٢/٤٢٩.**

**تەرجەمە:**

ئەبوموساى ئەشعەریی ـ رضي الله تعالى عنه ـ فەرمویەتی: موهاجیرو ئەنصار خیلافیان بوو لەوەدا کە لە موجامەعەدا بە ئینزال غوسڵ واجب ئەبێ =یا= بە ئیدخال؟ ئەنصار فەرموویانە: تا ئینزال نەبێ غوسڵ واجب نابێ [لە بەر ئەو حەدیثانەی کە رابورد] موهاجیر وتیان: هەر بە مەحضی ئەمە ذەکەر کرا بە فەرجا غوسڵ لازم ئەبێ. ئەبوموسا ـ رضي الله تعالى عنه ـ =فەرمووی:= من لەوە شیفاتان ئەدەم. هەڵسام و چوومە خذمەت حەزرەتی عایشە ـ رضي الله تعالى عنها ـ ئیذنم خواست و ئیذن درام، عەرزم کرد: دایەلێ، یا فەرمووی: ئەی دایکی موسوڵمانان ئیرادەم وایە شتێکت لێ بپرسم و حەیاو شەرمت لێ ئەکەم. فەرمووی: لەوەی کە لە دایکی خۆت کە لێی بووی ئەپرسی و [شەرمی لێ ناکەی] شەرم مەکە لێم بپرسە، منیش دایکتم. عەرزم کرد: چی لەسەر ئینسان غوسڵ کردن بە واجب ئەگێرێ؟ فەرمووی: بە یەکێ گەییت کە بە جوابی ئەم سوئالە خەبەردار بێ. پێغەمەر ـ ﷺ ـ فەرمووی: کە پیاو لە بەینی چوارپەلەی ژنا دانیشت جێ خەتەنەی پیاو لە جێ خەتەنەی ژن کەوت [یەعنی موقابیل بەیەك بوون] غوسڵ واجب ئەبێ.

[ئەمەیش کینایەیە بە صەراحەت شیفای دەردی تیا نیە. عەقڵیش باوەڕ ناکا کە ئەنصارو عەشەرەی موبەششەرەو گەلێ ئەصحابی کیرام تا ئەو

وەختە بە لەشپیسی چووبنە مزگەوت و نوێژیان کردبێ‌و، پێغەمەر -ﷺ- تەبلیغی ئەو نوقطــە موهیممـــەی نەکــردبێ بە ئوممـــەتی بە نەوعێ کە شوهرەت ببەستێ لە ناویانا!]

## کەیفیەتی غوسڵ

٨/١٧٦٦- عن عائشـــة [رضي الله تعـــالى عنهـا] زوج النبي -ﷺ-: أن النبي -ﷺ- كان إذا اغتسـل عن الجنـابـة بدأ فغسل يديه [قبل أن يدخلهما في الإناء ثم يغسل فرجه. م، ت] ثم يتوضأ كما يتوضأ للصلاة [ثم يأخذ المـاء فيـدخـل أصـابعه في أصول الشعر حتى إذا رأى أن قد استبرأ حفن على رأسه ثلاث حفَنات، ثم أفاض على سائر جسده ثم غسل رجليه. م - ٢/٣٩٢] ثم يدخـل أصـابعه في الماء فيخلل بها أصول شعره، ثم يصب على رأسه ثلاث غرف بيديه، ثم يفيض الماء على جلده كله. وفي أخرى حتى إذا ظن أنـه قد أروى بشـرتـه أفـاض عليه الماء ثلاث مرات ثم غسل سائر جسده. حـ ١/٣٢١، ٣٠٨. م - ٢/٣٨٩. ن، جه

تەرجەمە:

عایشــە ـ رضي الله تعـالى عنهـا ـ ئەفـەرمـوێ: پێغەمەر -ﷺ- کە غوسڵی جەنـابـەتی بکـردایـە لە پێش ئەمـەدا دەست بخـاتە ناو ظەرفی ئاوەکـــەوە هەردوو دەستی ئەشت [لــە پاشـا فەرجی ئەشت. م، د] لە پاشا وەك چۆن دەزنوێژی بۆ نوێژ ئەشت دەزنوێژی ئەشت، لە پاشا پەنجەی ئەکرد بە ئاوەکەدا بە پەنجە بن مووی سەری خەلەلە ئەکرد تا لێی مەعلووم ئەبوو کە پێستی بن مووی سەری تەڕو پاراو بوە، سێ

مست ئاوی ئەکـرد بە سەر مووی سەریـا، ئەمجـا ئاوی ئەکـرد بەسـەر سائیری بەدەنیا لە پاشا هەردوو پێی ئەشت.

**١٧٦٧/٩- عن ميمونة [رضي الله تعالى عنها] زوج النبي -ﷺ- قالت: توضأ رسـول الله -ﷺ- وضـوءه للصـلاة غيـر رجليـه، وغسـل فرجه وما أصابه من الأذى، ثم أفاض عليه الماء، ثم نحى رجليه فغسلهما، هذا غسله [عليه الصلاة والسلام] من الجنابة. م - ٢/٣٩٢. ح - ١/٣٠٩. د، ت، ن، جه.**

**تەرجەمە:**

مەیموونەی حەرەمی پێغەمەر -ﷺ- ئەفەرموێ: پێغەمەر -ﷺ- وەك چۆن بۆ نوێژ دەزنوێژی ئەشت دەزنوێژی شت، غەیری پێی نەیشت، فەرجیو ئەو شتانەی پێوە بوو شتی، لە پاشا ئاوی کرد بەسەریا، لەو جێیە پێی دوورخستەوەو شتی، ئەم غوسڵە غوسڵی پێغەمەرە -ﷺ- لە جەنابەت.

**١٧٦٨/١٠- عن عائشة - رضي الله تعالى عنها - قالت: كنت أغسل أنا والنبي -ﷺ- من إناء واحد من قَدَح يقال له.الفَرَق [وهو صاعان] ح - ١/٣١٠. م - ٢/٣٩٤. ن.**

**تەرجەمە:**

عایشە - رضي الله تعالى عنها - ئەفەرموێ: من و پێغەمەر -ﷺ- بەیەکەوە لە ظەرفێکا غوسڵمان ئەکرد [ئەو ظەرفە هەشت یا دوانزە مود ئاو ئەگرێ].

**١١/ ١٧٦٩ـ عن ميمونة ـ رضي الله تعالى عنها ـ قالت: أدنيت لرسول الله ـﷺـ غسله من الجنابة؛ فغسل كفه مرتين أو ثلاثا، ثم أدخل يده في الإناء، ثم أفرغ به على فرجه، وغسله بشماله، ثم ضرب بشماله الأرض فدلكها دلكا شديدا، ثم توضأ وضوءه للصلاة، ثم أفرغ على رأسه ثلاث حفنات ملء كفه، ثم غسل سائر جسده، ثم تنحى عن مقامه ذلك فغسل رجليه، ثم أتيته بالمنديل فرده، وفي رواية: فلم يمسه.**

**وفي أخرى وصف الوضوء كله؛ فذكر المضمضة والإستنشاق فيه. م ـ ٣٩٢/٢، ح ـ ١/ ٣١٧. ح ـ ١/ ٣٢٣. ح ـ ١/ ٣١٤، ٣١٧. وفي أخرى: فلم ينفض بها. ح ـ ١/ ٣١٤. وفي أخرى: فناولته خرقة فقال بيده هكذا، ولم يردها. ح ـ ١/ ٣١٧.**

**تەرجەمە:**

مەیموونە ـ رضي الله تعالى عنها ـ ئەفەرموێ: ئاوی غوسڵم بۆ پێغەمەر ـﷺـ هێنا دوو دەفعە، یا فەرمووی: سێ دەفعە، دەستی شت، لە پاشا دەستی نایە ناو ظەرفەکەوە بە دەستی ئاوی کرد بەسەر فەرجیاو، بە دەستی چەپ شتی، لە پاشا دەستی چەپی ماڵی بە ئەرزاو بە قائیم لە ئەرزی خست، لە پاشا وەك دەزنوێژ بۆ نوێژ دەزنوێژی شت، لە پاشا سێ مستی پڕ ئاوی کرد بەسەریا لە پاشا [ئاوی کرد بە هەمموو بەدەنیا ]و شتی، لە پاشا لەو جێیەی کە خۆیی لێ ئەشت دوورکەوتەوەو هەردوو پێی شت، ئەمجا مەندیلم بۆ هێنا خۆیی پێ وشك بکاتەوە نەیویست و رەددی کردەوە. لە ریوایەتێکا ئاو لە دەم وەردان و ئاو لە لووت وەردانیشی ذیکرکردوە.

١٢ / ١٧٧٠ـ عن عائشة [رضي الله تعالى عنها] قالت: كنت أغتسل أنا والنبي ـﷺـ من إناء واحد تختلف أيدينا فيه. ح ـ ١/٣١٦. م ـ ٢/٣٩٨.

١٣ / ١٧٧١ ـ وعنها قالت: كنت أغتسل أنا ورسول الله ـﷺـ من إناء بيني وبينه، فيبادرني حتى أقول:دع لي، دع لي، قالت: وهما جنبان. م ـ ٢/٣٩٨.

تەرجەمە:

عایشە ـ رضي الله تعالى عنها ـ ئەیفەرموو: من و پێغەمەر ـﷺـ لە ظەرفێك بەیەكەوە غوسڵمان ئەكردو دەستمان تێكەڵ ئەبوو، دەست پێشەكیی لێ ئەكردم تا عەرزم ئەكرد: وازی لێ بێنە بۆ من. وازی لێ بێنە بۆ من. فەرمووی: هەردوكمان لەشمان (جنب)[1] بوو.

١٤ / ١٧٧٢ـ ابن عباس [رضي الله تعالى عنهما] أن رسول ـﷺـ كان يغتسل بفضل ميمونة [رضي الله تعالى عنها]. م ـ ٢ / ٣٩٩.

تەرجەمە:

ئیبن و عەبباس ـ رضي الله تعالى عنهما ـ ئەفەرموێ: پێغەمەر ـﷺـ بە ئاوی پاشماوەی مەیموونە ـ رضي الله تعالى عنها ـ غوسڵی ئەكرد.

لەم حەدیثانە وا مەعلووم ئەبێ لە پێش غوسڵا دەزنوێژێ بە

(١) لەشمان پیس بوو.

تەواوەتی ئەشۆرری، لە پێشا شتی (مستقذر) بە لەشیەوە بێ ئەشۆرری ئەمجا دەرنوێژی کامیل، ئەمجا هەموو ئەعزای سێ جار ـ سێ‌جار، لە پێشا لای راست لە پاشا لای چەپ ئەشۆرری، پێ ئەخرێتە ئاخری غوسڵەوە. سوننەت وایە پیاوو ژنی بە یەکەوە غوسڵ بکەن. موداعەبە[1] بکـەن. ژن دەزنـوێـژ ناشکێنێ. خۆوشککـردنـەوە بێ ضەروورەت (خلاف الأولی) یە.

**١٥/١٧٧٣ـ جبيـر بن مطعم ـ رضي الله تعـالى عنـه ـ قال: تمـاروا في الغسـل عنـد رسـول الله ـ ﷺ ـ فقال بعض القوم: أما أنا فإني أغسل رأسي بكـذا وكـذا. فقـال رسول الله ـ ﷺ ـ: أما أنا فإني أفيض على رأسي ثلاث أكف. م ـ ٢/٤٠١.**

**تەرجەمە:**

جوبەیری کوڕی موطعیم ـ رضي الله تعالى عنه ـ ئەفەرموێ: لە خزمـەت پێغـەمـەرا ـ ﷺ ـ لە خوصـووصی غوسڵەوە موجـادەلەیان کرد؛ یەکێکیـان فەرمـووی: من سەرم بە ئەوەنـدەو ئەوەنـدە ئەشـۆم. [یەعنی موبـالـەغـە ئەکـەم لە شتنیـا] پێغـەمـەر ـ ﷺ ـ فەرمووی: ئەمما من [بە هەردوو مستم] سێ مست ئاو ئەکەم بەسەرما. یەعنی سێ جار کافیە.

**١٦/١٧٧٤ـ عن جابر بن عبد الله [رضي الله تعالى عنهما] أن وفد بني ثقيف سألوا النبي ـ ﷺ ـ فقالوا: إن أرضنا أرض باردة فكيف بالغسل؟ فقال: أما أنا فأفرغ على رأسي ثلاثا. م ـ ٢/٤٠٢.**

---

(١) یاریی و دەسبازیی کردن.

تەرجەمە :

وەفــدی بەنی ثەقیف لە پێغـەمـەر -ﷺ- یان پرسی کە ئەرزی ئێمـە ئەرزێکی ساردە چۆن غوسڵ بکەین؟ پێغەمەر -ﷺ- فەرمووی: ئەمما من سێ =جار= ئاو ئەکەم بەسەر سەرما.

**١٧/١٧٧٥- أبو سلمه يقول [قال، م]: دخلت أنا وأخو عائشة [من الرضاع. م] فسألها أخوها عن غسل النبي -ﷺ- فدعت بإناء، نحو من صاع، فاغتسلت، وأفاضت على رأسها [ثلاثا، م] وبيننا وبينها حجاب [ستر. م] ح - ١/٣١١، م - ٢/ ٣٩٦. وفيه: وكان أزواج النبي -ﷺ- يأخذن من رؤسهن حتى تكون كالوفرة. مـ ٢/٣٩٧.**

تەرجەمە :

ئەبـوسـەلـەمـەی کوڕی عەبـدوڕە حمانی کوڕی عەوف [رضي الله تعــالى عنــه، ورحمـه الله تعـالى] ئەفـەرمـو ێ: من و برای شیـریی حەزرەتی عایشە - رضي الله تعالى عنها - چووینە خذمەتی، براکەی لێی‌پرسی لە غوسڵ کردنی پێغەمەر -ﷺ- ظەرفێ ئاوی ویست بە قەد صاعێ، غوسڵی پێ‌کرد؛ ئاوەکەی کرد بەسەر خۆیا تا سێ جار، لە بەینی ئێمەو ئەوا پەردەیێ بوو [ ئەزواجی پێغەمەر -ﷺ- پرچی خۆیان ئەگرت تا وەك غولامانەی لێ ئەهات]

[لە گوێچکەیان نەئەهاتە خوارێ] .م]

لای مەحرەم غوسڵ دروستە.

لای نامــەحــرەمیش بە شەرتـی حیـجــاب لە بەینــاو وجــودی مەحرەمێکیش دروستە.

ژن بۆی دروسته پرچی هەڵبپاچێ تا بناگوێی.

١٨/١٧٧٦ـ أبو جعفر [محمد الباقر بن علي، بن الحسين، بن علي ابن أبي طالب ـ رضي الله تعالى عنهم ـ] أنه كان عند جابر بن عبد الله [رضي الله تعالى عنهما] هو وأبوه [علي بن الحسين ـ رضي الله تعالى عنهما ـ] وعنده قوم فسأله عن الغسل، [السائل أبو جعفر] فقال: يكفيك الصاع، فقال رجل [هو الحسن بن محمد الحنفية]: ما يكفيني. فقال جابر: كان يكفي من هو أوفى منك شعرا، وخير منك. ثم أمَّنا [جابر ـ رضي الله تعالى عنه ـ] في ثوب. ح ـ ٣١١/١

١٩/١٧٧٧ـ أبو جعفر قال: قال جابر: أتاني ابن عمك يعرض بالحسن بن محمد بن الحنفية [رضي الله تعالى عنهم] قال: كيف الغسل من الجنابة؟ فقلت: كان النبي ـﷺـ يأخذ ثلاث أكف ويفيضها على رأسه، ثم يفيض على سائر جسده. فقال لي الحسن: إني رجل كثير الشعر، فقلت: كان النبي ـﷺـ أكثر منك شعرا. ح ـ ٣١٣/١. م ـ ٤٠٢/٢.

تەرجەمە:

ئەبوجەعفەری باقر ـ رضي الله تعالى عنهما ـ ئەفەرموێ: جابیر ـ رضي الله تعالى عنه ـ فەرمووی: حەسەنی کوڕی حەمەحەنەفی ئامۆزای باوکت ـ رضي الله تعالى عنهم ـ هاتەلام لێی پرسیم: غوسڵ چۆنە؟ وتم: پێغەمەر ـﷺـ سێ مست ئاوی ئەکرد بەسەریاو، لە پاشا ئاوەکەی هەموو ئەکرد بەسەر جەسەدیا. حەسەنی ئامۆزای باوکت پێی وتم: من مووم زۆرە. وتم: پێغەمەر ـﷺـ لە تۆ مووزۆرتر بوە.

لە ریوایەتەکەی ترا ئەفەرموێ: لە تۆیش باشترە. لە پاشا جابیر ـ

رضي الله تعالى عنه ـ لە یەك لیباسا، [یەعنی هەر لە یەك پێش گیرا، ئیمامەتی بۆ كردین. لە ریوایەتەكەی پێشەوەدا: ئەبو جەعفەر حازر بوو كە حەسەن پرسیی. لەم ریوایەتەدا حازر نەبوو، جابیر ـ رضي الله تعالى عنه ـ بۆی ئەگێڕێتەوە. (فوفق وفقك الله يا ابن أخي).[1]

**١٧٧٨/٢٠ـ عن أم سلمة [رضي الله تعالى عنهما] قالت: قلت: يا رسول الله إني امرأة أشدُّ ضُفُر رأسي أفأنقضه لغسلِ الجنابة؟ قال: لا إنمايكفيك أن تَحثي على رأسك ثلاث حَثَيات، ثم تُفيضين عليكِ الماء فتطهرين. م ـ ٢/٤٠٢. أفأنقضه للحيضة والجنابة. م ـ ٢/٤٠٣.**

**تەرجەمە:**

ئومم و سەلەمە ـ رضي الله تعالى عنها ـ ئەفەرموێ: عەرزی پێغەمەرم كرد ـ ﷺ ـ: من ژنێكم پرچم مەحكەم ئەهۆنمەوە، بۆ غوسلی حەیض و جەنابەت بیكەمەوە؟ فەرمووی: خەیر ئەوەندەت بەسە سێ مست ئاو بكەی بەسەرتا، لە پاشا ئاوەكە بكەی بەسەر هەموو بەدەنتا پاك ئەبیەوە.

**١٧٧٩/٢١ـ بلغ عائشة [رضي الله تعالى عنها] أن عبد الله بن عمر [رضي الله تعالى عنهما] يأمر النساء إذا اغتسلن أن ينقضن رؤسهن؛ فقالت: يا عجبا لابن عمر هذا يأمر النساء إذا اغتسلن أن ينقضن رؤسهن! أفلا يأمرهن أن يحلقن رؤسهن؟! لقد كنت أغتسل أنا ورسول الله ـ ﷺ ـ من إناء واحد وما أزيد على أن أُفرِغ على رأسي ثلاث إفراغات. م ـ ٢/٤٠٣.**

---

(١) مەبەستی لەم (ابن أخي)ە مامۆستا مەلا سەلامە، بەڵام مامۆستا هیچی نەكردوە.

**تەرجەمە:**

ئيبن وعومەر ـ رضي الله تعالى عنهما ـ ئەمری ئەفەرموو بەژنان کە غوسڵيان کرد پرچيان هەڵبوەشێنن،ئەمە بە حەزرەتی عايشە ـ رضي الله تعالى عنها ـ گەيیەوە فەرمووی:عەجايەب بۆ ئيبن و عومەر ئەمر بە ژنان ئەکا لە وەختی غوسڵا پرچيان بکەنەوە! بۆ ئەمريان پێ ناکا کە سەريان بتاشن؟! من لە خزمەت پێغەمەرا ـ ﷺ ـ بەيەکەوە لە زەرفێکا غوسڵمان ئەکرد، لەوە زياترم نەئەکرد کە سێ دەفعە ئاوم ئەکرد بەسەرما.

**٢٢ / ١٧٨٠ـ عن أنس [رضي الله تعالى عنه] قال: كان النبي ـ ﷺ ـ يدور [يطوف. م] على نسائه في الساعة الواحدة من الليل وهن إحدى عشرة [فيهن مارية، وريحانة ـ رضي الله تعالى عنهما ـ] قال قتادة: قلت لأنس: أو كان يطيقه؟ قال: كنا نتحدث أنه أعطي قوة ثلاثين، وفي أخرى: أربعين، وفي أخرى: تسع نسوة. ح ـ ١٠٢/٨. م ـ ٢ / ٣٧٥.**

**تەرجەمە:**

ئەنەس ـ رضي الله تعالى عنه ـ فەرمووی: پێغەمەر ـ ﷺ ـ لە شەوا لە يەك ساعەتا ئەچوە لای هەموو ژنەکانی. بە ئەنەسمان وت: پێغەمەر ـ ﷺ ـ دەرەقەتيان ئەهات؟ فەرمووی: قسەمان بۆ کراوە کە پێغەمەر ـ ﷺ ـ قووەتی سی کەسی، لە ريوايەتێکا: قووەتی چل کەسی دراوەتێ، لە ريوايەتێکا ئەفەرموێ: يازدە ژنی بوە ـ ئەگەر (ماريە)و (ريحانە) داخڵ بن ـ لە ريوايەتێکا نۆ ژنی بوە ـ ئەگەر ئەو دوانە حيساب نەکرێن ـ.

**٢٣ / ١٧٨١ـ أبو هريرة [رضي الله تعالى عنه] قال: أقيمت الصلاة وعدلت الصفوف قياما فخرج إلينا رسول الله ـ ﷺ ـ فلما قام في مصلاه**

**ذكر أنه جنب، فقال لنا: مكانكم، ثم رجع فاغتسل ثم خرج إلينا ورأسه يقطر، فكبر فصلينا معه. م ـ ٢/٢٩٤.[1] ح ـ ٣٢٢/١. د، ن**

**تەرجەمە:**

ئەبوهورەیرە ـ رضي الله تعالى عنه ـ ئەفەرموێ: قامەت بۆ نوێژ کرا، صەف رێك خرا بەپێوە، پێغەمەر ـ ﷺ ـ تەشریفی هاتەدەرێ لامان، کە تەشریفی لە جێ نوێژیا راوەستا لە فکری کەوتەوە کە (جونوبە)،[1] پێی فەرمووین: لە جێی خۆتان بوەستن، لە دواییدا تەشریفی گەڕایەوە بۆ ماڵێ غوسڵی کردو تەشریفی هاتەوە ناومان ئاوی لەسەر ئەتکا، (الله أكبر)ی کردو نوێژی دابەست و نوێژمان کرد لە خزمەتیا.

**١٧٨٢/٢٤ـ أم هانىء ـ رضي الله تعالى عنها ـ بنت أبي طالب تقول: ذهبت إلى رسول الله ـ ﷺ ـ عام الفتح فوجدته يغتسل وفاطمة ابنته [رضي الله تعالى عنها] تستره. قالت: فسلمت عليه، فقال: من هذه؟ فقلت:أنا أم هانىء بنت أبي طالب. فقال: مرحبا بأم هانىء. فلما فرغ من غسله قام فصلى ثماني ركعات [سبحة الضحى. أخرى. م سجدات. أخرى. م] ملتحفا في ثوب واحد، فلما انصرف قلت: يارسول الله زعم ابن أمي أنه قاتل رجلا وقد أجرته فلان بن هبيرة [زوج أم هانيء، هرب من مكة ومات مشركا] فقال رسول الله ـ ﷺ ـ: قد أجَرْنا من أجرتِ ياأم هانيء وذاك ضحى. ح ـ ٣٨١/١، ح ـ ٢٢٨/٥. م ـ ٤١٩/٢.**

---

(١) ئەم ریوایەتەم لە موسلیمدا نەدۆزیەوە.

(١) (جنب ـ جونوب) لەش پیس.

تەرجەمە:

ئومم وهانیئی کچی ئەبوطالیب ـ رضي الله تعالى عنها، وعەذاب لەسەر باوکی سووك بکا ـ ئەفەرموێ: لە ساڵی فەتحا چوومە خذمەت پێغەمەر ـ ﷺ ـ وام دی غوسڵی ئەکرد، فاطیمە ـ رضي الله تعالى عنها ـ شتێکی بۆ کردبوو بە پەردە سەتری کردبوو، سەلامم لێکرد، فەرمووی: ئەمە کێیە؟ عەرزم کرد: منم ئومم و هانیئی [فاخیتەی] کچی ئەبو طالیب، فەرمووی: مەرحەبا بێ لە ئومم وهانییء. کە لە غوسڵەکەی بووەوە تەشریفی راوەستا، هەشت رکاتی کرد، تەنها یەك لیباسی لە خۆیەوە پێچابوو، کە لە نوێژەکە بووەوە عەرزم کرد: (یارسول الله) ـ عەلی ـ کوری دایکم ئەڵێ: فلانەکەسێ[1] کوری هوبەیرە (یمێردم) ئەکوژم کە من ئەمانم داوە. پێغەمەر ـ ﷺ ـ فەرمووی: ئەی ئوممی هانییء پەنای ئەو کەسەم دا کە تۆ پەنات داوە. ئومم وهانییء ئەفەرموێ: ئەو نوێژە نوێژی چێشتە نوێژ بوو.

ئەڵێن: دەلیلی نوێژی ضوحا هەر ئەم حەدیثەیە. غەیری ئومم وهانییء کەسی تر ریوایەتی نەکردوە کە پێغەمەر ـ ﷺ ـ سوننەتی ضوحای کردبێ (والله أعلم).

لە بەینی سەلام و جوابیا کەمێ قسەکردن بۆ تەحقیقی ئەوەی کە سەلام ئەکا دروستە.

رجاکردن بۆ موشریك و ئەقریبا دروستە.

تەعظیم و تەلطیفی خزم سوننەتە.

---

(١) مەبەستی ئەوەیە کە حەزرەتی عەلی هەرەشەی لە مێردەکەی کردوە بۆ کوشتن. تۆزێك تەرجەمەکە رەوان نیە.

نوێژی ضوحا هەشت رکاتە.

ئەم کوڕی ـ یا زڕکوڕی ـ ئومم و هانیئە کەس نازانێ کێیە، زانینیشی مەطلووب نیە.

دروستە مەحرەم لە غوسڵکردنا سەتری مەحرەم بکا.

بە پێشگیرێکەوە نوێژکردن دروستە.

**١٧٨٣/٢٥ـ عن ميمونة [رضي الله تعالى عنها] قالت: وضعت للنبي ـﷺـ ماء وسترته فاغتسل. م ـ ٢/٤٢٠.**

**تەرجەمە:**

حەزرەتی مەیموونە ـ رضي الله تعالى عنها ـ ئەفەرموێ: ئاوی غوسڵم بۆ پێغەمەر ـﷺـ داناو سەترم کرد ئەویش غوسڵی کرد.

ئیبنو عومەرو بەرای کوڕی عازیب ـ رضي الله تعالى عنهم ـ بێ ئەمە دەستیان بشۆن دەستیان کردوە بە ئاوی دەزنوێژا لە دواییدا دەزنوێژیان پێ شتوە. ئیبن و عومەرو ئیبن وعەباس ـ رضي الله تعالى عنهم ـ فەرموویانە: پریشکی ئاوی غوسڵی جەنابەت لە ئینسان هەڵبپرژێ زەرەری نیە. ح ـ ١/٣١٥.

**١٧٨٤/٢٦ـ عن عائشة [رضي الله تعالى عنها] قالت: كنا إذا أصابت إحدانا جنابة أخذت بيديها ثلاثا فوق رأسها، ثم تأخذ بيدها على شقها الأيمن، وبيدها الأخرى على شقها الأيسر. ح ـ ١/٣٢٤.**

**تەرجەمە:**

عایشە ـ رضي الله تعالى عنها ـ ئەفەرموێ: کە یەکێکمان تووشی

جەنابەت بوونیایە بە هەردوو دەستی ئاوی ئەکرد بەسەر تەپڵی سەریا، لە پاشا بە دەستی راستی ئاوی ئەکرد بەسەر لای راستی سەریا، بە دەستەکەی تری ئاوی ئەکرد بەسەر لای چەپی سەریا. [ئەمە مەعنای قەسطەلانیە یەعنی موراد لە (شق)ی ئەیمەن و ئەیسەر لای راست و چەپی خۆی نیە، لای راست و لای چەپی سەریەتی. (والله أعلم)].

**١٧٨٥/٢٧ـ [معاوية الصحابي. . . . قلت: يارسول الله عوراتنا ما نأتي منها وما نذر؟ قال: إحفظ عورتك إلا من زوجتك وما ملكت يمينك. قلت: يارسول الله أحدنا إذا كان خاليا؟] قال: الله أحق أن يستحيا منه. ئەوی لە ناو قەوسایە (أحمد وأربعة) حاكم ت، حاكم ئەڵێ: صەحیحە، ترمذیی ئەڵێ: حەسەنە. ئەوی خاریجی قەوسە بوخاریی ـ ٣٢٤/١ لەگەڵ ئەوانی تر.**

**تەرجەمە:**

[موعاویەی صەحابی ـ رضي الله تعالى عنه ـ ئەفەرموێ: عەرزی پێغەمەرم کرد ـ ﷺ ـ: عەورەتمان لە چی بپارێزین و لە چی نەپارێزین؟ فەرمووی: لە غەیری ژن و جاریەت عەورەتت موحافەظە بکە. عەرزم کرد: ئەگەر ئینسان لە جێیەکی چۆڵا بوو؟] =فەرموی=: خوا موستەحەقترە بەوە کە حەیای لێ بکرێ.

**١٧٨٦/٢٨ـ عن أبي هريرة ـ رضي الله تعالى عنه ـ قال: قال رسول الله ـ ﷺ ـ: إن موسى [عليه الصلاة والسلام] كان رجلا حييًّا ستيرا لا يرى من جلده شيء إستحياء منه، فآذاه من بني إسرائيل.**

فقالوا: ما يستتر هذا التستر إلا من عيب بجلده: إما برص، وإما أدْرَة، وإما آفة، وإن الله أراد أن يبرئه مما قالوا لموسى. فخلا موسى ليغتسل، فوضع ثيابه على الحجر، ثم اغتسل، فلما فرغ أقبل إلى ثيابه ليأخذها وإن الحجر عدا بثوبه، فأخذ موسى عصاه، وطلب الحجر يقول ثوبي حجر، ثوبي حجر! حتى انتهى الى ملأ من بني إسرائيل فرأوه عريانا أحسن ما خلق الله، وأبرأه مما يقولون، وقام الحجر فأخذ ثوبه، فلبسه وطفق بالحجر ضربا بعصاه [قال أبو هريرة]:فوالله إن بالحجر لندبا من أثـر ضربـه ثلاثـا أو أربعـا أو خمسا [بالشك من الراوي]، فذلك قوله: ﴿يـا أيهـا الـذين آمنـوا لا تكونوا كالذين آذوا موسى فبرَّأه الله مما قالوا، وكان عند الله وجيها﴾[1] ح ـ ٥/٣٨٣. م ـ ٩/٢٤٠.

٢٩/١٧٨٧ـ وفي أخرى قال: كانت بنو إسرائيل يغتسلون عراة ينظر بعضهم الى بعض، وكـان موسى [ﷺ] يغتسـل وحـده، فقـالوا: والله ما يمنع موسى أن يغتسل معنا إلا أنه آدر، فذهب مرة يغتسل، فوضع ثوبه على حجـر ففـرّ الحجـر بثـوبـه، فخـرج موسى في إثره يقول: ثوبي يا حجر، ثوبي يا حجر! حتى نظرت بنو إسرائيل الى موسى، فقالوا: والله ما بموسى من بأس وأخذ ثوبه فطفق الحجر ضربا، فقال أبو هريرة والله إنه لنَدَب بالحجر ستة أو سبعة ضربا بالحجر. حـ ١/٣٢٥. م ـ ٢/٤٢٢.

تەرجەمە:

ئەبوهورەیرە ـ رضي الله تعالى عنه ـ ئەفەرموێ: بەنی ئیسرائیل بە

(١) الأحزاب/ ٦٩.

رووتیی لای یەکتریی غوسڵیان ئەکرد، تەماشای یەکترییان ئەکرد، حەزرەتی مووسا ـ علیه الصلاة والسلام ـ پیاوێ بە حەیاو شەرم بوو، بە تەنها غوسڵی ئەکرد، هیچ جێی دەرنەئەکەوت، بەنیئیسرائیل قسەی ناخۆشیان درحەق ئەکرد، بەوە ئەذیەتیان ئەدا؛ ئەیانوت: بۆیە بە تەنها غوسڵ ئەکاو ئەوەندە لەشی خۆی دائەپۆشێ لە خەڵق یا بەڵەکە، یا دەبەیە، یا عەیبێکی تری هەیە، خوا ـ عزوجل ـ لەوە تەبریەی کرد؛ مووسا ـ علیه السلام ـ تەشریفی چوە جێیەکی تەنها کە غوسڵ بکا جلەکانی لەسەر بەردێ داناو غوسڵی کرد، کە لە غوسڵ بووەوە تەشریفی چوو بۆ جلەکانی، بەردەکە جلەکانی رفان، شوێنی کەوت ئەیفەرموو: ئەی بەرد جلەکانم، ئەی بەرد جلەکانم! تا بە رووتیی بردیە ناو کۆمەڵی بەنیئیسرائیلەوە، بەنیئیسرائیل بە رووتیی چاویان پێی کەوت کە لە هەموو کەس جوانتر بوو، ئەو وەختە وتیان: وەڵڵاهی مووسا هیچ عەیبی نیە. خوا بەوە لە قسەی بەنیئیسرائیل تەبریەیکرد. حەزرەتی مووسا ـ علیه السلام ـ جلەکانی هەڵگرت و لە بەری کرد، ئەمجا بە عەصاکەی دەستی کرد بە لێدانی بەردەکە.

ئەبوهورەیرە ئەفەرموێ: سێ، یا چوار، یا پێنج. لە ریوایەتەکەی ترا یا شەش، یا حەوت جێ عەصاکەی بە بەردەکەوە بوو. ئەم حادیثە ئەوەیە کە خوا ئەفەرموێ: ئەی ئەوانەی کە ئیمانتان هەیە ئێوەیش وەك ئەو جوولەکانە مەبن کە ئەذیەتی مووسایان دا، خوا ـ عزوجل ـ لەوێ پێیان[1] تەبریەی کرد لە لای خوا بە حورمەت و دۆعا موستەجابە.

(١) ماناکردنی ئێرە روون نیەو ئەگەر بگوترێ: خوا مووسای لەو قسانەی ئەوان تەبریە←

**٣٠/١٧٨٨ـ عن أبي هريـــرة [رضي الله تعــالى عنـه] عن النبي ـ ﷺ ـ قال: بينـا أيـوب [عليـه السـلام] يغتسـل عريـانـا، فخـر عليه جراد من ذهب، فجعـل أيـوب يحتثي في ثوبـه، فنـاداه ربـه: يا أيـوب ألم أكن أغنيتك عما ترى؟ قال: بلى وعزتك، ولكن لا غنى بي عن بركتك. ح ـ ١/٣٢٦.**

**تەرجەمە:**

پێغەمەر ـ ﷺ ـ فەرمووی: لە وەختێکا کە ئەییوب ـ علیه السلام ـ بە رووتیْ غوسڵی ئەکرد کوللەی ئاڵتوونی بەسەرا باری، ئەییووب ـ علیه السلام ـ بە مشت ئەیکردە ناو ئەلبیسەکەیەوە، خوا ـ عزوجل ـ بانگی کرد: بۆ من تۆم لە موحتـــاج بوون بە مەی کە ئەیـبـیـنی غەنیمـــان[1] نەکردووی؟ عەرزیکرد: بەڵێ قەسەم بە عیزەتی تۆ غەنیت کردووم، ئەمما لە بەرەکەتی تۆ بیْئیحتیاجیی بۆ من نیە.

[ئەییوب ـ علیه السلام ـ کوڕی عوصی، کوڕی رزاحی، کوڕی عیصی، کوڕی ئیسحاق بوو، یا کوڕی رزاحی کوڕی رۆمی، کوڕی عیص بوو].

---

(١) ئەگەر بگوترێ (غەنی نەکردوە؟) باشترو رەوانترە.

کرد... باشترە.

# ژن ئیحتیلامی ئەبێ

۱۷۸۹/۳۱ـ عن أم سلمة أم المؤمنين [رضي الله تعالى عنها] أنها قالت: جاءت أم سليم امرأة أبي طلحة إلى رسول الله ـﷺـ فقالت: يارسول الله إن الله لا يستحي من الحق، هل على المرأة من غسل إذا هي احتلمت؟ فقال رسول الله ـﷺـ: نعم إذا رأت الماء. ح ـ ۱/ ۳۲۸.

تەرجەمە:

ئومم وسەلەمە ـ رضي الله تعالى عنها ـ فەرمووی: ئومم وسولەیمی دایکی ئەنەس ـ رضي الله تعالى عنهما ـ هاتە خزمەت پێغەمەر ـﷺـ عەرزیکرد: (یارسول الله) ژن کە ئیحتیلامی ببێ غوسڵی لەسەرە یا نیە؟ پێغەمەر ـﷺـ فەرمووی: غوسڵی لەسەرە بەو شەرتە چاوی بە ئاو بکەوێ.

ئەم حەدیثە کوتوبی (ستة) ڕیوایەتیان کردوە.

۱۷۹۰/۳۲ـ عن أنس [رضي الله تعالى عنه] جاءت أم سليم ـ رضي الله تعالى عنها ـ إلى رسول الله ـﷺـ فقالت له ـ وعائشة [رضي الله تعالى عنها] عنده ـ: يارسول الله المرأة ترى ما يرى الرجل في المنام، فترى من نفسها ما يرى الرجل من نفسه. فقالت عائشة [رضي الله تعالى عنها]: يا أم سليم فضحت النساء تربت يمينك! قولها: تربت =يمينك= خير، فقال لعائشة: بل أنتِ فتربت يمينكِ! نعم فلتغتسل يا أم سليم إذا رأت ذلك. م ـ ۲/ ۳۸۰. وفي أخرى: فقلت لها: أف لكِ أترى المرأة ذلك؟ م ـ ۲/ ۳۸۵.

۱۷۹۱/۳۳ـ وفي أخرى: فقالت أم سلمة [رضي الله تعالى عنها]:

واستحييت من ذلك قالت: وهل يكون هذا ؟ فقال نبي الله -ﷺ-: نعم فمن أين يكون الشبه؟ إن ماء الرجل غليظ أبيض، وماء المرأة رقيق أصفر، فمن أيهما علا وسبق يكون منه الشبه. م - ٢ / ٣٨١. وفي أخرى نحوه: إذا علا ماؤها ماء الرجل أشبه الولد أخواله، وإذا علا ماء الرجل ماءها أشبه أعمامه. م - ٢/٣٨٦.

تەرجەمە:

ئومم وسولەیم هاتە خزمەت پێغەمەر -ﷺ- عەرزی‌کرد: (یا رسول الله) لە خەوا ژن ئەوی پیاو ئەیبینێ ئەویش ئەیبینێ، ئەو لەذەتەی پیاو لە خەویا ئەیبینێ ژنیش ئەیبینێ غوسڵی لەسەرە یان نا؟ حەزرەتی عائیشە فەرمووی: دەستت شکێ یا ئومم وسولەیم ئابرووی ژنانت برد! پێغەمەر -ﷺ- =فەرمووی=: تۆ دەستت بشکێ! بەڵێ ئەی ئومم وسولەیم غوسڵ بکا ئەگەر ئاو ببینێ. لە ریوایەتێکی ترا: ئۆف بۆ تۆ ئەی ئومم وسولەیم! بۆ ژن شتی وا ئەبینێ؟ لە ریوایەتێکی ترا ئومم وسەلەمە - رضي الله تعالى عنها - ئەفەرموێ: لەوە حەیام کرد، چۆن ئەوە ئەبێ؟ پێغەمەر -ﷺ- فەرمووی: بەڵێ ئەبێ ئەی بەچی موشابەهە پەیدا ئەبێ؟ ئاوی پیاو خەستەو سپی‌یە، ئاوی ژن روون و زەردە. ئەگەر ئاوی ژن سەرکەوێ مناڵەکەیان ئەشوبهێ بە خاڵوان، ئەگەر ئاوی پیاو سەرکەوێ ئەشوبهێ بە مام و ئامۆزا.

١٧٩٢/٣٤- عن ثوبان [رضي الله تعالى عنه] مولى رسول الله -ﷺ- قال: كنت قائما عند رسول الله -ﷺ- فجاء حبر من أحبار اليهود، فقال: السلام عليك يا محمد، فدفعته دفعة كاد يصرع منها، فقال: لم تدفعني؟ فقلت: ألا تقول: يارسول الله؟ فقال اليهودي: إنما ندعوه

باسمه الذي سماه به أهله. فقال رسول الله ـ ﷺ ـ: إن اسمي محمد الذي سماني به أهلي. فقال اليهودي: جئت أسألك فقال له رسول الله ـ ﷺ ـ: أينفعك شيء إن حدثتك؟ قال: أسمع بأذنيّ. فنكت رسول الله ـ ﷺ ـ بعود معه، فقال: سل. فقال اليهودي: أين يكون الناس يوم تبدل الأرض غير الأرض والسماوات؟ فقال رسول الله ـ ﷺ ـ: هم في الظلمة دون الجسر [أي الصراط] قال: فمن أول الناس إجازة؟ قال: فقراء المهاجرين. قال اليهودي: فما تحفتهم حين يدخلون الجنة؟ قال: زيادة كبد النون. قال: فما غداؤهم على إثرها؟ قال: ينحر لهم ثور الجنة الذي كان يأكل من أطرافها. قال: فما شرابهم عليه؟ قال: من عين فيها تسمى سلسبيلا. قال: صدقت.

قال: وجئت أسألك عن شيء لا يعلمه أحد من أهل الأرض إلا نبي أو رجل أو رجلان؟ قال: ينفعك إن حدثتك؟ قال: أسمع بأُذُنيَّ. قال: جئت أسألك عن الولد. قال: ماء الرجل أبيض، وماء المرأة أصفر. فإذا اجتمعا فعلا منيُّ الرجل منيَّ المرأة أذكرا بإذن الله. وإذا علا منيُّ المرأة منيَّ الرجل آنثا بإذن الله. قال اليهودي: لقد صدقت وإنك لنبي، ثم انصرف فذهب، فقال رسول الله ـ ﷺ ـ: لقد سألني هذا عن الذي سألني وما لي علم بشيء منه حتى أتاني الله ـ عز وجل ـ به. م ـ ٢/٣٨٧.

تەرجەمە:

ثەوبانی مەولای پێغەمەر ـ ﷺ ـ ئەفەرموێ: لە خزمەت پێغەمەرا ـ ﷺ ـ راوەستابووم عالمێ لە عالمانی جوولەکەی هاتەخزمەت وتی: (السلام عليك يا محمد) کە پاڵێکم پێوەنا وەخبو بکەوێ، وتی: بۆ

پاڵم پێوە ئەنێی؟ وتم: بۆ ناڵێی (یارسول الله)؟ وتی: بەو ناوە ناوی ئەبەین کە کەس و کاری بەوە ناوی ناوە. پێغەمەر -ﷺ- =فەرمووی=: ناوی من محـــەمـــەدە کە کەس و کارم بەوە ناوی ناوم. جوولـــەکـەکـە عەرزی‌کرد: هاتووم شتت لێ بپرسم. پێغەمەر -ﷺ- فەرمووی: ئەگەر جوابت [بە راستیی] بدەمەوە فائیدەت پێ ئەدا؟ عەرزی‌کرد: بە هەردوو گوێــم گوێـی لێ ئەگـــرم. پێــغـــەمـــەر -ﷺ- بە دارێ کە پێـی بوو لە ئەرزەکـەوەی ژەن، فەرمـووی: بپرسە جوولـەکـەکـە عەرزی‌کـرد: لەو رۆژەدا کە ئەرز بە غەیری ئەم ئەرزە هەیە تەبدیل بوو خەڵق لە کوێ ئەبن؟ فەرمـــووی: لە تاریکییێکـــا ئەبن کە لە پشت صیـــراطـــەوەیـە. عەرزی‌کرد: کێ لە پێش هەموو کەسێکەوە لێی تێپەڕ ئەبێ؟ فەرمووی: فوقـەرای موهـاجیـرین. عەرزی‌کـرد: لەو وەختـەدا کە ئەچنە بەهەشت ضیافەتیان چیە؟ فەرمووی: زیادەگۆشتێکە بە جگەری ماسی‌یەوە هەیە. عەرزی‌کرد: لە عەقەب ئەوەوە چییان دەرخوارد ئەدرێ؟ فەرمووی: ئەو گاجووتەی کە =لە= دەوری بەهەشتا ئەلەوەڕێ ئەوەیان بۆ سەرئەبرن. عەرزی‌کـرد: بەسـەر ئەوەدا چی ئەخـۆنـەوە؟ فەرمـووی: لە نەهـرێکی ناوبەهەشتی سەلسەبیل ناو. عەرزی‌کرد: راست ئەفەرمووی.

لەدواییدا دیسان عەرزی‌کرد: بۆیە هاتووم شتێکت لێ‌ئەپرسم کە غەیری پێغەمەر یا یەك دوویەکی تر کەس نایزانێ. فەرمووی: نەفعت پێ ئەدا ئەگەر [بە راستیی] خەبەرت بدەمێ؟ عەرزی‌کرد: بە هەردوو گوێم گوێی لێ ئەگرم. عەرزی‌کرد: هاتووم لە (وەلەد)لێت ئەپرسم [کە نێـــر و مێیی لە چی ئەبێ] فەرمـــووی: ئاوی پیـــاو سپی‌یـە، ئاوی ژن زەردە، کە لەگەڵ یەکا دروست بوون مەنیی پیاوەکە کەوتە سەر مەنیی

ژنەکەوە بە ئیذنی خوا ئەبن بە نێر. ئەگەر مەنیی ژنەکە سەر مەنیی پیاوەکە کەوت بە ئیذنی خوا ئەیکا بە مێ. یەهوودی‌یەکە عەرزی‌کرد: راستت فەرمـــوو تۆ پێغـــەمـــەری، گەڕایـــەوەو رۆیی. پێغـــەمـــەر -ﷺ- فەرمووی: ئەمە ئەوەی لێ‌پرسیم کە پرسیی هیچم لە عیلمی ئەوە لە لا نەبوو، تا خوا ـ عزوجل ـ ئەو عیلمەی بۆ ناردم.

**١٧٩٣/٣٥- عن ابن عباس [رضي الله تعالى عنهما] أن النبي -ﷺ- قام من الليل فقضى حاجته، ثم غسل وجهه ويديه ثم نام. م - ٢/٣٧٢.**

**تەرجەمە:**

ئیبن وعەباس ـ رضي الله تعالى عنه ـ ئەفەرموێ: پێغەمەر -ﷺ- شەو تەشریفی هەڵسا، قەزای حاجەتی‌کردو دەموچاوو دەستی شت و نوست.

**١٧٩٤/٣٦- عن عائشة [رضي الله تعالى عنها] قالت: كان رسول الله -ﷺ- إذا كان جنبا فأراد أن يأكل أو ينام توضأ وضوءه للصلاة [قبل أن ينام. أخرى] م - ٢/٣٧٣.**

**تەرجەمە:**

عائیشە ـ رضي الله تعالى عنها ـ ئەفەرموێ: پێغەمەر -ﷺ- کە جونوب بوایەو ئیرادەی بوایە کە نان بخوا یا بنوێ لە پێشا دەزنوێژی شتوە وەك بۆ نوێژ دەزنوێژی ئەشت.

**١٧٩٥/٣٧- عن ابـن عمــر [رضي الله تعــالى عنهمــا] أن عمــر بن الخطاب [رضي الله تعالى عنه] سأل رسول الله -ﷺ-: أيرقد أحدنا وهو**

**جنب؟ قال: نعم إذا توضأ أحدكم فليرقد. ح ـ ١/ ٣٣٠. م ـ ٢/ ٣٧٤ وفيه: قال: نعم ليتوضأ ثم لينم حتى يغتسل إذا شاء.**

**تەرجەمە:**

ئیمامی عومەر ـ رضي الله تعالى عنه ـ لە پێغەمەر ـ ﷺ ـی پرسی: یەکێك جونوب بێ ئەنوێ؟ فەرمووی: بەڵێ دەزنوێژ بشواو بنوێ تا وەختێ کە هەوەسی هێنا غوسڵ بکا.

**١٧٩٦/٣٨ـ وعنه أنه قال: ذكر عمر بن الخطاب [رضي الله تعالى عنه] لرسول الله ـ ﷺ ـ أنه تصيبه الجنابة من الليل. فقال له رسول الله ـ ﷺ ـ: توضأ، واغسل ذكرك، ثم نم. ح ـ ١/ ٣٣١. م ـ ٢/ ٣٧٤. ن.**

**[في رواية النسائي عن طريق ابن عوف عن نافع قال: أصاب ابن عمر جنابة فأتى عمر ـ رضي الله تعالى عنه ـ فذكر ذلك له، فأتى عمر النبي ـ ﷺ ـ قسطلاني]**

**تەرجەمە:**

عەبدوڵڵای کوڕی عومەر شەوێ جونوب ئەبێ، یێتە خزمەت باوکی عەرزی ئەکا، ئەویش تەشریفی ئەچێتە خزمەت پێغەمەر ـ ﷺ ـ عەرزی ئەکا. بە ئیبن وعومەر ئەفەرموێ: دەزنوێژ بشۆو ذەکەرت بشۆ، لە پاشا بنو.

ظاهیری ریوایەتەکەی بوخاریی وایە کە عومەر ـ رضي الله تعالى عنه ـ بۆ خۆیی لە پێغەمەر ـ ﷺ ـ پرسی.

**١٧٩٧/٣٩ـ عبد الله بن أبي قيس قال: سألت عائشة [رضي الله تعالى**

عنها] عن وتر رسول الله ـ ﷺ ـ فذكر الحديث. قلت: كيف كان يصنع في الجنابة؟: أكان يغتسل قبل أن ينام؟ أم ينام قبل أن يغتسل؟ قالت: كل ذلك قد كان يفعل؛ ربما اغتسل فنام، وربما توضأ فنام. قلت: الحمد لله الذي جعل في الأمر سعة. م ـ ٢/ ٣٧٤.

تەرجەمە:

عەبدوڵڵای کوری ئەبوقەیس ئەفەرموێ: لە حەزرەتی عایشەم پرسی لە وەتری پێغەمەر ـ ﷺ ـ [لە پاشا] عەرزم کرد: پێغەمەر ـ ﷺ ـ کە جونوب بوایە چۆنی ئەکرد؟: غوسڵی ئەکردو ئەنوست؟ یا لە پێش غوسڵ کردنا ئەنوست؟ فەرمووی: هەمووی بوە، گەلێ جار غوسڵی ئەکرد ئەمجا ئەنوست، گەلێ جاریش دەزنوێژی ئەشت و ئەنوست. وتم: (الحمد لله) کە خوا تەوسیعی کردوە لە ئیشا.

١٧٩٨/٤٠ـ عن أبي سعيد الخدري [رضي الله تعالى عنه] قال: قال رسول الله ـ ﷺ ـ: إذا أتى أحدكم أهله ثم أراد أن يعود فليتوضأ. م ـ ٢/ ٣٧٥.

تەرجەمە:

پێغەمەر ـ ﷺ ـ فەرمووی: ئینسان کە لەگەڵ ژنی خۆیا دروست بوو ئیرادەی کرد دووبارەی بکاتەوە [لە پێش بادانەوەیا] دەزنوێژ بشوا.

بۆ جونوب سونەتە لە پێش خواردن و خواردنەوەو نوستن و دووبارەکردنەوەی جیماعا دەزنوێژ بشوا.

## الجنب لا ينجس[1]

**٤١/ ١٧٩٩- عن أبي هريرة [رضي الله تعالى عنه] أن النبي -ﷺ- لقيه في بعض طريق المدينة وهو جنب [فأخذ بيدي. أخرى] فانخنست [فانتجست، نسخة، فانخنس، نسخة] منه فذهب فاغتسل ثم جاء، فقال: أين كنت يا أبا هريرة؟ قال: كنت جنبا، فكرهت أن أجالسك وأنا على غير طهارة. فقال: سبحان الله إن المؤمن لا ينجس. ح - ١/ ٣٢٨. ح - ١/ ٣٣٠. م - ٢/ ٤٥٢. بفرق لا يخلّ أصلا. د، ت، ن، جه.**

**تەرجەمە:**

ئەبوهورەیرە - رضي الله تعالى عنه - ئەفەرموێ: پێغەمەر -ﷺ- لە بەعزێ رێی مەدینەدا پێم گەیی، منیش جونوب بووم، دەستی گرتم [لە خزمەتیا رۆییم تا تەشریفی دانیشت. أخرى] خۆم بە پیس ئەزانی لێی جۆی بوومەوە، چووم غوسڵم کردو هاتمەوە فەرمووی: ئەبوهورەیرە لە کوێ بووی؟ عەرزم کرد: جونوب بووم حەزم نەکرد بە لەشی پیسەوە لە خزمەتتا دابنیشم، [چووم غوسڵم کرد] فەرمووی: (سبحان الله) موئمین پیس نابێ.

عەطاء ئەفەرموێ: جونوب حەجامەت ئەگرێ، نینۆك ئەکا، سەری ئەتاشێ، با دەزنوێژیش نەشوا. عەبدورەزاق ئەوەی لە قسەی عەطا زیاد کردوە: کە ذاروویش ئەگرێ. ح - ١/ ٣٢٩.

---

(١) لەشپیس پیس نابێ.

# الحيض والنفاس والإستحاضة[1]

١/١٨٠٠ـ عن عائشة [رضي الله تعالى عنها] قالت: قال لي النبي ـﷺـ: ناوليني الخُمْرة [السجادة: حصيرا أو غيره] من المسجد. قالت: فقلت: إني حائض. فقال: إن حيضتكِ ليست في يدكِ، فناولته. م ـ ٢/٣٦٥.

تەرجەمە:

حەزرەتی عایشە ـ رضي الله تعالى عنها ـ ئەفەرموێ: پێغەمەر ـﷺـ لە مزگەوتەوە فەرمووی: بەرماڵەکەم بدەرێ. عەرزم کرد: لە حەیضام. فەرمووی: حەیزەکەت لە دەستتا نیە! ئەمجا بەرماڵەکەم دایێ.

دورستە حائیض دەست بەرێ بۆ ناو مزگەوت.

٢/١٨٠١ـ عن عائشة [رضي الله تعالى عنها] قالت: كنت أشرب وأنا حائض، ثم أناوله النبي ـﷺـ فيضع فاه على موضع فيَّ فيشرب، وأتعرَّق العَرْق وأنا حائض ثم أناوله النبي ـﷺـ فيضع فاه على موضع فيَّ. م ـ ٢/٣٦٧.

تەرجەمە:

عایشە ـ رضي الله تعالى عنها ـ ئەفەرموێ: کە لە حەیزا بووم ئاوم ئەخواردەوە، لە پاشا ئاوەکەم ئەدا بە پێغەمەر ـﷺـ دەمی ئەنایە جێ دەمی من و ئاوی ئەخواردەوە. لە حەیزا بووم ئێسکێ کە گۆشتی پێوە بوو ئەمکرانەوە لە پاشا ئەم دا بە پێغەمەر ـﷺـ دەمی ئەنایە سەر جێ‌دەمی من. یەعنی ئەویش ئەیکرانەوە.

---

(١) باسی بێ‌نوێژیی ئافرەت.

٣/١٨٠٢- عن أنس [رضي الله تعالى عنه] أن اليهودَ كانوا إذا حاضت المرأة فيهم لم يواكلوها، ولم يجامعوهن في البيوت، فسأل أصحاب النبي -ﷺ- النبيَّ فأنزل الله - عزوجل -: ﴿ويسألونك عن المحيض، قل هو أذى فاعتزلوا النساء في المحيض - إلى آخر الآية - [ولا تقربوهن حتى يطهـرن، فإذا تطهـرن فأتـوهن من حيث أمـركم الله، إن الله يحب التوابين ويحب المتطهرين﴾[1] البقرة. فقال رسول الله -ﷺ-: إصنعوا كل شيء إلا النكاح. فبلغ ذلك اليهود، فقالوا: ما يريد هذا الرجل أن يدع من أمرنا شيئا إلا خالفَنا فيه! فجاء أُسيد بن حُضير وعَبَّاد بن بشر [رضي الله تعالى عنهما] فقالا: يارسول الله إن اليهود تقول كذا وكذا فلا نجامعهن. فتغير وجه رسول الله -ﷺ- حتى ظننا أن قد وجد عليهما، فخرجا، فاستقبلتهما هدية من لبن إلى النبي -ﷺ- فأرسل في آثارهما فسقاهما، فعرفا أن لم يجد عليهما م - ٢/٣٦٨.

تەرجەمە:

ئەنـەس - رضي الله تعـالى عنـە - ئەفـەرمـوێ: جوولـەکـە ژنیـان بکـەوتـایـە حەیـزەوە نانیـان لەگـەڵ نەئـەخواردن، لەگەڵیانا لە هۆدەیێکا دانـەئـەنیشتن. ئەصحـابي پێغـەمـەر -ﷺ- ئەوەیـان لە پێغـەمـەر -ﷺ- پرسی، خوا - عزوجل - ئەو ئایەتەی نازڵ فەرموو کە مەعنای وایە: لە خوصـــووصی حەیـــزەوە سوئـــالت لێ ئـــەکـەن کە لەگـەڵ حائیضـا چە موعامەلەییێك لازمە بکرێ. پێیان بڵێ: حەیز پیسی یێکە ئینسان بێزی لێ ئەکاو ئەذێتی پێ ئەگا لێیەوە. لە حەیزا تەرکی ژنان بکەن تا پاك

(١) البقرة/ ٢٢٢.

ئەبنەوە نزیکیان مەکەون [بە جیماع] کە پاك بوونەوەو غوسڵیان کرد لەو جێیەوە کە خوا ئەمری پێ‌کردوون لەگەڵیان دروست ببن. ئەڵبەتە خوا ئەوانــەی خۆشــەوێ کە تۆبــەکـارن و تەمیـزن و خۆیـان لە پیسی پاك ئەکەنەوە. کە ئەم ئایەتە نازڵ بوو پێغەمەر ـﷺـ فەرمووی: لەگەڵیان غەیری جیماع هەموو شتێك بکەن. ئەمە گەیی‌یەوە بە جوولەکە وتیان: ئەم پیـاوە هیـچ لە دینی ئێمـە ناییڵێ هەر ئەبێ موخـالـەفـەتمـان بکـا! ئوسەیدی کوڕی حوضەیرو عەببادی کوڕی بیشر هاتنە خزمەت پێغەمەر ـﷺـ عەرزیــان کرد: (یـارسـول الله) جوولـەکـە وا ئەڵێن و وا ئەڵێن، ئێمـەیش لە حەیـزا لە هۆدەییێکـا لەگـەڵیـان دانـەنیشین. پێغەمەر ـﷺـ رەنگی تێکچــوو تا وامــان ظەن برد کە غەضــەبی لێ‌گـرتـوون، ئەوان چوونـەدەرێ رۆیینـەوە،هەدی‌یەیەکی شیـر بەرەوپیریان هات بۆ خزمەت پێغـەمـەر ـﷺـ پێغـەمـەر ـﷺـ ناردی بەشـوێنیـانـا، لەو شیـرەی دانێ خواردیانەوە، ئەمجا زانییان کە پێغەمەر ـﷺـ غەضەبی لێ نەگرتوون.

**٤/١٨٠٣ـ ام سَلَمَة [رضي الله تعالى عنها] قالت: بينا أنا مع النبي ـﷺـ مضطـجعــة في خميصــة إذ حضتُ فانسللت، فأخــذت ثيــاب حيـضـتي، قال: أنُفِستِ؟ قلت: نعم. فدعــاني فاضطجعت معــه في الخميلة.** ح ـ ٣٣٧/١/١. م ـ ٣٦٢/٢. ن.

**تەرجەمە:**

ئومم و سەلەمە ـ رضي الله تعالى عنها ـ ئەفەرموێ: لە باخەڵ پێغــەمــەر ـﷺـ دا لە ژێـر بەطـانییێکی قەدیفـەدا راکشـابـووم کەوتمـە حەیزەوە، لە ژێـر بەطـانیـەکـە کشامە دەرێ، لیباسی بێ‌نوێژییم لەبەر

کرد، فەرمــووی:بێنــوێــژ بووی؟ عەرزم کرد: بەڵــێ. بانــگــی کردم لەگەڵیدا لە ژێر بەطانیەکەدا ڕاکشام.

**٥/١٨٠٤ـ عن عروة أنه سئل: أتخدمني الحائض أو تدنو مني المرأة وهي جنب؟ فقال عروة: كل ذلك عليّ هين، وكل ذلك تخدمني وليس على أحـد في ذلـك بأس: أخبـرتني عائشـة [رضي الله تعالى عنها] أنها كانت ترجــل رسـول الله ـﷺـ وهي حائض، ورسـول الله ـﷺـ حينئـذ مجــاورٍ في المسجـد يدني لهـا رأسـه وهي في حجـرتهـا فتـرجله وهي حائض. ح ـ ١/٣٣٦.**

**تەرجەمە:**

یەکێ لە عوروەی پرسیی: ژنی حەیزدار خزمەتم ئەکا یان نا؟ ژنی لەش پیس دروستە لێم نزێك بێتەوە؟ عوروە فەرمووی: ئەوانە هەمووی سووکە لای من، هەردووکیان خزمەتم ئەکەن، هیچ زەرەرێکی بۆ هیچ کەس نیە: عایشە ـ رضي الله تعالى عنها ـ خەبەری داومێ کە لە وەختی بێنوێژیدا سەری پێغەمەری ـﷺـ داهێناوە، پێغەمەر ـﷺـ لەو وەختەدا موجاویر بوو لە مزگەوتا [یەعنی لە ئیعتیکافا بوو] من لە حوجرەی خۆما بووم سەری لێ نزیك ئەختسمەوە بە بێنوێژیی سەرم دائەهێنا.

[یەعنی بە طەریقی ئەولا لە لەش پیسی جونوبی کەوتن دروستە، سوئال کردنی لە جونوب شتێکی سەیرە تێیفکرە!

ئەبــو وائیــل جاریــەی حائیضی ئەنــارد =بــۆ لای= ئەبــورەزین مەسعــوودی کوڕی مالیکی ئەســەدیی، قورئــانی بۆ ئەهێنـا، بە قوڵفی کیفـەکـەی ئەیگـرت، یەعنی بۆ ژنی بێنـوێـژ بێ ئەمـە دەستی لێبدا

هەڵگرتنی قورئان دروستە. [فەقەط ئەمە ئیجتیهادی شەقیقە] ح ـ ١/٣٣٦.

**٦/١٨٠٥ـ عن منصور بن صفية أن أمه حدثته أن عائشة [رضي الله تعالى عنها] حدثتها أن النبي ـﷺـ كان يتكىء في حجري وأنا حائض ثم يقرأ القرآن. ح ـ ١/٣٣٦. م ـ ٢/٣٦٨.**

تەرجەمە:

پێغەمەر ـﷺـ ئانیشکی لە باوەشی حەزرەتی عائیشەدا ـ رضي الله تعالى عنها ـ داداوەو قورئانی خوێندوە، عائیشە ـ رضي الله تعالى عنها ـ ئەفەرموێ: من لە حەیزا بووم.

**٧/١٨٠٦ـ عن عائشة [رضي الله تعالى عنها] قالت: كنت أغتسل أنا والنبي ـﷺـ من إناء واحد وكلانا جنب، وكان ـ عليه الصلاة والسلام ـ يأمرني فأتّزر فيباشرني وأنا حائض، وكان يخرج رأسه إلي وهو معتكف فأغسله وأنا حائض. ح ـ ١/٣٣٨. م ـ ٢/٣٦٤. الى ٣٦٥ وأوله في حديث آخر مرَّ.**

تەرجەمە:

عایشە ـ رضي الله تعالى عنها ـ ئەفەرموێ: من و پێغەمەر ـﷺـ هەردوکمـــان جونـوب بووین لە زەرفێکـا غوسڵمـان ئەکـرد [لـە وەختی حەیـزا] ئەمـری پێ ئەکـردم پێشگیـرێکم ئەگرتەوە لە باخەڵیا ئەنوستم، لەشی لە لەشم ئەکەوت، لە مزگەوتا (معتكف)[1] بو سەری لە مزگەوت

(١) لە مزگەوتا مابوەوە بۆ خوداپەرستیی.

ئەهێنایە دەرێ بۆ لای من سەریم ئەشت منیش لە حەیزا بووم.

**١٨٠٧/٨ـ عن عائشة [رضي الله تعالى عنها] قالت: كانت إحدانا إذا كانت حائضا فأراد رسول الله ـﷺـ أن يباشرها أمرها أن تتَّزر في فور حيضتها ثم يباشرها. قالت: وأيكم يملك إربه كما كان النبي ـﷺـ يملك إرْبه؟! ح ـ ١/٣٣٨. م ـ ٢/٣٥٧. د، جه.**

**تەرجەمە:**

عایشە ـ رضي الله تعالى عنها ـ ئەفەرموێ: یەکێکمان کە بێنوێژ بووینایە(1) پێغەمەر ـﷺـ ئیرادەی ئەوەی بوایە کە لەیەك بکەون ئەمری پێ ئەفەرموو: کە لە گەرمەی حەیزەکەیا، لە ئەووەڵیا پێشگیرێکی ئەگرتەوەو لەگەڵی رائەکشا ـ بێ ئەمە موجامەعەی لەگەڵ بکا ـ ئەمما کێ ئەتوانێ خۆی بگرێو مالیکی نەفسی خۆی بێ وەك ئەو قودرەتی بوو بە سەر نەفسی خۆیا؟!

**١٨٠٨/٩ـ ميمونة [رضي الله تعالى عنها] تقول: كان رسول الله ـﷺـ إذا أراد أن يباشر امرأة من نسائه أمرها فاتزرت وهي حائض. ح ـ ١/٣٣٩. م ـ ٢/٣٥٨. بفرق ما. د، جه.**

**تەرجەمە:**

مەیموونە ـ رضي الله تعالى عنها ـ ئەفەرموێ: کە پێغەمەر ـﷺـ ئیرادەی بوو کە لە حەیزا لەگەڵ یەکێ لە ژنەکانی بنوێو لەشی لە لەشی بکەوێ ئەمری پێئەکرد کە پێشگیرێ بگرێتەوە.

---

(١) لێرەدا بگوترێ: ئەگەر یەکێکمان بێنوێژ بوایەو پێغەمەر... باشترە.

**١٠/١٨٠٩ـ وعنها قالت: كان النبي ـﷺـ يضطجع معي وأنا حائض وبيني وبينه ثوب. م ـ ٢/٣٦٢.**

تەرجەمە:

مەیموونە ـ رضي الله تعالی عنها ـ ئەفەرموێ: پێغەمەر ـﷺـ لەگەڵم رائەکشاو جلێکمان لە بەینا بوو منیش بێنوێژ بووم.

**١١/١٨١٠ـ وعنها قالت: كان رسول الله ـﷺـ يباشر نساءه فوق الإزار وهن حُيَّض. م ـ ٢/٣٥٨.**

تەرجەمە:

مەیموونە ـ رضي الله تعالی عنها ـ ئەفەرموێ: پێغەمەر ـﷺـ لە ژوور[1] ئیزارەوە لەگەڵ ژنەکانیا موباشەرەی ئەکرد کە لە حەیزا بوون.

ئیتر لەم بابەدا نەقڵی حەدیث بەسە هەموو وەك یەك وانە. ئیبراهیمی نەخەعیی ئەڵێ: قەیناکا ژنی بێنوێژ ئایەتێ بخوێنێ. ئیبن وعەباس ـ رضي الله تعالی عنهما ـ ئەفەرموێ: گوناه نیە ئینسانی لەش پیس قورئان بخوێنێ. حەکەم ئەفەرموێ: من بە لەشی پیسەوە حەیوان سەرەبڕم خوایش ئەفەرموێ: ئەو حەیوانەی کە لە وەختی سەربریناناوی خوای لەسەر نەبراوە مەیخۆن [کە وابێ بە لەشی پیسەوە قورئان ئەخوێنرێ] ح ـ ١/٣٤١.

**١٢/١٨١١ـ عن عائشة [رضي الله تعالى عنها] قالت: كان النبي ـﷺـ يذكر الله على كل أحيانه [أي زمانه] علقه البخاري في ح ـ ١/٣٤١،**

---

(١) ئەگەر بگوترێ (لەسەر) باشترە.

ووصله م ـ ٢/٤٥٥.

تەرجەمە:

حەزرەتی عایشـە ـ رضي الله تعـالى عنهـا ـ ئەفـەرمـوێ: پێغەمەر ـﷺـ هەموو وەختێ ذیکری خوای ئەکرد.

**١٨١٢/١٣ـ عن عائشـة [رضي الله تعـالى عنهـا] أنهـا قالت: قالت فاطمـة بنت أبي حُبَيش لرسـول الله: يارسـول الله إني لا أطهـر أفأدع الصـلاة؟ فقـال رسـول الله ـﷺـ:[لا. أخـرى] إنمـا ذلـك عرق وليس بالحيضـة، فإذا أقبلت الحيضـة فاتـركي الصـلاة، فإذا ذهب قدرهـا فاغسلي عنك الدم وصلي. ح ـ ١/٣٤٣/٢٨٩ وفيه: قال [هشام] وقال أبي [عروة] ثم توضئي لكل صلاة حتى يجيء ذلك الوقت. ت، ن، د، م ـ ٢/٤٠٨.**

تەرجەمە:

عایشـە ـ رضي الله تعـالى عنهـا ـ ئەفـەرمـوێ: فاطیمـەی کچی ئەبوحوبەیش ـ رَضي الله تعالى عنها ـ هاتە خذمەت پێغەمەر ـﷺـ عەرزی‌کرد: (یارسول الله) لە حەیز پاك نابمەوە؛ نوێژ تەرك بکەم یا نەیکەم؟ فەرمووی: تەرکی مەکە ئەوە رەگێکە [خوێنی بەرەبێ] حەیز نیە، کە وەختی حەیزت [بە عادەتی پێشووت] هات نوێژ تەرك بکە تا بە قەد موددەتی حەیزت رائەبوورێ، ئەو وەختە خوێنەکەت بشۆو نوێژ بکە، بۆ هەموو نوێژێ دەزنوێژ بشۆرەوە.

**١٨١٣/١٤ـ عن ابن عباس [رضي الله تعالى عنهما] أن النبي ـﷺـ خرج من الخـلاء فأتي بطعـام فذكـروا له الـوضـوء [فقالوا: ألا تتوضأ؟**

أخرى.م] فقال: أأريد أن أصلي فأتوضأ؟ م ـ ٤٥٥/٢.

تەرجەمە:

پێغەمەر ـ ﷺ ـ تەشریفی ئەچێ بۆ قەزای حاجەت کە تەشریفی هاتەدەرێ نانیان بۆ هێنا [و دەستی کرد بە عافیەت کردنی] عەرزیئەکەن: دەزنوێژ ناشۆی؟ [یەعنی بۆ نان خواردن] فەرمووی: بۆ من نوێژ ئەکەم تا دەزنوێژی بۆ بشۆم؟

ئەم حەدیثە موناسبی دەزنوێژە

١٥/١٨١٤ـ عن أنس [رضي الله تعالى عنه] أنه قال: أقيمت صلاة العشاء فقال رجل: لي حاجة. فقام النبي ـ ﷺ ـ يناجيه حتى نام القوم أو بعض القوم، ثم صلوا. م ـ ٤٥٨/٢.

١٦/١٨١٥ـ وعنه كان أصحاب رسول الله ـ ﷺ ـ ينامون ثم يصلون ولا يتوضؤن. م ـ ٤٥٨/٢.

ئەم دوو حەدیثە موناسبی دەزنوێژن

تەرجەمە:

قامەتی نوێژکرا، پیاوێ هاتە خزمەت پێغەمەر ـ ﷺ ـ عەرزیکرد: ئیحتیاجییێکم هەیە. پێغەمەر ـ ﷺ ـ تەشریفی هەڵسا قسەی لەگەڵ کرد تا خەڵقەکە یا فەرمووی: تا بەعزێ لە خەڵقەکە نوستن، لە پاشا نوێژیان کرد [یەعنی دەزنوێژیان نەشتەوە].

ئەصحابی پێغەمەر ـ ﷺ ـ ئەنوستن لە دواییدا نوێژیان ئەکردو دەزنوێژیان نەئەشتەوە.

لەم خوصووصەوە لە موسلیما حەدیثی (متقارب الألفاظ)و (متحد

المعنى) زۆرە، هەمـوو دەلالـەت ئەكـەن لەسـەر ئەمـە بە خەو دەزنوێژ ناشكێ بە پێوە بێ، بە دانیشتنەوە بێ، بە راكشانەوە بێ، (متمكن)[1] بێ یا نەبێ.

١٨١٦/١٧- عن عائشة [رضي الله تعالى عنها] أن أسماء [بنت شكل] سألت النبي -ﷺ- [ورضي عنها -] عن غسل المحيض، فقال: تأخذ إحداكم ماءها وسدرتها فتطهر فتحسن الطهور، ثم تصب على رأسها فتدلكه دلكا شديدا حتى تبلغ شؤن رأسها، ثم تصب عليها الماء، ثم تأخذ فرصة ممسكة فتطهر بها، فقالت أسماء: وكيف تطهر بها؟ فقال: سبحـان الله تطهـرين بهـا! فقـالت عائشـة [رضي الله تعـالى عنها] كأنها تخفي ذلك [كلَّمْتها كلاما خفيا تسمعها وحدها من نووي] [فاجتذبتها إليّ وعرفت ما أراد النبي -ﷺ- فقلت. م أخرى] تتبعين أثر الدم.

وسألته عن غسل الجنابة فقال: تأخذ ماء فتطهر فتحسن الطهور، أو تبلغ الطهـور، ثم تصب على رأسهـا فتـدلكـه حتى تبلغ شؤن رأسهـا [الخطـوط التي في عظم الجمجمـة] ثم تفيض عليهـا المـاء. فقـالت عائشة [رضي الله تعالى عنها]: نعم النساء نساء الأنصار لم يكن يمنعهن الحياء أن يتفقهن في الدين. م - ٤٠٦/٢، ٤٠٥. ح - ٣٤٦/١. ليس فيه حديث غسل الجنابة.

[الفـرصـة بتثليث الفـاء: قطعـة. وبفتـح القـاف والصاد: ما يؤخذ بطرف الأصابع. (وەك نوقورچ) من قسطلاني]

---

(١) قاچی دابێتە ژێر خۆیو پتەو دانیشتبێ.

**تەرجەمە:**

عایشــە - رضي الله تعــالى عنهـا - ئەفـەرمـوێ: ئەسمـای کچی شەکەل لە پێغەمەر-ﷺ-ی پرسیی لە غوسڵ کردن بۆ حەیض. پێغەمەر -ﷺ- فەرمووی: یەکێکتان کە غوسڵی لە حەیض کرد ئاوو (سدری) حازر بکــا خۆی جوان - جوان پاك بکــاتــەوە، لە دوایيــدا ئاو بکــا بەسەریا، بە قایم دەستی لێ بخا تا پێستی سەری تەڕ ئەکا، لە دواییدا ئاو بکا بە سەری خۆیا، لە دواییدا پارچەیێ لە میسك بێنێ خۆیی پێ پاك بکــاتــەوە. ئەسمــاء عەرزیکـرد: چۆن خۆیی پێ پاك بکـاتـەوە؟ فەرمــووی: (سبحــان الله) خۆتی پێ پا بکـەرەوە! عایشـە - رضي الله تعــالى عنهــا - بە دزییــەوە پێی فەرمــوو [فــەرمـووی: تێگـەییم کە مەقصـوودی پێغـەمـەر -ﷺ- چیـە، رامکێشـایـە لای خۆمەوە پێم وت. أخری] بیخەرە شوێن حەیزەکەوە.

هەم ئەسما لە غوسڵی جەنابەتی لێ پرسی. فەرمووی: ئاو بێنە خۆتــی پێ پا بکــەرەوە، جوان - جوان جێ تارەتــی پێ بشــۆ، یا فەرمووی: لە تارەتا موبالەغە بکە لە دواییدا ئاو بکە بەسەرتا تا ئەگاتە پێستی سەرت، دەستی لێ بخە، لە پاشا ئاو بکە بەسەر خۆتا. عایشە - رضي الله تعــالى عنهـا - فەرمـووی: ژنی ئەنصــار چە ژنێکی باشن!! حەیا لەوەی مەنع نەکردوون کە دینی خۆیان فێر ببن.

**١٨١٧/١٨- عائشة - رضي الله تعالى عنها - أن النبي -ﷺ- اعتكف معـه بعض نسائـه [سـودة بنت زمعة] وهي مستحاضة ترى الدم، فربما وضعت الطست تحتهــا من الــدم. وزعم عكـرمـة أن عائشـة رأت ماء**

**العصفر [زهر القرطم] فقالت: كان هذا شيء كانت فلانة تجده. ح - ١/٣٤٤. ح - ٣/٤٣٦ وفيه: فكانت ترى الحمرة والصفرة، فربما وضعنا الطست تحتها وهي تصلي. ح - ٣/٤٣٦. د، ن، جه.**

تەرجەمە:

عائیشە - رضي الله تعالی عنها - ئەفەرموێ: بەعزێ ژنانی پێغەمەر ـﷺـ لە مەسجیدی نەبەوییا لەگەڵ پێغەمەر ـﷺـ چوە ئیعتیکافەوە، موستەحاضە بوو خوێنی زەردو سووری لەبەر رۆیی، زۆر جار تەشتمان لە ژێرا دائەناو نوێژی ئەکرد. عەکرەمە ئەڵێ: حەزرەتی عایشە - رضي الله تعالی عنها - چاوی کەوت بە ئاوێ وەك ئاوی (قرطم) بوو فەرمووی: ئەم ئاوە شتێکە وەك ئەو ئاوەیە کە فلانە ژن [یەعنی سەودە] دیبووی.

ئەو ژنە مەعلووم نیە لە ئەزواجی طاهیرات کامیان بوە: سەودەیە، یا ئومم وحەبیبەیە، یا ئومم وسەلەمەیە - رضي الله تعالی عنهن].

**١٩/١٨١٨- عن مجاهد قالت عائشة [رضي الله تعالى عنها]: ما كانت لإحدانا إلا ثوب واحد تحيض فيه، فإذا أصابه شيء من دم قالت بريقها فقصعته فدلكته بظُفْرها. ح - ١/٣٤٤.**

تەرجەمە:

عائیشە - رضي الله تعالی عنها - فەرمووی: هیچ یەکێ لە ئێمە زیاد لە لیباسێکی نەبوو،[1] کە خوێنی حەیزی لێ بکەوتایە بە تفی

(١) لێرەدا بە گوێرەی حەدیثەکە دەبوو بیگوتایە: زیاد لە لیباسێکی تایبەتی حەیزمان نەبوو، ئیتر مانای وا نیە هیچ لیباسی دیکەیان بۆ کاتی پاکی نەبووبێ.

تەڕی ئەکردو بە نینۆك ئەیکران.

ئەم حەدیثە ظاهیری وا ئەگەیێنێ کە خوێن با پیس نەبێ ئەمما تەئویل کراوە بەوە کە عەفوی لێ درابێ، یەعنی کەم بێ، مەعلوومیش نیە کە نوێژی پێوە کردبێ.

**٢٠/١٨١٩- عن أم عطية [رضي الله تعالى عنها] قالت: كنا نُنْهىٰ أن تُحـدَّ على ميت فوق ثلاث إلا على زوج أربعـة أشهـر وعشـرا، ولا نكتحـل، ولا نتطيـب، ولا نلبس ثوبـا مصبـوغـا إلا ثوب عصب [دەزووەکەی ڕەنگ کرابێ ئەمجا تەنرابێ] وقد رُخِّص لنا عند الطهر إذا اغتسلت إحدانـا من محيضهـا من كُسْت أظفـار [نوع من الطيب] وكنا ننهى عن إتباع الجنائز. حـ ١/٣٤٦ م - ٦/٣٣١ وفيه: أو أظفار. د، ن، جه، بخاري في النكاح أيضا. ح - ٨/١٨٣.**

**تەرجەمە:**

ئومم وعەطییە - رضي الله تعالى عنها - ئەفەرموێ: نەهی کراوین لەوە کە چوار مانگ و دە شەو بۆ مێردمردوو لە سێ ڕۆژ بۆ غەیری ئەوان زیاتر تەعزیە بگرین. بۆ مێردمردوو نەهی کراوین لەوە کە چاو بڕێژین، کە جلی ڕەنگـاوڕەنـگ لەبـەر بکـەین، غەیـری ئەوەی کە =لـە= پێشـا دەزووو بەنەکەی ڕەنگ کرابێ ئەمجا جۆلایی کرابێ. نەهی کراوین لەوە کە عەطـر لە عەمـەل بێنین، ئیـذن دراوین کە لە حەیـز غوسڵمـان کرد (کـوست) یا (ئـەظفـار) - کە نەوعێکن لە عەطـر - لەعـەمـەل بێنین. نەهی کراوین کە لەگەڵ جەنازەدا بچین بۆ سەر قەبران.

لە جەنائیزا موسلیم ئەفەرموێ: ئەم نەهیە تەنزیهە عەزیمەت نیە.

**وكن نساء يبعثن إلى عائشة [رضي الله تعالى عنها] بالدِّرَجة فيها الكُرْسُف [لۆکە] فيه الصفرة فتقول: لاتعجلن حتى ترَين القصَّة البيضاء [ئاوێکی سپی‌یە] تريدبذلك الطهر من الحيضة [رواه مالك في الموطأ].**

**وبلغ ابنة زيد بن ثابت [رضي الله تعالى عنهما] أن نساء يدعون بالمصابيح من جوف الليل ينظرن إلى الطهر، فقالت: ما كان النساء يصنعن هذا، وعابت عليهن. ح ـ ١/٣٥١.**

**تەرجەمە:**

بەعزێ ژن لۆکەیان لە قوتوودا ئەناردە خزمەت حەزرەتی عائیشە ـ رضي الله تعالى عنها ـ زەردایی پێوە بوو، ئەیفەرموو: عەجەلە مەکەن تا ئاوی سپیی ئەبینن، یەعنی تا تەواو لە حەیز پا ئەبنەوە.

بە ئومم وکولثوومی ـ ژنی سالمی کوڕی عەبدوڵڵای کوڕی عومەر ـ کچی زەیدی کوڕی ثابیت ـ رضي الله تعالى عنهما ـ گەیی‌یەوە کە ژنان شەو بە چراوە تەماشای خۆیانیان ئەکرد بزانن لە حەیز پابوونەوە یان نا ئەو کچە عەیبی لێ‌گرتن؛ فەرمووی: ژنان وایان نەئەکرد.

**٢١/١٨٢٠ـ [معاذة] قالت لعائشة: أتجزي إحدانا صلاتها [أتقضي إحدانا الصلاة أيام حيضها؟. م] إذا طهرت؟ فقالت: أحرورية أنتِ؟! [أي أخارجية؟] كنا نحيض مع النبي ـﷺـ فلا يأمرنا به، أو قالت: فلا نفعله. ح ـ ١/٣٥١. م ـ ٢/٤١٨. وباقي الستة.**

**تەرجەمە:**

مەعاذە لە حەزرەتی عایشەی پرسیی ـ رضي الله تعالى عنها ـ: ژن کە لە حەیز پا بۆوە نوێژی بە قەزا ئەگێڕێتەوە؟ پێی‌فەرموو: بۆ تۆ خاریجیت کە بیگێڕیەوە؟! ئێمە لە زەمانی پێغەمەرا ـﷺـ بێ‌نوێژ

ئەبووین ئەمری =پێ= نەئەکردین کە قەزای بکەینەوە.

١٨٢١/٢٢- عن حفصة بنت سيرين [أخت المعبِّر محمد بن سيرين - رحمهما الله تعالى -] قالت: كنا نمنع عواتقنا [كچی عازەب] أن يخُرجن في العيدين، فقدمت إمرأة فنزلت قصر بني خلف [جد طلحة الطلحات بن عبد الله بالبصرة] فحدثت عن أختها [أم عطية أو غيرها] وكان زوج أختها غزا مع النبي -ﷺ- ثنتي عشرة [غزوة. أصيلي] وكانت أختي معه في ست، قالت: كنا نداوي الكلمى، ونقوم على المرضى، فسألتْ أختي النبي -ﷺ-: أَعلى إحدانا بأس إذا لم يكن لها جِلباب [جلى ئاودامان] أن لا تخرج [إلى نحو صلاة العيد]؟ قال [عليه الصلاة والسلام]: لتلبسها صاحبتها من جلبابها ولتشهد الخير ودعوة المسلمين. فلما قدمت أم عطية [رضي الله تعالى عنها - البصرة] سألتها: أسمعتِ النبي -ﷺ- [يقوله]؟ قالت: بأبي نعم - وكانت لا تذكره إلا قالت بأبي - سمعته يقول: تخرج العواتق [ئازادكراو لە قەهری دایك و باوك و برا] وذوات الخدور [پەردە] أو العواتق ذوات الخدر والحُيَّض، وليشهدن الخير ودعوة المؤمنين. ويعتزل الحيض المصلى. قالت حفصة: الحُيَّض فقالت: أليس تشهد عرفة وكذا وكذا [مزدلفة ومنى]؟ ح - ١/٣٥٣م - ٤/٢٢٩. [1] د، ت، ن، جه. ح - ٢/٢٠٩، ٢١٠ مختصراً. ح - ٣/١٨٥ في الحج (نەمدۆزییەوە (إلا بعد) گەڕانی زۆر)

(١) زۆر بۆ ئەم حەدیثە لە (٤/٢٢٩)دا گەڕام نەمدۆزییەوە.

**تەرجەمە:**

حەفصەی کچی سیرین، خوشکی محەمەدی ئیبنی سیرینی (معبر) ـ رحمهما الله تعالی ـ ئەفەرموێ: ئێمە مەنعی ژنی جەهێڵمان ئەکرد کە بۆ نوێژی جەژن و نوێژەبارانەو کوسووف و جومعە بچنەدەرێ. ژنێ هاتەبەصرە، لە قەصری بەنیخەلەفا دابەزی، لە خوشکێکی خۆیەوە ریوایەتی کرد، مێردی خوشکەکەی لە خزمەت پێغەمەرا ـﷺـ دوانزە غەزای کردوە، لە شەش غەزادا لە خزمەت پێغەمەرا ـﷺـ بوە.

خوشکەکەی ئەیفەرموو : ئێمە دەوای بریندارمان ئەکرد تەماشای نەخۆشمان ئەکرد. خوشکەکەی لە پێغەمەری ـﷺـ پرسیوە: هیچ گوناهی هەیە کە ژنێ چارشێوی نەبێ خۆیی پێ دابپۆشێ نەچێ بۆ نوێژی جەژن و ئەمثالی؟ پێغەمەر ـﷺـ فەرمووی: رەفیقی ئەو ژنە چارشێوی خۆیی بداتێ، یا ئەگەر چارشێوەکەی گەورە بێ لەگەڵ خۆی بەو چارشێوە دایپۆشێ حازری خێرو دۆعای موسوڵمانان بێ. کە ئومم وعەطیەی ئەنصاریە هاتە بەصرە حەفصە ئەفەرموێ: لێم پرسی: تۆ لە پێغەمەر ـﷺـ ت بیستوە کە وای فەرمووبێ؟ ئومم وعەطیە ـ رضي الله تعالی عنها ـ فەرمووی: باوکم بە صەدەقەی بێ ـ هەروەختێ کە ئومم وعەطیە ـ رضي الله تعالی عنها ـ ناوی پێغەمەری ـﷺـ ئەبرد بێ ئەمەنەڵێ باوکم بە صەدەقەی بێ ناوی نەئەبرد ـ فەرمووی: لێم بیست ئەیفەرموو: ژنی جەهێل کە لە قەهری دایك و باوك و کەس و کار ئازاد بوو بێ، یەعنی سەربەست و رەشیدە بوو بێ و، ئەوانە کە مەستوورەن و ئەوانەی کە حەیزیان بێ، لەگەڵ موسوڵمانانا بچنە دەرێ و حازری خێرو دۆعای موئمینان بێ. ئەو ژنانەی کە حەیزیان بێ لە جێ

نوێـژەکـەیـان دوور دابنیشن. حەفصـە ئەفـەرمـوێ: لە ئومم وعەطیە - رضي الله تعــالى عنهــا - م پرسی: بۆ ژنی بێ‌نـوێـژ یش ئەبێ بچنـە دەرێ؟! فەرمـووی: بۆچ ئەوان ناچنـە عەرەفـەو مینـاو نوێـژەبارانە؟ بۆ نوێژی جەژنیش بچنەدەرێ هیچ نابێ.

ئیـمــامی عەلی‌و شورەیحی قاضیی - رضي الله تعــالى عنهمــا - ئەفەرموون: ئەگەر ژنێ لەوانەی کە دیندارن لە کەس و کاری خۆی شاهید بێنن کە لە مانگێکا سێ جار حەیزی دیوە پێی بروا ئەکرێ. یەعنی عیدەی طەلاقی رائەبوورێ. عەطا ئەفەرموێ: مودەتی حەیز لە رۆژ یکەوەیە تا پانزە رۆژ. موعتەمەر لە سولەیمانی باوکیەوە ریوایەت ئەکا کە لە ئیبن وسیـرینی پرسیی: ژن لە دوای لەحەیز پابوونەوە بە (٥) رۆژ چاوی بە خوێن ئەکەوێ؟ فەرمووی: ژن ئەوە لە پیاو چاکتر ئەزانێ. ح - ١/٣٥٤.

**١٨٢٢/٢٣- عن أم عطية [رضي الله تعالى عنها] قالت: كنا لا نعد الكدرة والصفرة شيئا. ح - ١/٣٥٥، د، ن، جه.**

**تەرجەمە:**

ئومم وعـەطیـە - رضي الله تعـالى عنهـا - ئەفـەرموێ: [لە زەمانی پێغەمەرا -ﷺ-] بۆرایی‌و زەردایییمان بە حەیز حسێب نەئەکرد ظاهیر وایە لە غەیــری موددەتی حەیـزا، ئەممـا لە موددەتی حەیـزا ئەوە حەیـزە بە تەبەعیەتی حەیزەکەوەو لە بەرحەدیثەکەی عایشە - رضي الله تعالى عنها - کە رابــورد. سەعیــدی بنی موســەییـەب و عەطـاو لەیث و ئیمـامی شافیعیی‌و ئیمـامی ئەعظـەم و ئەحمـەد مەذهـەبیان وایە. ئیمامی مالیك ئەفەرموێ: موطلەقا ئەوانە لە حەیز مەعدوودن. ئەم حەدیثە موونافیە بۆ

ئەو مەذهەبە].

٢٤/١٨٢٣- عن عائشة [رضي الله تعالى عنها] زوج النبي -ﷺ- أن أم حبيبة [بنت جحش زوج عبد الرحمن بن عوف أخت زينب أم المؤمنين - رضي الله تعالى عنهم -] إستحيضت سبع سنين فسألت رسول الله -ﷺ- عن ذلك [فقال رسول الله -ﷺ-: إن هذه ليست بالحيضة ولكن هذا عِرْق فاغتسلي وصلِّي. قالت عائشة [رضي الله تعالى عنها]: فكانت تغتسل في مركن في حجرة أختها زينب بنت جحش [رضي الله تعالى عنها] حتى تعلو حمرة الدم الماء. م - ٢/٤١٥] فأمرها أن تغتسل فقال: هذا عرق. فكانت تغتسل لكل صلاة [تطوعا - كما عليه الشافعي - رحمه الله تعالى] ح - ١/٣٥٥. م - ٢/٤١٥.

٢٥/١٨٢٤- وعنها أنها قالت: أن أم حبيبة [رضي الله تعالى عنها] سألت رسول الله -ﷺ- عن الدم؛ فقالت عائشة [رضي الله تعالى عنها]: رأيت مِرْكنها ملآن دما، فقال لها رسول الله -ﷺ-: آمكثي قدرما كانت تحبسك حيضتك ثم اغتسلي وصلي. م - ٢/٤١٧.

(بەسە).

تەرجەمە:

عایشە - رضي الله تعالى عنها - ئەفەرموێ: ئومم وحەبیبەی ژنی عەبدورەحمانی بنی عەوف، خوشکی زەینەبەی حەرەمی پێغەمەر -ﷺ-، ورضي عنهم - حەوت ساڵ موستەحاضە بوو [لەو موددەیەدا] لە پێغەمەر -ﷺ- ی پرسیی: فەرمووی: ئەوە حەیز نیە رەگێکە [خوێنی بەربوە] ئەمری پێ فەرموو کە غوسڵ بکاو نوێژ بکا، بۆ هەموو فەرزێ غوسڵی ئەکرد. [ئەمما پێغەمەر -ﷺ- ئەمری پێ نەکرد کە بۆ هەموو نوێژێ

غوسڵ بکا، خۆی بە ئیحتیاط غوسڵی کردوە].

عایشە ـ رضي الله تعالی عنها ـ ئەفەرموێ: لە سوێنەیێکا غوسڵی ئەکــرد خوێنــەکــەی سەر ئاوەکە ئەکــەوت. پێغــەمــەر ـﷺـ ئەمــری پیٚ فــەرمــوو: بە قەد عادەتی پێشــوو بوەستــە لە پاشــا غوســڵ بکەو نوێژ بکە. [ئەم زیادەیە ئەگەیێنیٚ کە بۆ هەموو نوێژیٚ ئەمری پیٚ نەفەرموە کە غوسڵ بکا].

ئیبن وعــەبــاس [رضي الله تعــالی عنهما] ئەفەرموێ: موستەحاضە با =بە= قەد ساعەتێکیش بیٚ کە پا بوەوە غوسڵ بکاو نوێژ بکاو، مێــردیش لەگــەڵی بنــوێ، کە نوێــژی کرد نوێــژ لە جیمــاع گەورەترە بە طەریقی ئەولا جیماعی بۆ دروستە. ح ـ ۱/۳٥٦.

**۱۸۲٥/۲٦ـ عن سَمُرة بن جُنْدُب ـ رضي الله تعالى عنهما ـ أن امرأة (أم كعب م) ماتت في بطن [في نفاسها. خ كما في الجنائز] فصلى عليها النبي ـﷺـ فقــام وسطهــا. ح ـ ۱/۳٥۷، ح ـ ۲/٤۱٦، م ـ ٤/۳۰۷، ۳۰۸. د، ت، ن، جه.**

**تەرجەمە:**

سەمورەی کوری جوندوب ـ رضي الله تعالى عنهما ـ ئەفەرموێ: پێغــەمــەر ـﷺـ نوێــژی لەســەر ژنیٚ کرد کە لە نیفــاسا وەفاتی کردبوو، موقابیل بە ناوقەدی ئەو ژنە تەشریفی لە نوێژەکەیا وەستا.

**۱۸۲٦/۲۷ـ عن عبد الله بن شداد [وأمه سلمى بنت أبي عُميش أخت ميمونة ـ رضي الله تعالى عنها ـ] قال: سمعت خالتي ميمونة [رضي الله تعــالى عنها] زوج النبي ـﷺـ أنهــا كانت تكــون حائضا لا تصلي وهي**

**مفترشة بحذاء مسجد رسول الله -ﷺ- وهو يصلي على خُمرته إذا سجد أصابني بعض ثوبه. ح - ١/٣٥٧، ٣٩٦. م - ١٦٩/٣. د، جه.**

**تەرجەمە:**

عەبدوڵڵای کوڕی شەدداد، کە خوشکەزای حەزرەتی مەیموونەی حەرەمی پێغەمەرە -ﷺ- ئەفەرموێ: لە مەیموونەی پوورمم بیست - رضي الله تعالى عنها - ئەیفەرموو: بێنوێژ بووم نوێژم نەئەکرد بەرابەر بە سەجدەی پێغەمەر -ﷺ- راکشابووم، پێغەمەر -ﷺ- لە سەر سوجادەکەی خۆی نوێژی ئەکرد، کە سوجدەی ئەبرد بەعزێ جلی بەری لێم ئەکەوت.

## تەيەممـــــوم

١ /١٨٢٧- عن عائشة [رضي الله تعالى عنها] زوج النبي -ﷺ- قالت: خرجنا مع النبي -ﷺ- في بعض أسفاره [سنة ست في غزوة بني المصطلق - الفتح كما هو عند، ن، د. ] حتى إذا كنا بالبيداء [أدنى إلى مكة من ذي الحليفـة] أو بذات الجيش، انقطـع عقـد لي [مليـوانكـه] فأقام رسول الله -ﷺ- على اِلتماسه وأقام الناس معه وليسوا على ماء، فأتى الناس إلى أبي بكر الصديق [رضي الله تعالى عنه] فقالوا: ألا ترى إلى ما صنعت عائشة [رضي الله تعـالى عنهـا]؟: أقامت برسول الله -ﷺ- والناسِ، وليسوا على ماء، وليس معهم ماء؟ فجـاء أبـو بكـر [رضي الله تعـالى عنه] ورسول الله -ﷺ- واضــع رأسـه على فخـذي قد نام فقـال: حبَستِ رسـول الله -ﷺ- والنـاسَ وليســوا على ماء وليس معهم ماء! فقالت عائشة - رضي الله تعالى عنهـا -: فعـاتبني أبو بكر وقال ماشاء الله أن يقول، وجعل يطعنني بيده في خاصرتي، فلا يمنعني من التحرك إلا مكان رسول الله -ﷺ- على فخذي، فقـــام رســول الله -ﷺ- حين أصبح على غيـر ماء، فأنـزل الله تعـالى آيـة التيمم، فتيمموا، فقال أسيد بن الحضير [وهو أحد النقباء. م. - رضي الله تعـالى عنـه -]: ما هي بأول بركتكم يا آل أبي بكـر. قالت: فبعثنـا البعيـر الـذي كنت عليـه، فأصبنـا العقد تحته. ح - ١/٣٥٨، م-٢/٤٥٥. ح - ٧/٨١، و٩٧ مختصرا. ح - ٨/١١٩. ح - ١/٣١،[1] ن.

تەرجەمە:

عايشە - رضي الله تعالى عنها - ئەفەرموێ: لە خزمەت پێغەمەرا -ﷺ- [لە غەزای فەتحا؛ چونکی لە غەزای بەنیموصطەلەقا قيصەی

(١) ئەم حەديثە لە (ح - ١/٣١) دا نيەو، ئەو شوێنە پێشەکی‌يە.

ئیفکە،[1] لەو غەزایەدا پێغەمەر -ﷺ- لە سەری بەند نەبوو تەشریفی رۆیی] رۆیین تا گەیینە (ذات الجیش) ملیوانکەکەم بچرایەوە، پێغەمەر -ﷺ- تەشریفی بەنـد بوو بۆ دۆزینـەوەی، خەلقیش لە خزمـەتیـا بەنـد بوون،لەسەرئاو نەبوون ئاویشیان پێ نەبوو، هاتنە خزمەت ئەبوبەکری صەدیق - رضي الله تعالى عنه - عەرزیان کرد: ئەزانی عایشە چیکرد؟ پێغەمەر -ﷺ- و خەڵقی بەند کرد، نە لەسەر ئاون، نە ئاویان پێیە؟ ئەبوبەکر - رضي الله تعالى عنه - تەشریفی هات پێغەمەر -ﷺ- سەری لەسـەر رانم بوو، نوستبـوو، فەرمـووی: پێغـەمەرت -ﷺ- حەبس کرد! خەڵقت حەبس کرد! نە ئاویـان پێیـە نە لەسـەر ئاون. دەستی بەسـەر زەنشم =کرد= تا خوا حەز بکا سەرزەنشی کردم سیخورمەی لێ ئەدام، ئەوە نەبوایە کە سەری پێغەمەر -ﷺ- لەسەر رانم بوو نەمەتوانی ببزووم مەبـادا خەبـەری بێتـەوە. . ئەبـزووتم. کە رۆژ بۆوە پێغـەمـەر -ﷺ- تەشـریفی لە خەو هەڵسـا لەسـەر ئاو نەبـوون کە دەزنـوێـژ بشۆن، خوا ئایـەتی تەیـەممـومی نازڵ کرد =تـەیـەممـومیـان کرد= ئوسەیدی کوڕی حوضەیر - رضي الله تعالى عنه - [کە یەکێکە لە نوقەبا کە هیجرەتیان بە پێغەمەر کرد -ﷺ-] فەرمووی: ئەم بەرەکەتە کە خوا روخصەتی داین بۆ تەیەممموم وە نیە ئەووەڵ بەرەکەتی ئێوە بێ ئەی ئالی ئەبوبەکر. عایشە - رضي الله تعـالى عنهـا - ئەفـەرمـوێ: کە وشتـرەکـەیـان هەڵسـان ملیوانکەکەمان لە ژێریا دۆزیەوە.

بۆ شتی ون بوو گەڕان دروستە.

ئیلتیماس بە پیاوی گەورە لای ئەمیری لەوگەورەتر دروستە.

(١) بۆ باسی ئیفك تەماشای (ل: ٤١٥)ی بەرگی سێیەم بکە.

سەرزەنشی ئەولادو، بە خەفیفەوەلێدانی دروستە. شوکرو ثەنای ئەو کەسە کە سەبەبی نیعمەت بێ دروستە.

کە ئاو نەبوو تەیەمموم دروستە.

**٢/١٨٢٨- وفي أخرى في مسلم: جزاكِ الله خيرا، فوالله ما نزلِ بك أمر قط إلا جعل الله لكِ منه مخرجا، وجعل منه للمسلمين فيه بركة. م - ٤٤٧/٢. ح - ٣٦١/١.**

**تەرجەمە:**

لە ریوایەتێکی تری موسلیما ئوسەید ـ رضي الله تعالى عنه ـ فەرمووی: خوا جەزای خێرت بداتەوە، وەڵڵاهی هیچ تەنگانەیێکت بەسەرا نەهاتوە کە خوا لەوە نەجاتت نەداو بەرەکەتێکی بۆ موسوڵمانان تیا خەلق نەکا.

**٣/١٨٢٩- جابر بن عبد الله [رضي الله تعالى عنهما] أن النبي -ﷺ- قال أعطيتُ خمسا لم يعطهن أحد قبلي:**

**١ - نصرت بالرعب مسيرة شهر.**

**٢ - وجعلت لي الأرض مسجدا وطهورا، فأيما رجل من أمتي أدركته الصلاة فليصلِّ.**

**٣ - وأُحلِّت لي الغنائم ولم تُحلَّ لأحد قبلي.**

**٤ - وأعطيت الشفاعة.**

**٥ - وكان النبي يبعث إلى قومه خاصة وبعثت إلى الناس عامة. ح - ٣٥٩/١. م - ١٧٧/٣. وفيه:فضلت على الأنبياء بست، وذكر السادسة: وختم بي النبيون.**

**وفي أخرى: بعثت بجوامع الكلم. ونصرت بالرعب. وبينا أنا نائم**

أتيت بمفاتيح خزائن الأرض فوضعت في يدي. قال أبو هريرة: فذهب رسول الله -ﷺ- وأنتم تنتثلونها م ـ ٣/١٧٧. [تنتثلونها: تخرجون ما فيها. نووي]

تەرجەمە:

پێغەمەر -ﷺ- لەم حەدیثانەدا ئەفەرموێ: پێنج شتم پێ عەطا کراوە، لە پێش منا بە هیچ کەس نەدراوە:

١ ـ لە مانگێ رێوە، بەمە کە خەڵق لێم ئەترسێ، نوصرەت دراوم.

٢ ـ هەموو ئەرزم بۆ کراوە بە مزگەوت و، بۆم کراوە بە پاك و پاك کەرەوە لە حەدەثی ئەصغەرو ئەکبەر، لە هەر جێیێکا ئینسان وەختی نوێژی بەسەرا هات لەوێ نوێژ بکا. تەوەقوفی نەبەستۆتە سەر چوونەمزگەوت.

٣ ـ غەنیمەتم بۆ حەڵاڵ کراوە، لە پێش منا بۆ کەس حەڵاڵ نەبوە.

٤ ـ شەفاعەتی کوبرام پێ عەطا کراوە.

٥ ـ پێغەمەرانی پێش من تەنها بۆ قەومی خۆی نێرراوە من بۆ هەموو ئینسانان نێرراوم.

ئەبوهورەیرە لە ریوایەتی خۆیا ئەفەرموێ: فەرمووی: بە شەش شت بەسەر پێغەمەرانا تەفضیل دراوم. لە شەشەمیا ئەفەرموێ: پێغەمەران بە من خەتم کراون.

لە ریوایەتەکەی تریا ئەفەرموێ: بە (جوامع الکلم) نێرراوم. بە خەڵق لێم ترسانیان نوصرەت دراوم. کە نوستبووم هەموو کلیلی خەزێنەی ئەرزیان بۆ هێنام دایانە دەستم.

ئەبوهورەیرە ئەفەرموێ: پێغەمەر -ﷺ- تەشریفی لە دنیا رۆیی و ئێوە

ئەو خەزێنانە دەرئەهێنن.

ئەم حەدیثانەم رەنگە نووسیبێ.

## التيمم في الحضر[1]

عەطاء: ئاوی دەست نەکەوت، ترسا کە نوێژی بچێ تەیەمموم بکا.

حەسەنی بەصریی: نەخۆش ئاوی لابێ کەس نەبێ بیداتە دەستی تەیەمموم بکا.

ئیبن وعومەر ـ رضي الله تعالى عنهما ـ لە ئەرزێکی خۆی کە لە جوروف بو هاتەوە لە جێ مۆڵە مەڕێکا نوێژی عەصر بو [بە تەیەمموم] نوێژی کرد، لە پاشا گەیییەوە مەدینە، رۆژ ئێشتا بەرز بوو نوێژەکەی ئیعادە نەکردەوە. ح ـ ١/٣٦١

**٤/١٨٣٠ـ قال أبو جهيم [الأنصاري ـ رضي الله تعالى عنه ـ] أقبل النبي ـ ﷺ ـ من نحو بئر جمل، فلقيه رجل، فسلم عليه فلم يردّ عليه النبي ـ ﷺ ـ حتى أقبل على الجدار فمسح بوجهه ويديه ثم ردّ عليه السلام. [طبراني: وقال: إنه لم يمنعني أن أرد عليك إلا أني لم أكن على طهر]** ح ـ ١/٣٦٢. م ـ ٢/٤٥٠. د، ن.

**تەرجەمە:**

ئەبوجوهەیمی ئەنصاریی ـ رضي الله تعالى عنه ـ ئەفەرموێ: پێغەمەر ـ ﷺ ـ لە طەرەفی بیئری جەمەلەوە تەشریفی هات، پیاوێکی پێگەیی، سەلامی لێکرد، پێغەمەر ـ ﷺ ـ جوابی سەلامەکەی نەدایەوە

(١) تەیەمموم کردن لە کاتی نیشتەجێیدا.

تا تەشریفی چوو بۆ لای دیوارێ دەموچاوی‌و هەردوو دەستی موبارەکی پێ مەسح کرد، ئەمجا سەلامەکەی سەندەوە [فەرمووی: بۆیە سەلامم نەسەندیەوە دەزنوێژم نەبوو (طبراني)].

تا مومکین بێ ناوی خوابردن بە دەزنوێژەوە سوننەتە.

دروستە شتێکی غەیر کە بە عادەت موسامەحەی لێ بکرێ‌و زەرەری نەبێ بۆ صاحیبەکەی لە عەمەل بێنرێ.

لە بەینی سەلام و رەددی سەلاما، لەبەر مەعذەرەت، فاصیلە ببێ زەرەری نابێ.

ئەو کەسە کە جێ‌بەجێ جوابی سەلامی نەدرێتەوە عوذربۆهێنانەوەی سوننەتە.

لە پێشا سوننەت وایە بوچووك سەلام لە گەورە بکا

تا مومکین بێ زوو جوابی سەلام دانەوە سوننەتە.

**٥/١٨٣١- عن ابن عمر [رضي الله تعالى عنهما] أن رجلا مرّ ورسول الله -ﷺ- يبول، فسلم، فلم يرد عليه. م - ٢/٤٥٢.**

**تەرجەمە:**

پیاوێ رابورد پێغەمەر -ﷺ- بەولی ئەکرد، ئەو پیاوە سەلامی لە پێغەمەر -ﷺ- کرد، پێغەمەر -ﷺ- سەلامەکەی نەسەندەوە.

کەسێ کە لەسەر قەزای حاجەت بێ سەلامی لێ بکرێ ئەوی سەلامی لێ ئەکا موستەحەقی جواب نیە.

سەلامکردن لە کەسێ کە قەزای حاجەت بکا مەکرووهە.

**٦/١٨٣٢- عبد الرحمن بن أبزى قال: جاء رجل إلى عمر بن الخطاب [رضي الله تعالى عنه] فقال: إني أجنبت فلم أصب الماء**

[فقال: لا تصل. م] فقال عمار بن ياسر [رضي الله تعالى عنه] لعمر بن الخطاب [رضي الله تعالى عنه]: أما تذكر أنا كنا في سفر [سرية. م] أنا وأنت، فأما أنت فلم تصل، وأما أنا [فتمعكت. أخرى. أي تمرغت في التراب] فصليت، فذكرت ذلك للنبي -ﷺ- فقال النبي -ﷺ-: إنما كان يكفيك هكذا؛ فضرب النبي -ﷺ- بكفيه الأرض ونفخ فيهما ثم مسح بهما وجهه وكفيه؟ ح ـ ١/٣٦٣. م ـ ٢/٤٥٠.

وفي أخرى: [قال عمار لعمر ـ رضي الله تعالى عنهما ـ] تمعكت [تمرغت] فأتيت النبي -ﷺ- فقال: يكفيك الوجه والكفّان. ح ـ ١/٣٦٤.

فأجنبنا فلم نجد ماء فأما أنت فلم تصل، وأما أنا فتمعكت في التراب وصليت، فقال النبي -ﷺ-: إنما يكفيك أن تضرب بيديك الأرض ثم تنفخ ثم تمسح بهما وجهك وكفيك. فقال عمر [رضي الله تعالى عنه]: إتق الله ياعمار! قال: إن شئت لم أحدِّث به. م ـ ٢/٤٤٩.

وفي أخرى: قال: فقال عمر: نولِّيك ما تولَّيت. م ـ ٢/٤٤٩. قال عمار [زائدا على ما سبق، الظاهر أنها من الحديث]: الصعيد الطيب وضوء المسلم يكفيه من الماء. ح ـ ١/٤٦٤. ورواه أصحاب السنن مع زيادة: وإن لم يجد الماء عشر سنين. صححه الترمذي، وابن حبان والدارقطني. قسطلاني. ١/٣٦٦.

تەرجەمە:

عەبدوڕەحمانی کوڕی ئەبزا ـ رضي الله تعالى عنه ـ ئەفەرموێ: پیاوێ هاتە خزمەت ئیمامی عومەر ـ رضي الله تعالى عنه ـ

عەرزیکرد: لەشم پیس بوەو ئاوم دەست نەکەوت [غوسڵی پێ بکەم، نوێژ بکەم یا نەیکەم؟ م] [فەرمووی: نوێژ مەکە. م] عەمماری کوڕی یاسیر ـ رضي الله تعالى عنهما ـ عەرزیکرد: لە فکرت نایێ من و تۆ لە سەفەرێکا بووین لەشمان پیس بوو ئاومان دەست نەکەوت، تۆ نوێژت نەکرد ئەمما من خۆم لە خۆڵەوە گلان و نوێژم کرد [عەممار ـ رضي الله تعالى عنه ـ لای وابوە چونکی تەیەممومم لە باتی دەزنوێژ و غوسڵە؛ چونکە بۆ دەزنوێژ دەست و دەم وچاو بە گڵ مەسح ئەکرێ ئەبێ بۆ غوسڵیش هەموو بەدەن لە گڵەوە بدرێ] ئەوەم عەرزی پێغەمەر ـﷺـ کرد پێغەمەر ـﷺـ فەرمووی: کافیی بوو بۆ تۆ وا بکەی، پێغەمەر ـﷺـ هەردوو دەستی موبارەکیماڵی بە ئەرزاو فووی لێکرد [کە تۆزی زۆری پێوە نەمێنێ] لە پاشا دەم و چاوی‌و دەستی موبارەکی پێ مەسح کرد؟ عومەر ـ رضي الله تعالى عنه ـ فەرمووی: ئەی عەممار تەقوا لە خوا بکە! [یەعنی ظەریف تێفکرە مەبادا بە نەوعێکی تر بوویێ‌و لە فکرت نەمابێ] عەممار ـ رضي الله تعالى عنه ـ عەرزیکرد: [لەفکرم نەچۆتەوە] ئەمما ئەگەر مەصلەحەت وا ئەبینی کە ئەمە ریوایەت نەکەم نایکەم [عومەر فەرمووی: تا تۆ ریوایەتەکەی دەرعوهدە بگری ئەیخەینە عوهدەی تۆوە. م أخرى] [یەعنی مەصلەحەتت زانی ریوایەتی بکە] لە ریوایەتێکی ترا عەممار ـ رضي الله تعالى عنه ـ لە حەدیثەکەی ئەوەی لێ زیاد کردوە کە صەعیدی طەیب یەعنی گڵی پاك لە حەدەثی ئەصغەرو ئەکبەر پاك کەرەوەیە بۆ کوللی موسوڵمانێ بری ئاو ئەکەوێ بۆی [ئەم زیادە ئەصحابی سونەن ریوایەتیان کردوە ئەوەیشیان لێ زیاد کردوە: با دە ساڵ ئاوی دەست نەکەوێ. ترمذیی‌و، ئیبن وحیببان و،

دارەقوطنیی فەرموویانە: ئەم زیادە صەحیحە.]

حەسەنی بەصریی ـ رحمە الله ـ ئەفەرمویّ: تا دەزنویّژەکەی نەشکیّ، یا تا جاریّکی تر لەشی پیس نەبیّ ئەو تەیەممومەی بەسە [یەعنی بۆ هەموو نویّژیّ تەیەممومم لازم نیە پیّنج وەقت بە تەیەممومیّ دروستە] (معلق) [عەبدورەزاق ئەم (معلق)ەی وەصلّ کردوە. یەعنی سیلسیلەی راویەکانی ذیکر کردوە] ئیبن وعەباس ـ رضي الله تعالی عنهما ـ بە تەیەممومم ئیمامەتی کردوە. یەحیای کوڕی سەعیدی قەططان رحمە الله ـ فەرموویەتی: لەسەر ئەرزی شۆرەکات نویّژکردن و تەیەممومم پیّکردنی دروستە. ح ـ ١/٣٦٦. [چونکی حەزرەتی عایشە ـ رضي الله تعالی عنها ـ ئەفەرمویّ: پیّغەمەر ـﷺـ فەرمووی: ئەو جیّیەم پیّنیشان درا کە هیجرەتی بۆ ئەکەن کە جیّییّکی شۆرەکاتی دارخورمادارە (صوغرای شەکلّی ثالیث) پیّغەمەر (کبری) ـﷺـ مەدینەی بە طیبە ناوبردوە-قەسطەلانیی. [یەعنی مەدینە شۆرەکاتە، مەدینە طیبەیە، کە وابیّ بەعزیّ شۆرەکات طیبەیە، یەعنی پاکە، بە ئەرزی پاك تەیەممومم دروستە. کە وابیّ بە بەعزیّ شۆرەکات تەیەممومم دروستە بە قیاس لەو بەعزە، بەعزەکەی تریش تەیەممومی دوەمی پیّ دروستە؛ چونکی (فارق) نیە].

(معلق) جونوب لە نەخۆشیی، یا لە مردن، یا لە تینویّتی بترسیّ تەیەممومم ئەکا. ذیکر =کراوە [وصله الدارقطني] کە عەمری کوڕی عاص لە شەویّکی ساردا جونوب بوو تەیەممومی کرد، ئەم ئایەتەی خویّندەوە ﴿ولا تقتلوا أنفسكم، إن الله كان بكم رحيما﴾[1] [خۆتان

(١) النساء/٢٩.

مەخـــەنـــە تەهلوکـــەوە، بەوە] خۆتـــان مەکـوژن؛ چونکی خوا زۆر بە مەرحەمەتە لەگەڵ ئێوەدا. ئەم موعامەلەی عەمرەیان عەرزی پێغەمەر کرد -ﷺ- پێغەمەر -ﷺ- پێی فەرموو: ئەی عەمر بە لەش پیسی نوێژت بۆ رەفیقـــەکـــانت کرد؟ یەعنی بۆ ئیمامەتیت بۆ کردن بە لەشی پیســەوە؟ عەرزم کرد، کە چی مەنعی کردم لە غوسڵ کردن. عەرزم کرد: کە لە خوا - عزوجل - م بیست: خۆتان مەکوژن. (أبو داود) پێغەمەر -ﷺ- سەرزەنشی نەکرد. ح - ١/ ٣٧٠ قسطلاني.

**١٨٣٣/٧- عن الأعـمش قال: سمعت شقيق بن سلَمــة [أبــا وائــل. أخرى] قال: كنت عند عبد الله بن مسعود وأبي موسى [الاشعري] - رضي الله تعـالى عنهمـا - فقـال له ابو موسى: أرأيت ياأبا عبد الرحمٰن إذا أجنبَ فلم يجد ماء كيف يصنع؟ [لو أن رجلا أجنب فلم يجد الماء شهرا أما كان يتيمم ويصلي؟ ح اخرى] فقال عبد الله: لايصلي حتى يجد الماء. فقال ابــو موسـى: فكيف تصنـــع بقـــول عمـــار حين قال له النبي -ﷺ-: كان يكفيك؟ قال: ألم تر عمر لم يقنع بذلك؟ فقال أبو موسى: فدعنا من قول عمار، فكيف تصنع بهذه الآية [في سورة المائدة ﴿فلم تجدوا ماء فتيمموا صعيـدا طيبـا﴾؟[1] ح اخـرى] فمـا درى عبـد الله مايقـول، فقـال: انا لو رخصنـا لهم في هذا لأوشـك اذا برد على أحدهم الماء أن يدعه ويتيمم. [قـال الأعمش] فقلت لشقيق: فإنمـا كره عبـد الله لهـذا؟ قال: نعم. ح - ١/ ٣٧١. م - ٢/ ٤٤٨.**

**١٨٣٤/٨- وفي اخـرى فقـال ابـو موسى: الم تسمـع قول عمـار لعمـر**

(١) النساء/ ٤٦.

[رضي الله تعالى عنهما]: بعثني رسول الله -ﷺ- في حاجة فأجنبت، فلم اجد الماء فتمرغت في الصعيد كما تمرَّغُ الدابة فذكرت ذلك للنبي -ﷺ- فقال: انما يكفيك ان تصنع هكذا، فضرب بكفه ضربة على الارض ثم نفضها، ثم مسح بها ظهر كفه بشماله او ظهر شماله بكفه [اليمنى] ثم مسح بهما وجهه؟ فقال عبد الله: الم تر عمر لم يقنع بقول عمار؟ ح ٣٧٢/١-

تەرجەمەی ئەم دوو سێ حەدیثە بەیەکەوە:

ئەعمەش ـ رحمه الله ـ ئەفەرموێ: لە شەقیقم بیست فەرمووی: لە خزمەت عەبدوڵڵای کوڕی مەسعوودو ئەبوموسای ئەشعەریی ـ رضي الله تعالى عنهما ـ دا دانیشتبووم، ئەبوموسا ـ رضي الله تعالى عنه ـ بە ئیبن ومەسعوودی وت ـ رضي الله تعالى عنه ـ: ئەی ئەبوعەبدوڕەحمان خەبەرم بدەرێ پیاوێ جونوب بووە مانگێ ئاوی دەست نەکەوت چی ئەکا؟: تەیەمموم ناکاو نوێژ ناکا؟ عەبدوڵڵا ـ رضي الله تعالى عنه ـ فەرمووی: نوێژ ناکا تا ئاوی دەست ئەکەوێ. ئەبوموسا ـ رضي الله تعالى عنه ـ فەرمووی: ئەی چی ئەکەی لە قەولی عەممار =کە= بە عومەری وت ـ رضي الله تعالى عنهما ـ: پێغەمەر -ﷺ- ناردمی بۆ ئیشێ جونوب بووم، ئاوم دەست نەکەوت، وەك حەیوان چۆن ئەگەوزێ وا خۆم لە خۆڵەوە تلان، عەرزی پێغەمەرم کرد -ﷺ-، فەرمووی: ئەوەت بۆ کافیی بوو کە وا بکەی: دەستی موبارەکی دا بە ئەرزا، لە پاشا دەستی راوەشان کە تۆزەکەی کەم کاتەوە، لە پاشا بە دەستی چەپی پشتی دەستی راستی مەسح کرد، یا فەرمووی: بە دەستی راستی پشتی دەستی چەپی مەسح کرد،

لە پاشا دەموچاوی مەسح کرد، عەبدوڵڵا ـ رضي الله تعالى عنه ـ فەرمووی: نابینی کە عومەر ـ رضي الله تعالى عنه ـ بە قسەی عەممار قەناعەتی نەکرد؟ ئەبومووسا ـ رضي الله تعالى عنه ـ فەرمووی: وازم لێ بێنە بۆ قسەی عەممار [یەعنی بەوە ئیستیدلال ناکەم] ئەی چی ئەکەی لە ئایەتی سوورەی مائیدە کە ئەفەرموێ: کە ئاوتان دەست نەکەوت بە گڵێکی پاك تەیەممومم بکەن؟ شەقیق ئەفەرموێ: عەبدوڵڵا ـ رضي الله تعالى عنه ـ نەیزانی کە چی بڵێ بۆ تەئویلی ئایەتەکە ئەمجا فەرمووی: ئەگەر ئێمە روخصەتی خەڵق بدەین کە ئاویان دەست نەکەوت و تەیەممووم بکەن ئێنن کە یەکێکیان سەرمای بوو کە بە ئاو دەزنوێژ بشوا پێ تەیەممووم ئەکا! ئەعمەش ئەڵێ: لە شەقیقم پرسیی: کە وابێ ئیبن ومەسعوود ـ رضي الله تعالى عنه ـ بۆیە حەزی نەکردوە کە خەڵق تەیەممووم بکا؟ شەقیق وتی: بەڵێ.

لە تەیەممووما حەدیثی عیمرانی کوڕی حصەینیش هەیە کە =لە= موعجیزاتا نووسراوە. ح ـ ١/٣٦٦. قەسطەلانیی ئەفەرموێ: مەذهەبی عومەرو ئیبن ومەسعوود ـ رضي الله تعالى عنهما ـ ئیشکالی تیایە، نوێژ لە وەختی خۆیا فەرزە، بێ عوذر تەرکی جائیز نیە، تەیەممووم روخصەتە لە قورئاناو لە حەدیثا هەیە. ئەم روخصەتەیان چۆن بەتاڵ کردۆتەوە؟ چۆن ئەمریان کردوە بە تەرکی نوێژ؟

جوابی ئایەتی ﴿أو لامستم النساء﴾یان[1] وا مەعنا لێ‌داوەتەوە: مولامەسە بە مەعنا موجامەعە نیە، بە مەعنا پێستی پیاوو ژن لەیەك کەوتنە، کە وابێ تەیەممووم بۆ بێ‌دەزنوێژە بۆ لەش پیس نیە. بۆ لەشپیس خوا ئەفەرموێ: کە جونوب بوون غوسڵ بکەن.

(١) النساء/٤٣. المائدة/٦.

## سەتری عەورەت

١/١٨٣٥- عن ابي قلابة عن عمرو بن سلمة [رضي الله تعالى عنه]: كنا بماء ممر الناس، وكان يمر بنا الركبان فنسألهم: ما للناس؟ ما هذا الرجل؟ [أي النبي -ﷺ-] فيقولون: يزعم أن الله أرسله أوحى إليه أو أوحى الله بكذا، فكنت أحفظ ذلك الكلام، وكأنما يُغْرَىٰ [أي يلصق] في صدري وكانت العرب تَلَوَّم [تنتظر] بإسلامهم الفتح، فيقولون: اتركوه وقومه، فإنه إن ظهر عليهم فهو نبي صادق، فلما كانت وقعة أهل الفتح بادر [أسرع] كل قوم بإسلامهم وبدر [أسرع] أبي قومي بإسلامهم، فلما قدم قال: جئتكم والله من عند النبي -ﷺ- حقا، فقال: صلوا صلاة كذا في حين كذا، وصلوا كذا في حين كذا. فإذا حضرت الصلاة فليؤذن احدكم وليؤم أكثركم قرآنا، فنظروا، فلم يكن أحد أكثر قرآنا مني لِما كنت أتلقى من الركبان، فقدموني بين ايديهم وأنا ابن ست أو سبع سنين، وكانت عليَّ بردة كنت إذا سجدت تقلصت عني [إنجمعت وتكشفت] فقالت إمرأة من الحي: ألا تغطّوا عنا أست قارئكم؟ فاشتروا [لي قميصا عُمانيا. د] فقطعوا لي قميصا، فما فرحت بشيء فرحي بذلك القميص. ح - ٣٨٣/٦

تەرجەمە:

عەمری کوڕی سەلەمە - رضي الله تعالى عنهما - ئەفەرموێ: لەسەر ئاوێ بووین لە گوزەرگای خەڵقا، سوارە بەلامانا رائەبورد، لێمان ئەپرسین: خەڵق چی لێ قەوماوە؟ خەڵق چی لێ قەوماوە؟ ئەم پیاوە - یەعنی پێغەمەر -ﷺ- چیە؟ [یەعنی سوئالیان لە ئەحواڵی عەمر بۆ پێغەمەر -ﷺ- ئەکرد] ئەیانوت: ئەو پیاوە ئەفەرموێ: لە طەرەف خواوە

نێرراوم، خوا ئەوەی بە وەحی بۆ نازڵ کردوە. منیش =ئەو= وەحیەم حیفظ ئەکرد وەکوو لە سنگما بی‌چەسپێنی وام حیفظ ئەکرد. عەرەبیش بۆ ئیسلامبوونیان مونتەظیری ئەوە بوون کە پێغەمەر -ﷺ- فەتحی عەرەب بکا، ئەیانوت: لەگەڵ قەومەکەی وازیان لێ بێنن [حەرب بکەن] ئەگەر بەسەر قەومەکەیا غەڵبەی کرد ئەوە پێغەمەرێ صادقە. کە وەقعەی ئەهلی فەتح بوو هەر قەومێ عەجەلەیان ئەکرد بۆ موسوڵمان بوون، باوکیشم بۆ ئیسلامبوونی قەومەکەی عەجەلەی کردو چوە خزمەتی، کە هاتەوە فەرمووی: لە خزمەت پێغەمەرەوە -ﷺ- هاتووم پێغەمەرێکی حەقە، فەرمووی: ئەو نوێژە لەووەختەدا بکەن، فلانە نوێژ لە فلانــە وەختا بکەن، کە وەختی نوێژ هات یەکێکتان بانگ بدا، کامتان قورئانی زۆرترە ئەوە ئیمامەتیتان بۆ بکا؛ تێفکرین لە ناو عەشیرەتەکەدا کەسی تیا نەبوو کە قورئانی لە من زۆرتر بێ؛ چونکی - لەوەپێش لەو سوارانەی کە بەلامانا رائەبوردن قورئانم لەبەرکردبوو، منیان پێش خست کە نوێژیان پێ‌بکەم، منیش شەش یا حەوت ساڵ بووم، چارۆکەیێکم پێوە بوو کە سوجدەم ئەبرد هەڵەکشاو دەرەکەوتم، ژنێ لە خێڵەکەمان وتی: بۆ گەڵ و قنگی ئیمامەکەتان داناپۆشن؟ خامێکی عومانی‌یان بۆ کریم لەوە کراسێکیان بۆ بریم، ئەوەندەی بەوە دڵخۆش =بووم= بە هیچ شتێ دڵخۆش نەبووم.

ئیمامەتی منالی (ممیز)[1] دروستە.

هەرکەسێ بانگ ئەدا بیدا.

---

(١) پاك و پیس لە یەك جیابکاتەوە.

تەحصیلی عیلم سوننەتەو فەضیلەتە.

کێ قورئانی زۆرتر لەبەربێ‌و چاکی بزانێ چاك وایە ئەوە ببێ =بە= ئیمام.

جەماعەت شیعاری ئیسلامە.

سەتری عەورەت لازمە.

گەڕان و سەفەر بۆ حەق دۆزینەوە فەرزە.

کە حەقی لێ مەعلووم بوو ئیتیباعی لازمە.

تەعلیمی ڕێی حەق و تەعلیمی دین فەرزە.

نوێژ فەرزە.

فەرەح بە حودووثی نیعمەت دروستە.

پۆشینی رووت فەرزی کیفایەیە.

**٢/١٨٣٦ـ جابر بن عبد الله ـ رضي الله تعالى عنهماـ يحدث ان رسول الله ـﷺـ كان ينقل معهم الحجارة للكعبة وعليه إزاره، فقال له العباس عمه ـ رضي الله تعالى عنه ـ: ياابن أخي لو حللت إزارك فجعلت على منكبيك دون الحجارة، قال: فحلّه فجعله على منكبيه فسقط مغشيا عليه، فما رؤي بعد ذلك عريانا. ح ـ ١/٣٨٤. م ـ ٢/٤٢٤.**

**٣/١٨٣٧ـ وعنه يقول: لما بنيت الكعبة ذهب النبي ـﷺـ وعباس [رضي الله تعالى عنه] ينقلان الحجارة، فقال العباس [رضي الله تعالى عنه] للنبي ـﷺـ: إجعل إزارك على عاتقك من الحجارة، ففعل فخرّ إلى الأرض، وطمحت عيناه إلى السماء، ثم قام فقال: إزارى! إزارى! فشُدَّ عليه إزارُه. م ـ ٢/٤٢٤.**

تەرجەمە:

ئەم حادیثــەیــە لە پێش نوبـوەتـا بوە، جابیـر لە وەختی هیجـرەتـا موسوڵمان بوە، حازری واقیعەکە نەبوە، کە وابێ حەدیثەکە مورسەلی صەحــابـی‌یــە، ئەبـێ جابـیــر لە پێـغــەمــەر -ﷺ-ی بیستبێ، یا لە صەحابییێکی تری بیستبێ. مورسەلی صەحابیی حوکمی مەرفووعی هەیە.

پێغەمەر -ﷺ- و حەزرەتی عەباسی مامی - رضي الله تعالی عنه - کە قورەیش بەیتیان تەعمیر کردەوە.. بەردیان ئەکێشا، عەباس - رضي الله تعالی عنه - عەرزی‌کرد: ئەی برازای خۆم پێشگیرەکەت بکردایەوەو بتخستایە سەرشانت ژێر بەردەکەوە [یەعنی بۆ تۆ رەحەتتر ئەبوو] پێغەمەر -ﷺ- وای‌کــردو کەوت و چاوی هەڵگــەرایـەوە بۆ ئاسمـان و تەشـریفی هەڵسایەوە فەرمووی: پێشگیرەکەم! پێشگیرەکەم! پێشگیرەکەیان دایەوەو - گرتیەوە، لە دوای =ئەوە= قەت بە رووتیی نەبینراوە.

پێغەمەر -ﷺ- لە مناڵێتییەوەو لە پێش پێغەمەرێتیا لە طەرەف خواوە تەعلیم و تەربیەی ئەخلاقی گوزیدە کراوە.

[ئیبن وئیسحــاق ریــوایــەت ئەکــا کە پێغـەمـەر -ﷺ- کە لە لای حەلیمــەی سەعـدی‌یـە ئەبێ - رضي الله تعـالی عنهـا - رووت بۆوە، یەکێ لە غەیبەوە زللەیێکی لێدا لە دوای ئەوە ئیتر رووت نەبوە. یەعنی رووتبوونەوەی لە وەختی بینای بەیتا - بە عادەت - لە زەروورەت حسێب بوە، مونافاتِ لە بەینیانا نیە. وەك چۆن لەگەڵ حەرەمیا لە وەختی نوستنا بەعزێ وەقت لە بەر زەروورەتی شەرعیە رووت بۆتەوە. یەعنی بە بێ زەروورەت قەت رووت نەبۆتەوە. قسطلانی - ١ / ٣٨٥.

**٤/١٨٣٨ـ عن أبي سعيد الخدري [رضي الله تعالى عنه] أن رسول الله ـﷺـ قال: لا ينظر الرجل إلى عورة (عُرية. أخرى] الرجل، ولا المرأة الى عورة [عُرية. أخرى] المرأة،ولا يفضي الرجل إلى الرجل في ثوب واحد، ولا تفضي المرأة إلى المرأة في الثوب الواحد. م ـ ٤٢٠/٢.**

**تەرجەمە:**

پێغەمەر ـﷺـ فەرمووی: پیاو تەماشای عەورەتی پیاو نەکا، ژن تەماشای عەورەتی ژن نەکا، پیاو لەگەڵ پیاو لە یەك لیباسا نەنوێ، ژن لەگەڵ ژن لە لیباسێکا نەنوون. یەعنی بە رووتیی لەگەڵ یەکتر نەنوون.

[بە (طريق الأولى) تەماشاکردنی پیاو هی ژن، یا تەماشاکردنی ژن هی پیاو ـ بۆ غەیری ژن و مێرد حەرامە، ژن و مێرد تەماشای هەموو ئەعزای یەکتریی ئەکەن. تەماشاکردنی عەورەت و فەرجی یەکتریی بە بێ حاجەت مەکرووهە. تەماشای داخڵی فەرج مەکرووهترە، فەقەت حەرام نیە. لە بەینی مەحاریما تەماشاکردنی غەیری مابەینی ناوك و ئەژنوێ دروستە. (قيل) غەیری ئەوەی کە =لە= وەختی ئیشکردنا دەرکەوتنی مەجبوورییە. حەرامە.

عەورەتی پیاو بۆ پیاو مابەینی ناوك و ئەژنوێیە، هی ژنیش بۆ ژن وایە. ئەژنۆو ناوك لە قەولی ئەصەحا داخڵی عەورەت نین. لای قەولێ هەردوکیان عەورەتن، لای قەولێ ناوك عەورەتە ئەژنۆ عەورەت نیە. لە بەینی نامەحرەما تەماشاکردنی هەموو ئەجزای بەدەنیان بۆ یەکتریی حەرامە، بە شەهوەت بێ یا بێ شەهوەت بێ. تەماشاکردنی ئەمرەدی

جوان بە شەهوەت یا بە بێ شەهوەت حەرامە، لە فیتنە ترس ببێ یا نەبێ مەذهەبی موختاری شافیعیی و فوحوولی عولەما وایە.

لە حینی حاجەتا وەك: موعامەلە، شەهادەت، تەعلیم و تەعەللوم، تەداویـــی... بە بێ شەهـــوەت دروســـتـــە. نەظـــەر حەرام بێ دەست لێـدانیش بە طەریقی ئەولا حەرامـەو بەشیـددەتتـرە. لە حەمـاما گەلێ خەڵق بەوە موبتەلان. بە ئەحسەنی طەریق نەهی =لێ= کردنی فەرزە. کەشفی عەورەت بە بێ حاجەت لە خەڵوەتا کە ئینسان نەیبینێ (عند الأصح) حەرامە (عند البعض) مەکرووهە. تەفصیلاتی لە کتێبی شەرعایە. نووي] ٢/٤٢١.

**٥/١٨٣٩- عن المسور بن مخرمة [رضي الله تعالى عنهما] قال: أقبلت بحجر أحمله ثقيل، وعليَّ إزار خفيف، قال: فانحل إزاري ومعي الحجر لم أستطـع أن أمنعـه حتى بلغت به إلى موضعـه، فقـال رسول الله -ﷺ-: إرجع إلى ثوبك فخذه، ولا تمشوا عُراة. مـ ٢/٤٢٤.**

**تەرجەمە:**

میسوەری کوڕی مەخرومە - رضي الله تعالى عنهما - ئەفەرموێ: [لـــە وەختی بینـای مەسجیـدی نەبـەوییـا - عليـه الصـلاة والسـلام -] بەردێکی گرانم هەڵگرتبو، پێشگیرێکی خەفیفم بوو کرایەوە، بەردەکەم پێ‌بوو بۆم نەکرا نەیێڵم بکرێتەوە تا گەییمە ئەو جێیەی کە بەردەکەی لێ دائـەنـرێ. پێغـەمـەر -ﷺ- فەرمووی: بگەڕێرەوە بۆو لیباسەکەت هەڵی بگرە بە رووتیی مەگەڕێن.

بە رووتیی گەڕان حەرامە. نەهیەکەی بۆ تەحریمە.

**٦/١٨٤٠- عن عبـــد الله بن جعفـــر [رضي الله تعـالى عنهمـا] أردفني**

**رسول الله ـ ﷺ ـ ذات ليلة خلفه، فأسرَّ إلي حديثا لا أحدث به أحدا من الناس، وكان أحب ما استتر به رسول الله ـ ﷺ ـ لحاجته هدف [جێی بەرز کە لە پەنایا بۆ حاجەت دابنیشێ] أو حائش نخل، قال ابن أسماء في حديثه يعني حائط نخل. م ـ ٤٢٥/٢.**

**تەرجەمە:**

عەبدوڵڵای کوڕی جەعفەری برای ئیمامی عەلی ـ رضي الله تعالى عنهم ـ ئەفەرموێ: پێغەمەر ـ ﷺ ـ شەوێ سواری پاشکۆی خۆیی کردم قسەیێکی سیرڕیی پێ فەرمووم لای هیچ کەسێ نایڵێم. پێغەمەر ـ ﷺ ـ لە وەختی قەزای حاجەتا ئەوی زۆر حەزی ئەکرد کە لە پەنایا قەضای حاجەت بکاو خۆی لە خەڵق سەتر بکا ئەرزێکی بەرز بوو، یا دیواری باغی خورما بوو. ئەم دوانە میثالن هەرچی شتێك شەخسی ئینسان لە خەڵق ون بکا وایە.

کەتمی سیر واجبە، بێ رەزای صاحیبی ئیفشای دروست نیە.

لە وەختی قەضای حاجەتا خۆداپۆشین بە تەواویی سوننەتی موئەککەدەیە. داپۆشینی عەورەتی فەرزە. (کما مرّ).

**١٨٤١/٧ـ عن سهل [رضي الله تعالى عنه] قال: كان رجال يصلون مع النبي ـ ﷺ ـ عاقدي أُزْرهم على أعناقهم كهيئة الصبيان [وفي م ـ ٨٥/٣: من ضيق الأُزْر خلف النبي ـ ﷺ ـ فقال قائل: يا معشر النساء لا ترفعن رؤسكن حتى يرفع الرجال:** لە بەر تەنگی کراسەکەیان ـ کراسەکەیان لە ملیان ئەبەست، یەکێ وتی: ئەی جەماعەتی ژنان سەر هەڵمەبڕن تا پیاوان سەر هەڵئەبڕن].

**وقال [أي النبي ـ ﷺ ـ] للنساء: لا ترفعن رؤسكن حتى يستوي**

الرجال جلوسا [وفي حديث أسماء بنت أبي بكر - رضي الله تعالى عنهما - المروي عند أحمد وأبي داود بلفظ: فلا ترفع رأسها حتى يرفع الرجال رؤسهم كراهة أن يرين عورات الرجال. قسطلاني] ح - ١/٣٨٣. م - ٨٥/٣.

**تەرجەمە:**

سەهلی کوڕی سەعدی ساعیدیی - رضي الله تعالى عنه - ئەفەرموێ: بەعزێ پیاو لە خذمەت پێغەمەرا -ﷺ- نوێژ یان ئەکرد، وەك منالْ کراسەکانیان لە ملیان بەستبوو، پێغەمەر -ﷺ- یا یەکێکی تر بە ئەمری ئەو فەرمووی: تا پیاوان سەر لە سوجدە هەڵنەبڕن ژنان سەر لە سوجدە هەڵنەبڕن مەبادا عەورەتی پیاوەکان ببینن.

## علاج واقعه قبل از وقوع بايد كرد[1]

کە ترسی مەحذوورێ ببێ سوننەتە لە پێشەوە نەهی بکرێ لەوەی کە ئەبێ بە سەبەبی ئەو مەحذوورە.

**٨/١٨٤٢- عن أبي هريرة [رضي الله تعالى عنه] قال: رأيت سبعين من أصحاب الصفة ما منهم رجل عليه رداء، إما إزار وإما كساء، قد ربطوا في أعناقهم، فمنها مايبلغ نصف الساقين، ومنها مايبلغ الكعبين فيجمعه بيده كراهية أن ترى عورته. ح - ١/٤٢٨.**

**تەرجەمە:**

ئەبوهورەیرە - رضي الله تعالى عنه - ئەفەرموێ: لە ئەصحابی

(١) کارەسات پێش ڕوودانی دەبێ چارەسەر بکرێت.

(صفة)[1] حەفتا کەسم دی هیچ پیاوێکیان کەواییکی ئاودامانیان لەبەرا نەبــوو، یا پێشگیــرێکی بوو یا کراسێکی بوو، لە ملیـا گرێی‌دابـوو، بەعزێکیان تا نیوەی قاچی بوو، بەعزێکیان تا قولەپێی بوو، بە دەست کۆی ئەکردەوە مەبادا [لە نوێژا] عەورەتی ببینرێ.

**١٨٤٣/٩ـ عن أبي سعيد الخدري ـ رضي الله تعالى عنه ـ أنه قال: نهى رسول الله ـﷺـ عن اشتمال الصماء، وأن يحتبي الرجل في ثوب واحد ليس على فرجه منه شيء. ح ـ ١/٣٨٧. م ـ ٨/٤١١. د، ن، جه. لكن عن جابر مع أشياء أخرى.**

**تەرجەمە:**

ئەبوسـەعیـدی خدریی ـ رضي الله تعـالى عنـه ـ ئەفـەرمـوێ: پێغەمەر ـﷺـ نەهی کردوە لەوە کە ئینسان خۆی وا لە لیباسەوە بپێچێ رێی نەبێ دەستی لێ دەرێنێ، نەهیشی لەوە کردوە کە پیاو لە دانیشتنا ئەژنــۆی هەڵنێ لە تەنهــا لیبـاسێکـا کە لەو لیبـاسـەدا شتێکی لەســەر عەورەتی نەبێ.

**١٠/١٨٤٤ـ أبـو هريـرة [رضي الله تعـالى عنـه] قال: بعثني أبـو بكـر [رضي الله تعالى عنه] في تلك الحجة [التي حجها أبو بكر ـ رضي الله تعالى عنه ـ بالناس] في مؤذنين يوم النحر نؤذن بمنى: أن لا يحج بعد العام مشرك، ولا يطوف بالبيت عريان [مرسل معلق] قال حميد بن عبد الرحمن [بن عوف]: ثم أردف رسول الله ـﷺـ عليا [رضي الله تعالى عنه] فأمره أن يؤذن ببراءة. قال أبو هريرة [رضي الله تعالى عنه ـ معلق**

(١) صفة: سەکۆ، مەبەست لە ئەصحابی صوففە ئەو موسوڵمانانەیە کە ماڵ و شوێنی تایبەتی خۆیان نەبوو.

ايضا] فأذن معنا علي [رضي الله تعالى عنه] في أهل منى يوم النحر: أن لا يحج بعد العام مشرك، ولا يطوف بالبيت عريان. ح - ١/ ٣٨٧. م - ٦/ ٤٧. د، ن، ليس فيه المعلقان. ح - ٧/ ١٣٧، ١٣٦. أخرجه المؤلف أيضا في الجزية، والمغازي، والحج، والتفسير.

تەرجەمە:

ئەبوهورەیرە - رضي الله تعالى عنه - ئەفەرموێ: لەو ساڵەدا کە حەزرەتی ئەبوبەکر - رضي الله تعالى عنه - حەجی بە خەڵق کرد لەگەڵ چەند موئەذینێکا لە ڕۆژی نەحرا ناردمی کە لە مینادا بانگ بدەین بە ناو خەڵقا کە: لەم ساڵ بەدواوە هیچ موشریکێ حەج نەکا، هیچ کەس بە ڕووتیی طەوافی بەیت نەکا.

حەمیدی کوڕی عەبدوڕەحمانی کوڕی عەوف - رضي الله تعالى عنه - ئەفەرموێ: لە پاشا پێغەمەر -ﷺ- حەزرەتی عەلی لە دوای حەزرەتی ئەبوبەکر - رضي الله تعالى عنهما - نارد کە: ئیعلان بکا بە بەرائەت. ئەبوهورەیرە - رضي الله تعالى عنه - ئەفەرموێ: لەگەڵ ئێمە حەزرەتی عەلیش - رضي الله تعالى عنه - لە ناو ئەهلی مینادا لە ڕۆژی نەحرا بانگی دا کە: لەم ساڵ بەدواوە هیچ موشریکێك حەج ناکا، هیچ کەس بە ڕووتیی طەوافی بەیت ناکا.

**١١/ ١٨٤٥- عن ابن عباس [رضي الله تعالى عنهما] قال: كانت المرأة تطوف بالبيت وهي عريانة فتقول: من يعيرني تطوافا؟ تجعله على فرجها. وتقول:**

**اليوم يبدو بعضه أو كلُّه   فما بدا منه فلا أحلُّه**

**فنزلت هذه الآية: ﴿خذوا زينتكم عند كل مسجد﴾[1] م - ١٠/٤٧٧.**

**تەرجەمە:**

ئیبن وعەباس ـ رضي الله تعالى عنه ـ ئەفەرموێ: [لە ئەییامی جاهیلیەتا، تا زەمانی ئەم ئایەتەی دائیر بە مەنعی رووت لە طەوافی بەیت] ژنان بە رووتیی طەوافیان ئەکرد، ئەیانوت: کێ لیباسێکی طەوافم ئەداتێ طەوافێکی پێوە بکەم؟ بیخاتە سەر فەرجی، ئەیشیوت: ئیمڕۆ بەعزێ یا هەمووی دەرکەوتوە ئابڕووی، ئەوی لێی دەرکەوتوە حەلاڵم نەکردوە.

[لە زەمانی جاهیلیەتا ژنان بە رووتیی طەوافیان ئەکرد، جلەکانیان فڕێ ئەدا هەڵیان نەئەگرتەوە، خەڵق بە پێ ئەیان شێلا تا ئەڕزی، کە نووری ئیسلام هات خوا ئەمری کرد بە سەتری عەورەت. نووي].

**١٨٤٦/١٢ـ عن محمد بن المنكدر قال: دخلت على جابر بن عبد الله [رضي الله تعالى عنهما] وهو يصلي في ثوب ملتحفا به ورداؤه موضوع [على المِشجَبِ: ما يوضع عليه الثوب] فلما انصرف قلنا: يا أبا عبد الله تصلي ورداؤك موضوع؟ قال: نعم أحببت أن يراني الجهال مثلكم. رأيت النبي ـﷺـ يصلي كذا. ح ـ ١/٣٨٨.**

**تەرجەمە:**

محەمەدی کوڕی مونکەدیر ئەفەرموێ: چوومە لای جابیری کوڕی عەبدوڵڵا ـ رضي الله تعالى عنهما ـ لە تەنها لیباسێکا نوێژی ئەکرد، جلەکەی لە خۆیەوە پێچابوو، ریداکەی لەسەر ئەرز یا لە سەر ئەوە کە

(١) الأعراف/٣١.

جلی بەســەرا ئەدرێ. . دانـرابـوو کە لێ‌بـۆوە عەرزمـان کرد وتمـان: نوێژەکەیت و ریداکەت دانراوە؟ فەرمووی: بەڵێ حەزم کرد کە جاهێلی وەکوو ئێوە بمبینن [یەعنی تا تێ‌بگەن کە تەنها سەتری عەورەت کافیە] پێغەمەرم -ﷺ- دی وای نوێژ ئەکرد.

**١٨٤٧/١٣- یروی عن [ابن عباس - رضي الله تعالى عنهما - وصله أحمد والترمذي بسند فيه أبو يحيى القتات، وهو ضعيف. وعن جَرْهَد - رضي الله تعالى عنه - وصله في الموطأ وحسنه الترمذي، وصححه ابن حبان. عن محمــد بن جحش - رضي الله تعــالى عنــه - ابن عبــد الله بن جحش، ابن أخي أم المؤمنين زينب - رضي الله تعالى عنهم - وصله البخاري في تأريخه، وأحمد والحاكم] عن النبي -ﷺ-: الفخذ عورة. وقــال أنس - رضي الله تعــالى عنــه -: حسر النبي -ﷺ- عن فخـذه. وحديث أنس أسند [أقوى وأحسن مما قبله] وحديث جَرْهد أحوط حتى يخرج من اختلافهم ح - ٣٨٨/١.**

**تەرجەمە:**

ئیبن وعـەبـاس و، جەرهـەدو، محەمەدی کوڕی عەبدوڵڵای کوڕی جەحش ئەفەرمون: پێغەمەر -ﷺ- فەرمووی: ران عەورەتە. ئەنەس - رضي الله تعالى عنه - ئەفەرموێ: پێغەمەر -ﷺ- رانی خۆی دەرخست [كما مر في غزوة خيبر] یەعنی ران عەورەت نیە. حەدیثی ئەنەس بە قووەتترە، حەدیثی جەرهەدو رەفیقەکانی ئیحتیاطی زیاتر تیایە. بۆیەکم وا وت تا لە ئیختیلافی عولەما نەجات ببێ.

لای جومهووری تابیعین و ئەبوحەنیفەو ئەصەحی ئەقوالی شافیعیی و

مالیك و ئەحمەدو، لای ئەبویوسف و محەمەد (فخذ)[1] عەورەتە، لای ئیبن وئـەبی ذیئب و داوودو، ریـوایـەتێکی ئەحمـەدو، ئیصطـەخـری لە شافیعیی‌و، ئیبن وحەزم عەورەت نیە. (محلی) ئەفەرموێ: ئەگەر ران عەورەت بوایە خوا کەشفی رانی پێغەمەری -ﷺ- نەئەکرد کە موطەهەرەوو مەعصوومە لە گوناه، نە ئەنەس نە غەیری ئەنەس نەیەدی، یەعنی کە وابێ راجیح ئەوەیە کە عەورەت نەبێ. ئەبوموسای ئەشعەریی ـ رضي الله تعـالی عنـه ـ کە دەرگـاوانیی پێغـەمـەر ئەکـا -ﷺ- (کمـا مر في المعجزات) ئەفـەرمـوێ: کە ئیمـامی عوثمـان ـ رضي الله تعـالی عنه ـ تەشریفی هاتە باغەکەی، پێغەمەری تیا بوو -ﷺ- پێغەمەر -ﷺ- لای ئەبوبەکرو عومەر رانی رووت بوو، کە چاوی کەوت بە ئیمامی عوثمان ـ رضي الله تعالی عنه ـ رانی داپۆشی.

یەعنی ئەگەر عەورەت بوایە لای ئیمامەینی هودا[2] ـ رضي الله تعالی عنهما ـ رانی خۆی دەرنەئەخست و دای نەئەهێشتە ناو بیرەکەوە بۆ ئیـمـامی عوثمـان ـ رضي الله تعـالی عنـه ـ لە جوابی حەزرەتی عایشەدا ـ رضي الله تعالی عنها ـ ئەوەندەی فەرموو: حەیا نەکەم لە یەکێ کە مەلائیکە حەیای لێ ئەکا؟ موقابەلەی کرد بەو صیفەتە جەمیلە کە لەوا بوە.

سەلەمەی کوڕی ئەکـوەع ـ رضي الله تعـالی عنـه ـ ئەفـەرمـوێ: عەرزم کرد: (یـارسـول الله) من پیـاوێکم راو ئەکـەم دروستـە لە تەنهـا

(١) (فخذ): ران.

(٢) مەبەستی ئەبوبەکرو عومەرە ـ خ ـ.

لیباسێکا نوێژ بکەم؟[1] بەرۆکت دابخە =با= بە بەردێکیش بێ (في إسناده نظر). ح ـ ١/٣٧١؟

**١٤/١٨٤٨ـ عن عمر بن أبي سلمة [رضي الله تعالى عنهما] أن النبي ـ ﷺ ـ صلى [في بيت أم سلمة ـ رضي الله تعالى عنها. أخرى] في ثوب واحد قد خالف بين طرفيه [واضعا طرفيه على عاتقيه. اخرى] ح ـ ١/٣٨٠، ٣٨١. م ـ ٣/١٧٠، ١٧١.**

**تەرجەمە:**

. پێغەمەر ـ ﷺ ـ لە ماڵی ئومم وسەلەمەی حەرەمیا ـ رضي الله تعالى عنها ـ لە تەنها جلێکا نوێژی ئەکرد داوێ[2] راستی دابوو بەسەر شانی چەپیا هی چەپی بەسەر شانی راستیا (التحاف، اشتمال، اختلاف)[3] مەعنایان یەکێکە.

**١٥/١٨٤٩ـ عن أبي هريرة [رضي الله تعالى عنه] قال: [إن سائلا سأل. أخرى. خ ـ ١/٣٨٢. م ـ ٣/١٧٠] قام رجل إلى رسول الله فسأله عن الصلاة. في الثوب الواحد. فقال: أوكلكم يجد ثوبين؟ [أو لكلكم ثوبان؟ ح ـ أخرى ـ ١/٣٨٢. م ـ ٣/١٧٠]**

**ثم سأل رجل عمر [رضي الله تعالى عنه] فقال: إذا وسع الله فأوسعوا؛ جمع رجل عليه ثيابه. صلى رجل في إزار ورداء. (٢) في إزار وقميص. (٣) في إزار وقباء. (٤) في سراويل ورداء. (٥) في**

(١) لێرەدا کەوتنێك هەیە، زۆریش گەڕام بۆ ئەم ریوایەتە نەمدۆزیەوە رەنگە کەوتنەکە ئاوا بێت: (پێغەمەر ـ ﷺ ـ فەرمووی: بەرۆکت...).

(٢) داوێ: نازانم ـ ئەگەر هەڵە نەبێ ـ مانای چیە. لە شوێنی (لایەکدا)یە.

(٣) هەرسێکیان خۆێچانەوە دەگەیەنن.

سراويل وقميص. (٦) في سراويل وقباء. (٧) في تُبَّان وقباء. (٨) في تبان وقميص. [قال أبو هريرة] وأحسبه قال: في تبان ورداء. ح - ٣٨٥/١.

تەرجەمە:

ئەبوهورەیرە ـ رضي الله تعالى عنه ـ ئەفەرموێ: پیاوێ هەڵسا بۆ خزمەت پێغەمەر ـ ﷺ ـ عەرزیکرد؛ لێی پرسی لە نوێژکردن لە تەنها لیباسێکا [دروستە یا دروست نیە؟] پێغەمەر ـ ﷺ ـ فەرمووی: بۆ هەموتان دوو لیباستان دەست[1] هەیە [تا لە دوانا نوێژ بکەن]؟! لە دوای ئەوە پیاوێ لە ئیمامی عومەر ـ رضي الله تعالى عنه ـ ی پرسیی: فەرمووی: کە خوا ـ عزوجل ـ بۆی زۆرکردن ئێوەیش زۆری لەبەرکەن. پیاوێ بێنێ هەموو جلەکانی لەسەر خۆی کۆ بکاتەوە [هەمووی لەبەرکا]

(١) پیاوێ لە پێشگیرێك و لە کۆڵگیرێکا نوێژ بکا.

(٢) یەکێ لە پێشگیرێك و کراسێکا.

(٣) لە پێشگیرێك و کەواییکا.

(٤) لە دەرپێیێکاو بەرماڵێکا.

(٥) لە دەرپێیێك و کراسێکا.

(٦) لە دەرپێیێك و کەواێیکا.

(٧) لە کورتەدەرپێیێك و کەواییکا.

(٨) لە کورتە دەرپێیێك و کراسێکا.

ئەبوهورەیرە ئەفەرموێ: ظەنم وایە کە عومەر ـ رضي الله تعالى

(١) رەنگە هەڵە بێ و (دوو دەست لیباستان...) راست بێ.

عنهما - فەرمووی: لە کورتە دەرپێیێك و بەرماڵێکا.

(تبان=توببان): دەرپێی کورتە وەك دەرپێی دەباغکەر، وەك دەرپێی زۆرخانە کە تەنها سەتری فەرج ئەکا.

پێغەمەر -ﷺ- لە جوابی پرسکەرەکەدا بە ئیستیفهامی ئینکاریی فەرمووی، دیارە کە دروستە لە لیباسێکا نوێژکردن، بۆ ئێوە هەمووتان دوو لیباستان هەیە کە لە نوێژا هەردووکی لەبەرکەن؟ یەعنی نیتانە.

ئیمامی عومەریش - رضي الله تعالى عنه - ئیضاحی کردوەو تەفصیلاتی تیاداوە، یەعنی نەتان بوو لە لیباسێکا، بووتان لە هەموویا، ئەگەر هەوەستان بێنێ، نیهایەت سەتری عەورەت شەرتە.

لە لیباسێکا نوێژکردن مەذهەبی جومهووری صەحابەو، ئیبن وعەباس و، عەلی و، موعاویە.... و ئەنەس و، خالیدی سەیفوڵلاو، ئەبوهورەیرەو، عائیشەو، ئومم وهانیء - رضي الله تعالى عنهم -.... لە تابیعینیش مەذهەبی حەسەنی بەصریی و، ئیبن وسیرین و، سەعیدی بنی موسەییب و، شەعبیی و، عەطاو ئەبو حەنیفە. لە فوقەهایش مەذهەبی ئەبویوسف و، محەمەدو، شافیعیی و، مالیك و ئەحمەدو ئیسحاقە - رحمهم الله تعالى -

**١٦/ ١٨٥٠- عن أبي هريرة [رضي الله تعالى عنه] قال: قال رسول الله -ﷺ-: لا يصلي أحدكم في الثوب الواحد ليس على عاتقيه شيء. ح - ١/ ٣٨٢.**

**تەرجەمە:**

پێغەمەر -ﷺ- فەرمووی: هیچ کەسێ لە ئێوە لە تەنها لیباسێکا نوێژ نەکا مەگەر لەو لیباسە سووچێکی بەسەر هەردوو شانیەوە بێ.

١٧/١٨٥١ـ عن جابر قال: حدثني أبو سعيد الخدري [رضي الله تعالى عنه] أنه دخل على النبي ـﷺـ قال: فرأيته يصلي على حصير يسجد عليه، قال: ورأيته يصلي في ثوب واحد متوشحا به. م ـ ١٧٣/٣.

تەرجەمە:

ئەبوسەعیدی خدریی ـ رضي الله تعالى عنه ـ ئەفەرموێ: چوومە خزمەت پێغەمەر ـﷺـ لەسەر حەسیرێ نوێژی ئەکردو سوجدەی لەسەر ئەبرد. لە تەنها لیباسێکا نوێژی ئەکرد، لکاولکی کردبوو دابوویەوە بە سەر شانی موبارەکیا.

[ئەوەندە لە ئەحادیثی سەتری عەورەت کافیە، ئەوانی تریشی مەئالیان هەر وایە، لە مەعنادا هیچ فەرقیان نیە].

## إستقبال القبلة والمساجد والسترة(١)

فيه الآيات في (البقرة، وآل عمران، والمائدة، والحج.)

١/١٨٥٢ـ عن البراء بن عازب [رضي الله تعالى عنهما] أن النبي ـﷺـ كان أول ما قدم المدينة نزل على أجداده، أو قال: على أخواله من الأنصار، وأنه صلى قبل بيت المُقدَّس [أو المقدِس كالمرجع] ستة عشر شهرا أو سبعة عشر شهرا، وكان يعجبه أن تكون قبلته قبل البيت، وأنه صلى أولى صلاة صلاها [متوجها إلى الكعبة] صلاة العصر، وصلى معه قوم، فخرج رجل ممن صلى معه فمرّ على أهل مسجد [من بني حارثة، ويعرف الآن بمسجد القبلتين] وهم راكعون، فقال: أشهد بالله لقد

(١) رووكردنەقیبلەو، ئادابی مزگەوت و، بەرنوێژ...

صليت مع رسول الله -ﷺ- قبل مكة، فداروا كما هم قبل البيت، وكانت اليهـود قد أعجبهم إذ كان يصلي قبـل بيت المَقْدِسِ وأهلُ الكتاب، فلما ولّى وجهه قبل البيت أنكروا ذلك.

وعنـه في حديثـه هذا أنـه مات على القبلة [المنسـوخة] قبل أن تحول رجـال، وقتلوا فلم ندر مانقـول فيهم، فأنـزل الله - تعالى -: ﴿وما كان الله ليضيع إيمانكم﴾[1] ح - ١/١٢٣. م - ٣/١٨١. ن، ت، جه.

٢/١٨٥٣ - وعنـه في أخـرى: =كـان رسـول الله -ﷺ- صلى نحو بيت المقـدس ستـة عشـر شهرا، أو سبعة عشر= شهرا. وكان رسول الله -ﷺ- يحب أن يوجـه إلى الكعبـة، فأنـزل الله - عزوجـل -: ﴿قـد نرى تقلب وجهك في السماء﴾[2] فتوجه نحو الكعبة، وقال السفهاء من الناس - وهم اليهـود -: ﴿مـا ولاّهم عن قبلتهم التي كانـوا عليهـا؟ قل: لله المشـرق والمغـرب، يهـدي من يشاء إلى صراط مستقيم﴾[3] فصلى مع النبي -ﷺ- رجل [عباد بن بشر - رضي الله تعالى عنه -] ثم خرج بعد ما صلى فمر على قوم من الأنصـار في صلاة العصـر نحـو بيت المقدس فقال: هو يشهد أنه صلى مع رسـول الله -ﷺ- وأنـه توجـه نحـو الكعبـة، فتحـرف القوم حتى توجهوا نحو الكعبة. ح - ١/٤٠٦. م - ٣/١٨١-١٨٣. ت، ن، جه.

٣/١٨٥٤ - عن عبد الله بن عمر [رضي الله تعالى عنهما] قال: بينا الناس بقبـاء في صلاة الصبـح إذ جاءهم آتٍ فقـال: إن رسـول لله -ﷺ- قد أنزل عليه الليلة قرآن، وقد أمر أن يستقبل الكعبة فاستقبلوها. وكانت وجوههم

(١) البقرة/ ١٤٣.
(٢) البقرة/ ١٤٤.
(٣) البقرة/ ١٤٢.

الى الشام، فاستداروا إلى الكعبة. ح ـ ١/ ٤٠٩، م ـ ٣/ ١٨٣. ن.

**تەرجەمەكانیان:**

١ ـ بەراء ـ رضي الله تعالى عنه ـ ئەفەرموێ: پێغەمەر ـ ﷺ ـ لە ئەوەڵەوە كە تەشریفی هاتە مەدینە میوانی ماڵی ئەجدادی، یا فەرمووی: میوانی خاڵووانی بو لە ئەنصار. پێغەمەر ـ ﷺ ـ شانزە یا حەڤدە مانگ بەرەوڕووی (بیت المقدس) نوێژی كرد، حەزی ئەكرد كە قیبلەی بەرەو بەیت بێت، ئەووەڵ نوێژێ كە بەرەو بەیت كردی نوێژی عەصر بوو، لە خزمەتیا قەومێ نوێژیان =كرد= یەكێ لەوانەی كە نوێژی عەصری لە خزمەتیا كردبوو [كە عوببادی كوڕی بیشر، یا عوببادی كوڕی نەهیكە ـ رضي الله تعالى عنهما ـ] بە لای مزگەوتی [بەنی‌حاریثەدا، كە مەشهوورە بە مزگەوتی دوو قیبلە] رابورد لە روكووعا بوون، ئەو پیاوە فەرمووی: بە خوا شەهادەت ئەدەم كە لە خزمەت پێغەمەرا ـ ﷺ ـ نوێژم بەرەو مەككە كرد. هەموو هەر بەو هەیئەتە وەرگەڕان بۆ بەرەو بەیت. یەهوودو ئەهلی كیتاب پێیان خۆش بوو كە پێغەمەر ـ ﷺ ـ بەرەو (بیت المقدس) نوێژی ئەكرد، كە پێغەمەر ـ ﷺ ـ رووی وەرگێرایە بەیت ئینكاری ئەوەیان كرد.

٢ ـ هەر لەم حەدیثەدا ئەفەرموێ: لە پێش تەحویلی قیبلەدا گەلێ ئینسان وەفاتیان كردبوو، شەهیدكرابوون، نەمانزانی دەرحەق ئەوانە بڵێین چی؟ ئەو نوێژانەی (بیت المقدس)[١] دروست بوە یا نەبوە؟

---

(١) واتە ئەو نوێژانەی كە بەرەو قودس كردوویانن.

خوا ـ عزوجل ـ ئەم ئایەتەی سوورەتی بەقەرەی نازڵ فەرموو کە مەعنـــای وایـە: نەبـوە کە خوا نوێـژی بەرەو (بیت المقـدس)تـان بەضایع بدا.

٣ ـ لە ریوایەتێکی تری بەرادا ـ رضي الله تعالی عنه ـ ئەفەرموێ: پێغەمەر ـﷺـ حەزی ئەکرد کە لە نوێژا روو بکاتە کەعبە، خوا ـ عزوجـــل ـ ئەم ئایـەتی بەقـەرەی نازڵ فەرمـوو کە مەعنـای وایـە: چاومان لێیە کە روو بۆ ئاسمان ئەگێری [بۆ تەحویلی قیبلە] پێغەمەر ـﷺـ [کەئیزن درا] رووی کردە کەعبە سوفەهای ناس، کە جوولەکەن، وتیان: چی ئەوانی وەرگێرا لەو قیبلەیەی کە لە سەری بوون؟ ئەی محەمەد پێیان بڵێ: مەشریق و مەغریب موڵکی خوایە، مەقصوود لە نوێـژا رووکـردنـە مەشـریق و مەغریب نیە، مەقصوود ئیمتیثالی ئەمـــری خوایـە، خوا ئەوی ئیـرادەی بکـا هیـدایـەتی ئەدا بۆ ڕێی راست. پیـاوێ کە عوببـادی کوڕی بیشـر یا عوببـادی =کـوڕی= نەهیکـە ـ رضي الله تعـالی عنهمـا ـ لە خزمـەت پێغـەمەرا ـﷺـ نوێـــژی [نیـــوەڕۆی] کرد، لە دوای ئەمـە کە نوێـژی کرد بە لای قەومێ لە ئەنصـــارا رابـورد لە نوێـژی عەصـرا بوون، روویـان لە (بیت المقدس) بوو، فەرمووی: شەهادەت ئەدا کە لە خزمەت پێغەمەرا ـﷺـ نوێژی کرد، پێغەمەر ـﷺـ رووی کردبوە کەعبە.. قەومەکە وەرگەڕان تا روویان کردە کەعبە.

عەبدوڵڵای کوڕی عومەر ـ رضي الله تعالی عنهما ـ فەرمووی: لە وەختێکا کە خەڵق لە قوبا لە نوێژی صبحەینێدا بوون پیاوێ هات، کە

عوبادی کوڕی بیشرە، فەرمووی: پێغەمەر ـﷺـ ئیمشەو قورئانێکی بۆ نازڵ بوە، ئەمـری پێ کـراوە کە روو بکـاتـە کەعبـە، هەمـوو روویـان تێ کرد، روویان لە شام بوو وەرگەڕان بۆ کەعبە: [ئیمام چوو بۆ صەفی دواوە، پیـاو لە پشت ئەوەوە، ژنـانیش بۆ صەفی پێشـوو، کە لە پێشـا پێشوو بوو ئێستە بوو بە دوایی لە پشت پیاوانەوە وەستان.]

[بەم هەموو ئیشە نوێژیان بەتاڵ نەبۆتەوە، لە بەر ضەروورەت بوو، یا بە مەنگاویی بە فاصیلە].

خەبەری (واحد) حوججەتە.

(بعـد العلم) ئیمتیثـالی ناسیـخ لازمـە. تا پێی نەگـا لازم نیـە، عەمەلی پێش عیلمی بەتاڵ نیە.

ئەم سێ حەدیثە لە هەرسێکیانا موخبیری ناسیخەکە هەر یەك پیاو بوە. لە حەدیثی ئەووەڵا ئەفەرموێ: پێغەمەر ـﷺـ لە نوێژی عەصرا رووی‌کردە (بیت الحرام) دوای عەصر ئەو پیاوە چوە مەسجیدی بەنی حاریثە.

لە حەدیثی دوەما عوبباد لە نوێژی نیوەڕۆدا لە خدمەت پێغەمەرا ـﷺـ نوێژی کرد، لە نوێژی عەصرا چوو بۆ ئەو مزگەوتی ئەنصارە.

لە ریوایەتی ئیبن وعومەرا ـ رضي الله تعالى عنهما ـ لە نوێژی صبحەینێدا عوبباد چوو بۆ قوبا کە مەسجیدی بەنی عەمرە..

هەر سێ ریوایەتەکە صەحیحە؛ چونکی مەسجیدی بەنی‌حاریثە لە مەدینەوە نزیکە، دوای نوێژی نیوەڕۆ عوبباد گەییوە بە نوێژی عەصریاناو خەبەری داونێ، لە نوێژی عەصرا ئەمان وەرگەڕاون، لەوێ تەشریفی چۆوە بۆ مزگـەوتی قوبا لە نوێـژی سبەینێیانا وخەبـەری داونێ،

مەسجیدی دوو قیبلە مەسجیدی بەنی حاریثەیە مەسجیدی قوبا نیە.

ئەوەی ماوە کە نوێـژی عەصـر تەحـویـلی قیبلە بوە وەك حەدیثی ئەووەڵ، یا نوێژی نیوەڕۆ تەحویلی بوە وەك حەدیثی دوەم؟ نەوەویی ـ رحمه الله ـ هیچ قسەی لەمانە نەفەرموە؛ چونکی لە ریوایەتی موسلیما کەلیمەی عەصر نیە، تەنها لە حەدیثی ئیبن وعومەرا ـ رضي الله تعالى عنهما ـ لەفظی (غەدات) هەیە.

قەسطەلانیی ئەفەرموێ: لە طەبەقاتی ئیبن وسەعدایە کە: پێغەمەر ـﷺـ دوو رکات نوێژی نیوەڕۆی لە مزگەوتی نەبەوییا بە خەڵق کرد، لە پاشـا ئەمـری پێ کـرا کە روو بکـاتـە (مسجـد الحـرام) پێغـەمەر ـﷺـ وەرگەڕاو خەڵقیش لە خزمەتیا وەرگەڕان.

(ویقـال):[1] پێغـەمـەر ـﷺـ زیـارەتی ئومم وبیشـری کوڕی بەرای کوڕی مەعـرووری کرد لە بەنی سـەلـەمـەدا. ئومم وبیشـر ـ رضي الله تعـالى عنهـا ـ طەعـامێکی بۆ دروست کرد نیـوەڕۆ داهـات پێغـەمـەر ـﷺـ دوو رکـات نوێـژی بە ئەصحـابی کیـرامی کرد، ئەمـری پێ کراو رووی کردە کەعبە بۆ طەرەفی (میزاب) =بۆیە= پێی ئەڵێن: مەسجیدی دووقیبلە.

ئیبن وسەعد ئەفەرموێ: کە واقیدیی فەرمووی: ئەمە لە لای ئێمە جێگیرترە.

وەلحاصڵ ئەوی بۆ ئێمە لازمە =ئەوەیە= کە ئێستە رووی تێ کەین. کەی تەحویلی بووبێ؛ عەصر بێ یا نیوەڕۆ بێ؟ مەطلووب نیە.

---

(١) گوتراوە، یا ریوایەت کراوە.

ئيحتيماليشى هەيە بەراء كە ئەفەرموێ: ئەووەڵ نوێژێ كە پێغەمەر -ﷺ- لەو نوێژەدا رووى كردبێتە كەعبە نوێژى عەصر بوو. . مورادى وابێ ئەووەڵ نوێـژێ كە هەر لە ئەووەڵيـەوە تا ئاخـرى تەوەجـوهى تيـاكـردبێتـە كەعبـە نوێـژى عەصر بوو، لە نوێژى نيوەڕۆدا نيوەى بەرەو (بيت المقـدس)و نيـوەى بەرەو كەعبـە كردوە، عوببـاد لە دواى نوێـژى عەصر تەشريفى چووبێ بۆو بەنىحاريثەو بەنى عەمر.

١٩٤١/٤/٦

رجـام لە مەلا عەبـدوسـەلام (سلمـه الله) وايـە كە ئەم ميقـدارەى وەرگـرت مونتـەظيـر نەبێ تا ئەيخـوێنێتەوە، دەزبەجێ جوابى گەيشتنى بنووسێ تا دڵ ڕەحەت ببم چونكى وەختەكەى خراپە (والسلام).

**٤/١٨٥٥- عن ميمون بن سياه، عن أنس بن مالك [رضي الله تعالى عنـه] قال: قال رسـول الله -ﷺ-: من صلى صلاتنـا، واستقبـل قبلتنا، وأكل ذبيحتنا فذلك المسلم الذي له ذمة الله وذمة رسوله فلا تخفروا الله في ذمته. ح - ١/١/٤٠. ن. له ما للمسلم وعليه ما على المسلم. أخرى عنه. خ.**

**تەرجەمە:**

پێغەمەر -ﷺ- فەرمووى: هەركەسێ نوێژى ئێمە بكاو، روو بكاتە قيبلەى ئێمە لە نوێژاو، ئەو حەيوانەى ئێمە سەرى ئەبرين بخوا ئەوە موسوڵمانێكە كە لە ئەمانى خواو رەسوولى خوادايە، ئەمانى خواو ئەمانى رەسـوولى خوا هەڵمـەوەشێنن. لە ريـوايـەتـەكـەى ترا ئەفـەرمـوێ: ئەو فائيـدەى بۆ موسـوڵمـانى تر هەيـە بۆ ئەويش هەيـە، ئەو زەرەرەى بۆ موسوڵمانى تر هەيە بۆ ئەويش هەيە. يەعنى مەڵێن ئەوە مونافيقە بە ريبا

وا ئەکا.

ئەم حەدیثە دەلالەت ئەکا لەسەر ئەمە کە ئیستیقبالی قیبلە فەرزە.

## دخول الكعبة والصلاة فيها[1]

**٥/١٨٥٦- مجاهد قال: أُتي ابن عمر [رضي الله تعالى عنهما] فقيل له: هذا رسول الله -ﷺ- دخل الكعبة. فقال ابن عمر [رضي الله تعالى عنهما] فأقبلت والنبي -ﷺ- قد خرج، وأجد بلالا قائما بين البابين [أي مصراعي البـاب؛ لأن البيت يومئـذ لم يكن له إلا باب] فسألت بلالا فقلت: أصلّى النبي -ﷺ- في الكعبة؟ قال: نعم ركعتين بين الساريتين اللتين على يساره [يســار البيت، أو الـداخـل] اذا دخلت، ثم خرج فصلى في وجـه الكعبة ركعتين. ح - ١/٤٠٥. وفي الحـج والصـلاة والجهـاد. م - ٦/١١. د، ن، جه.**

**تەرجەمە:**

موجاهید ئەفەرموێ: هاتنە خذمەت ئیبن وعومەر [رضي الله تعالى عنهما] عەرزیان کرد: ئەوە پێغەمەرە -ﷺ- تەشریفی چوە ناو کەعبەوە، رووم کردە ئەوێ کە بچمە ناوی، پێغەمەر -ﷺ- تەشریفی ئەهاتە دەرێ لە ناو دەرگـاکـەیـا بە بیـلال گەییم، لێم پرسیی: پێغـەمـەر -ﷺ- لە ناو کەعبەدا نوێژی کرد؟ فەرمووی: کردی دوو رکاتی لە بەینی ئەو دوو کۆڵەکەدا کرد کەلە دەستەچەپتەوەن کە ئەچیتە ژوورێ. لە پاشا پێغەمەر -ﷺ- کە تەشریفی هاتەدەرێ دوو رکاتی [لای مەقامەوە] بەرەوکەعبە کرد.

(١) چوونەکەعبەو نوێژکردن تیایا.

١٨٥٧/٦ـ ابن جريج قال: قلت لعطاء: أسمعت ابن عباس [رضي الله تعالى عنهما] يقول: إنما أُمرتم بالطواف ولم تؤمروا بدخوله؟ قال: لم يكن ينهى عن دخوله، ولكني سمعته يقول: أخبرني أسامة بن زيد [رضي الله تعالى عنهما] أن النبي ـﷺـ لما دخل البيت دعا في نواحيه كلها ولم يصل فيه حتى خرج، فلما خرج ركع في قُبُل البيت ركعتين، وقال: هذه القبلة. قلت له: ما نواحيها؟ أفي زواياها؟ قال: بل في كل قبلة من البيت. م ـ ٦/١٢.

تەرجەمە:

ئيبن وجورەيج ـ رحمه الله تعالى ـ ئەفەرموێ: له عەطام پرسيى: له ئيبن وعەباس ـ رضي الله تعالى عنهما ـ ت بيستوه كه فەرموويێتى ئێوه هەر بەوەتان ئەمر پێكراوه كه طەوافى بەيت بكەن ئەمرتان پێنەكراوه كه بچنه ناوى؟ فەرمووى: ئيبن وعەباس ـ رضي الله تعالى عنهما ـ نەهى نەئەكرد لە چوونەناويەوه. ئەمما وام لێ بيستوه كه ئەيفەرموو: ئوسامەى كورى زەيد ـ رضي الله تعالى عنهما ـ خەبەرى داومێ كه پێغەمەر ـﷺـ كه تەشريفى چوه ناو بەيتەوه لە هەموو ئەطرافى بەيتا دوّعاى كردو لە بەيتا نوێژى نەكرد تا تەشريفى چوه دەرێ، له بەرابەر بەيت دوو ركاتى كرد، فەرمووى: ئەمە قيبلەيە. عەرزى ئيبن وعەباسم كرد ـ رضي الله تعالى عنهما ـ: مەعناى ئەطرافى بەيت چيه؟ گۆشەكانيەتى؟ فەرمووى: خەير بەڵكو لە كوللى جوزئێكيا قيبلەيەكە لە بەيت. يەعنى هەموو جوزئێكى قيبلەيە.

١٨٥٨/٧ـ عن نافع عن ابن عمر [رضي الله تعالى عنهما] ان النبي ـﷺـ

قدم مكة فدعا عثمان بن طلحة [رضي الله تعالى عنه] ففتح الباب، فدخل النبي -ﷺ- وبلال، وأسامة بن زيد، وعثمان بن طلحة [رضي الله تعالى عنهم] ثم أغلق الباب، فلبث فيه ساعة، ثم خرجوا. قال ابن عمر [رضي الله تعالى عنهما]:فبدرت فسألت. بلالا: [هل صلى النبي -ﷺ- فيه أم لا؟] فقال: صلى فيه. فقلت: في أي [من نواحيه]؟ [قال: جعل عمودين عن يساره، وعمودا عن يمينه، وثلاثة أعمدة وراءه وكان البيت يومئذ على ستة أعمدة ثم صلى. ح - ١/٤٥٨] قال: بين [العمودين المقدمين. أخرى. م] الإسطوانتين. قال ابن عمر [رضي الله تعالى عنهما] فذهب عليَّ أن أسأله كم صلى. ح - ١/٤٤٤، ٤٥٧. م - ٦/٧/١١. د، ن، جه. ح - ٦/٣٨٠.

تەرجەمە:

نافیع لە عەبدوڵڵای کوڕی عومەرەوە - رضي الله تعالى عنهما - ریوایەت ئەکا پێغەمەر -ﷺ- تەشریفی هاتە مەککە، عوثمانی کوڕی طەلحەی بانگ کرد دەرگای بەیتی کردەوە، پێغەمەر -ﷺ- و بیلال و، ئوسامەی کوڕی زەیدو، عوثمانی کوڕی طەلحە - رضي الله تعالى عنهم - تەشریفیان چوە بەیتەوە. لە دواییدا عوثمان - رضي الله تعالى عنه - دەرگاکەی لەسەر داخستن، ساعەتێ تەشریفی تیا بەند بوو، لە پاشا تەشریفیان هاتە دەرێ. ئیبن وعومەر - رضي الله تعالى عنهما - فەرمووی: گورج چووم لە بیلالم پرسیی: پێغەمەر -ﷺ- نوێژی تیاکرد یان نا؟ فەرمووی: تیاکرد. وتم: لە کوێیا؟ فەرمووی: لە بەینی دوو کۆڵەکەی پێشەوە. لە ریوایەتەکەی تریا فەرمووی: دوو کۆڵەکەی خستە لای چەپیەوە، یەکێکی لای راستیەوە، سیانیش لە پشتیەوە. ئەو وەختە

بەیت لە سەر شەش کۆڵەکە بوو. لە فکرم چوو لێی بپرسم چەند رکاتی کرد.

**٨/١٨٥٩- وعنـه قال: أقبـل رسـول الله -ﷺ- عام الفتح على ناقة لأسامة بن زيد [رضي الله تعالى عنهما] حتى أناخ بفناء الكعبة، ثم دعا عثمان بن طلحة [رضي الله تعالى عنه] فقال: ائتني بالمفتاح، فذهب إلى أمه، فأبت أن تُعطيَه، فقال: والله لتعطينيه أو ليخرجن هذا السيف من صلبي! قال: فأعطته إياه. فجاء به إلى النبي -ﷺ- ففتح الباب. (قال مسلم:) ثم ذكر بمثل حديث حماد بن زيد. م - ٦/١٠.**

**تەرجەمە:**

ئیبن وعومەر - رضي الله تعالى عنهما - ئەفەرموێ: پێغەمەر -ﷺ- لە ساڵی فەتحا تەشریفی هاتە مەککە، سواری وشترێکی ئوسامەی کوڕی زەید بوو، تا وشترەکەی لە بەردەمی بەیتا ییخ دا. لە دواییدا عوثمانی کوڕی طەلحەی پەردەداری بەیتی بانگ =کرد= فەرمووی: کلیلی بەیتم بۆ بێنە. عوثمان چوە لای دایکی کلیلەکەی نەدایێ. عوثمان - رضي الله تعالى عنه - بە دایکی وت: وەڵڵاهی یا کلیلەکەم ئەئەیتێ یا ئەم شیرە لە پشتمەوە ئەچێتە دەرێ! [یەعنی خۆم ئەکوژم. دایکی کە زانیی قسەکەی ئەباتە سەر ئەگەر کلیلەکەی نەداتێ] کلیلەکەی دایێ، هێنای بۆ خدمەت پێغەمەر -ﷺ- دەرگاکەی کردەوە لە پاشا تەشریفیان چوە ژوورێ وەك لە حەدیثەکەی پێشوا فەرمووی... (إلخ).

[ئەوەندە کافیە؛ چونکی هەموو وەك یەکن] بیلال ئەفەرموێ: دوو رکات نوێژی تیاکرد. ئوسامە ئەفەرموێ: تیا نەکرد، رەنگە ئوسامە -

رضي الله تعالى عنه ـ مەشغووڵ بوویێ بە شتی ترەوە، ئاگای لەوە نەبوویێ بیلال (مثبت)ە ئەو (نافي)ە ریوایەتی (مثبت) لەسەر (نافي) مقدمە.

**٩/١٨٦٠ـ عن نافع أن ابن عمر [رضي الله تعالى عنهما] كان إذا دخل الكعبة مشى قُبُل وجهه حين يدخل، وجعل الباب قبل ظهره، فمشى حتى يكون بينه وبين الجدار الذي قُبُل وجهه قريبا من ثلاثة أذرع صلى يتوخى المكان الذي أخبره به بلال أن النبي -ﷺ- صلى فيه. قال: وليس على أحد بأس إن صلى في أي نواحي البيت شاء. ح ـ ١/٤٥٨. ح ـ ٣/١٥٧.**

**تەرجەمە:**

عەبدوڵڵای ئیبن وعومەر ـ رضي الله تعالى عنهما ـ کە تەشریفی بچوایەتە ناو بەیتەوە تەشریفی بۆ بەردەمەوەی ئەڕۆیی دەرگاکەی ئەخستە پشتیەوە، تەشریفی ئەڕۆیی تا سێ ذیراعی ئەما بۆ دیوارەکەی بەردەمی؛ بۆ ئەو جێیە ئەگەڕا کە بیلال ـ رضي الله تعالى عنه ـ خەبەری دابوویێ کە پێغەمەر ـﷺ- نوێژی تیا کردبوو، فەرمووی: ئینسان لە هەر جێیێکی بەیتا کە خۆی هەوەسی پێنێ نوێژی تیا بکا نوێژ بکا قەی ناکا.

**١٠/١٨٦١ـ عبد الله بن أبي أوفى [رضي الله تعالى عنهما] قال: إعتمر رسول الله -ﷺ- فطاف بالبيت، وصلى خلف المقام ركعتين، ومعه من يستره من الناس. فقال له رجل: أَدَخَلَ رسول الله -ﷺ- الكعبة؟ قال: لا. ح ـ ٣/١٥٧. م ـ ٦/١٣. د، ن، جه.**

**تەرجەمە:**

عەبدوڵڵای کوڕی ئەبوئەوفا ـ رضي الله تعالى عنهما ـ ئەفەرموێ:

پێغـــەمـەر -ﷺ- (عمـرة القضـا)ی[1] کرد طەوافی بەیتی کرد، لە پشت مەقامەوە دوو رکات نوێژی کرد، خەڵقی لە خزمەتا بوو کە لە کوففاری قورەیشی موحافەظە بکەن. پیاوێ لە عەبدوڵلای پرسیی: پێغەمەر -ﷺ- تەشریفی چوە بەیتەوە؟ فەرمووی: خەیر [چونکی ئەو وەختە بەیت بتی زۆری تیابـو، کە فەتحی مەککـەی کرد ئەمـری کرد بتـەکـانیان لابردو تەشریفی چوە ناوی].

نوێــژکــردن لەکـەعبـەدا سوننـەتـە. لە جێیـەکـا صوورەتی تیـابێ مەکرووهە، با کەعبەیش بێ.

**١١/١٨٦٢- عن ابن عباس ـ رضي الله تعالى عنهما ـ قال: إن رسول الله -ﷺ- لما قدم [مكة] أبى أن يدخل البيت وفيه الآلهة [الباطلة] فأمر بهـا فأُخـرجت، فأخـرجـوا صورة إبـراهيم وإسمـاعيـل [عليهما الصلاة والسلام] في أيديهما الأزلام. فقال رسول الله -ﷺ-: قاتلهم الله [أي: لعنهم. قاموس] أما والله قد علموا أنهما لم يستقسما بها قط. فدخل البيت فكبر في نواحيه، ولم يصل فيه. ح ـ ٣/١٥٨.**

**تەرجەمە:**

ئیبن وعەباس ـ رضي الله تعالى عنهما ـ ئەفەرموێ: پێغەمەر -ﷺ- کە تەشریفی هاتە مەککە ئیبای کرد لەوە تەشریفی بچێتە ناو بەیتەوەو بەیت مەعبوودی باطیلی تیا بێ، ئەمری کرد هێنرانە دەرێ، صوورەتی ئیبـراهیم و ئیسمـاعیـل ـ علیهمـا الصلاة والسلام ـ یشیان هێنایەدەرێ ئەزلامیان بە دەستەوە بوو، فەرمووی: خوا لەعنەتیان لێ بکا، وەڵڵاهی

(١) مەبەست ئەو عومرەیە کە پێغەمەر ـ د ـ ساڵی دوای (صوڵحی حودەیبییە) کردی.

زانیویانە کە ئیبراهیم و ئیسماعیل ـ علیهما الصلاة والسلام ـ قەت بە ئەزلام فاڵیان نەگرتۆتەوە. ئەمجا پێغەمەر ـﷺـ تەشریفی چوە ناو بەیتەوە، لە ئەطرافی بەیتا تەکبیری کرد، نوێژی تیا نەکرد.

**عن عبد الله[1] [بن مسعود ـ رضي الله تعالى عنه ـ] قال: دخل النبي ـﷺـ مكة يوم الفتح وحول البيت ستون وثلاثمائة نصب، فجعل يطعنها بعود في يده ويقول: ﴿جاء الحق وزهق الباطل﴾[2] ﴿جاء الحق وما يبدىء الباطل وما يعيد﴾[3]. ح ـ ٦/٣٧٩.**

**تەرجەمە:**

عەبدوڵڵای بنی مەسعوود ـ رضي الله تعالى عنه ـ ئەفەرموێ: پێغەمەر ـﷺـ لە رۆژی فەتحا تەشریفی هاتە مەککە لە دەورو پشتی کەعبە سێصەدو شەصت بتی لێبوو، پێغەمەر ـﷺـ دارێکی بە دەستەوە بوو بەو دارە لەو بتانەی ئەداو ئەیفەرموو: حەق هات و باطیل بەهیلاك چوو، حەق هات باطیل نە لە ئیبتیداوە شت خەلق ئەکا نە شتی بەهیلاکاچوو ئیعادە ئەکاتەوە.

[فاکیهی لە ئیبن وعومەرەوە ریوایەت ئەکا: دارەکەی لێ نەئەکەوت و بتەکە ئەکەوت. لە ئیبن وعەباسەوە ریوایەت ئەکا: هەر بتێ پێغەمەر ـﷺـ رووی ئەکردێ ئەو بتە بە پشتا ئەکەوت، لەگەڵ ئەمەدا ئەو بتانە بە قورقوشم بە ئەرزا دابەسترابوون.]

**١٢/١٨٦٣ـ عن أبي وائل، قال: جلست إلى شيبة [بن عثمان**

(١) دانەر ـ خ ـ ژمارەی بۆ ئەم حەدیثە دانەناوە.
(٢) الإسراء /٨١.
(٣) سبأ/٤٩.

الحجبي] في هذا المسجد [الكعبة عند بابها أو فيها] قال: جلس إليَّ عمر [رضي الله تعالى عنه] في مجلسك هذا، فقال: هممت أن لا أدع فيها صفراء ولا بيضاء إلا قسمتها بين المسلمين. قلت: ما أنت بفاعل. قال: لِمَ؟ قلت: لم يفعله صاحباك. قال: هما المرآن يقتدى بهما. ح ـ ١٠/ ٢٨٩.

(والله يا عمر إنك لأنت المرء الثالث. رشيد).

تەرجەمە:

ئەبـو وائيـل ئەفـەرمـوێ: لای شەيبـەی كوڕی عوثمانی پەردەداری كەعبە دانيشتبووم لەم مزگەوتەدا فەرمووی: ئيمامی عومەر ـ رضي الله تعـالـی عنـه ـ تەشـريـفـی لامـەوە دانيشت لەو جێيـە كە تۆی لێ دانيشتووی، فەرمووی: نييەتم وايە كە لە بەيتا نە سوور نە سپيی تيا نەيێڵم [نە ئاڵتوون نە زيوی تيا نەيێڵم] هەمووی لە بەينی موسوڵمانانا بەش بكەم. عەرزم كرد: تۆ ئەوە ناكەی، فەرمووی: بۆچی؟ =وتم:= چونكی رەفيقەكانت كە پێغەمەر ـ ﷺ ـ و ئەبوبەكرە ـ رضي الله تعالی عنـه ـ نەيـان كردوە. فەرمـووی: ئەوانـە دوو پيـاوبـوون ئيقتيـدايان پێ ئەكرێ. [. . . . .]

## بناء البيت وتعميره[1]

١٣/ ١٨٦٤ـ عبـد الله بن الـزبيـر [رضي الله تعـالی عنهمـا] يقـول: حدثتني خالتي يعني عائشـة [رضي الله تعـالی عنهـا] قالت: قال النبي

(١) دروستكردنی بەيت و چاككردنەوەی.

ـﷺـ: يا عائشـة لولا أن قومَـكِ حديثـو عهـد بشـرك لهـدمت الكعبـة، فألـزقتهـا بالأرض، وجعلت لهـا بابين: بابا شرقيا، وبابا غربيا، وزدت فيها ستة أذرع من الحجر؛ فإن قريشا إقتصرتها حين بنت الكعبة. م ـ ١٨/٦.

تەرجەمە:

عەبـدوڵـڵای بنی زوبـەیـر ـ رضي الله تعـالى عنهما ـ ئەفەرموێ: عایشەی پوورم ـ رضي الله تعالى عنها ـ قسەی بۆ کردووم فەرمووی: پێغـەمـەر ـﷺـ فەرمـووی: ئەی عایشـە ئەگـەر قەومـەکەت زەمانیان لە زەمانی شیرکیان نزیك نەبوایە کەعبەم تێك ئەدا ئەم نووسان بە ئەرزەوە [یـەعنی دەرگـاکـەییم تا ئەرز ئەهێنـایـە خوارەوە] دوو دەرگام بۆ ئەکرد: دەرگاییکی لە رۆژهەڵات، دەرگاییکی لە مەغریب. لە (حجر) شەش زیراعم لێ زیاد ئەکرد؛ چونکی قورەیش لە وەختێکا کە بینای بەیتیان کرد دەست کورت بوون.

١٤/١٨٦٥ـ عن عطاء قال: لما احترق البيت زمن يزيد بن معاوية [.......] حين غزاه أهـل الشـام، فكـان من أمـره ما كان، تركه ابن الزبير [رضي الله تعالى عنهما] حتى قدم الناس الموسم يريد أن يُجرِئهم أو يحربهم [أي يغيظهم بما يرونه. أو يشجعهم على قتالهم بإظهار قبح فعالهم. نووي] على أهل الشام. فلما صدر الناس قال: يا أيها الناس أشيروا عليَّ في الكعبة: أنقضها ثم أبني بناءها؟ أو أصلح ما وهى منها؟ قال ابن عباس [رضي الله تعالى عنهما]: فإني قد فرق لي رأي فيها؛ أرى أن تصلح ما وهى منهـا، وتـدع بيتـا أسلم النـاس عليـه، وأحجارا أسلم الناس عليها، وبعث عليها النبي ـﷺـ فقال ابن الزبير: لو كان

أحـــدكم احتـــرق بيتـــه ما رضي حتى يجـــدِّده فكيف بيت ربكم؟ إني مستخير ربي ثلاثا ثم عازم على أمري. فلما مضى الثلاث أجمع رأيه على أن ينقضها، فتحاماه الناس أن ينزل بأول الناس يصعد فيه أمرٌ من السماء، حتى صعده رجل فألقى منه حجارة، فلما لم يره الناس أصابه شيء حتى تتباعوا، فنقضوه حتى بلغوا به الأرض.

فجعل ابن الزبير [رضي الله تعالى عنهما] أعمدة فستر عليها الستور حتى إرتفع بناؤه. وقال ابن الزبير [رضي الله تعالى عنهما]: إني سمعت عائشة تقول: إن النبي ـﷺـ قال: لولا أن الناس حديث عهدهم بكفر وليس عنـدي نفقـة ما يقـويني على بنـائـه لكنت أدخلت فيه من الحجر خمس أذرع، ولجعلت لها بابا يدخل منه الناس، وبابا يخرجون منه. قال: فأنا اليوم أجد ما أنفق ولست أخاف الناس. قال: فزاد فيه خمس أذرع من الحجـر حتى أبـدى أسّاً نظـر النـاس إليه، فبنى عليه البناء، وكان طول الكعبة ثماني عشرة ذراعا، فلما زاد فيه استقصره، فزاد في طوله عشرة أذرع، وجعل له بابين أحدهما يُدخل منه، والآخر يخرجون منـه. فلمـا قتـل ابن الـزبيـر كتب الحجـاج الى عبـد الملك بن مروان [. . . . . . . .] يخبـره بذلـك، ويخبـره أن ابن الـزبيـر [رضي الله تعالى عنهما] قد وضع البناء على أس نظر إليه العدول من أهل مكة. فكتب إليه عبد الملك [. . . . . .]: إنا لسنا من تلطيخ ابن الزبير في شيء. أما ما زاد في طوله فأقره. وأما ما زاد فيه من الحجر فرده إلى بنائه، وسدّ الباب الذي فتحه. فنقضه وأعاده إلى بنائه. م ـ ٦/١٩.

تەرجەمە:

عەطاء ئەفەرموێ: كە بەيت لە زەمانی یەزیدی كوڕی موعاویەی

[قەراڵی شاما] =سووتا= لەو وەختەدا کە ئەهلی شام غەزای مەککەیان کرد [. . . . .] لە ئەمری ئەو ئەوە بوو کە کردیان. (ابن الزبير) ـ رضي الله تعالى عنهما ـ لەسەر ئەو حاڵە هێشتیەوە، تا خەڵق هاتن بۆحەج، ئیرادەی وابوو کە خەڵق تەشویق بکا بۆ ئینتیقام لە ئەهلی شام بەمە کە خەباثەتی خۆیان و کردەوەیان پێنیشانی خەڵق بدا. کە خەڵق ئیرادەیان بوو بگەڕێنەوە عەبدوڵڵا ـ رضي الله تعالى عنه ـ فەرمووی: ئەی خەڵقینە موشاوەرەتان پێ ئەکەم؛ ڕێگەم پێ‌نیشان بدەن دەرحەق کەعبە: تێکی بدەم و بینای بکەمەوە؟ یا ئەوی کە زەدە بوە ئیصلاحی بکەم؟ ئیبن وعەباس ـ رضي الله تعالى عنهما ـ فەرمووی: من ڕەئییێکم بۆ مەعلووم کراوە کە ئەوەی تێکچوە چاکی بکەیتەوە، بەیت بێڵیتەوە لە سەر ئەو حاڵەی کە خەڵقی لەسەر موسوڵمان بوون و، ئەو بەردانە بێڵیەوە لەسەر ئەو حاڵەی کە خەڵقی لەسەر موسوڵمان بوەو، پێغەمەر ـﷺـی لەسەر نێرراوە. ئیبن وزوبەیر ـ رضي الله تعالى عنه ـ فەرمووی: یەکێ لە ئێوە خانووی بسووتێ تا سەر لە نوێوە نەیکاتەوە رازی نابێ، چۆن خانووی خوای ئێوە بسوتێ تازە ناکرێتەوە؟! تا سێ ڕۆژ ئیستیخارە لە خوای خۆم ئەکەم، لە دواییدا ئەکەومە سەرەوکاری ئیشی خۆم، یەعنی لەکردن و نەکردنی کامم بە خێر زانی وا ئەکەم. کە سێ ڕۆژەکە تەواو بوو ڕەئیی لەسەر ئەوە بۆ دەرکەوت کە تێکی بداو سەرلەنوێ بینای بکاتەوە. خەڵق لەوە خۆیان پارازت کە ئەووەڵ کەسێ بۆ تێکدان بچێتە سەر بەیت بەڵاییکی لە ئاسمان بۆ نازڵ ببێ، تا پیاوێ [لە خوێ بوردو] سەرکەوت چەند بەردێکی لێ‌فڕێدایە خوارێ، کە خەڵق چاویان پێکەوت کە هیچی بۆ نەبوو ئەوانیش یەك لە دوای یەك هاتن

تێكیان دا تا گەیانیانە سەر ئەرز.

ئیبن وزوبـەیـر چەنـد كۆڵـەكـەیێكی [لـە دەور] داچەقان، پـەردەی بەسەرا دا كە نەبینرێ، تا بیناكەی بەرز بۆوە. ئیبن و زوبەیر ـ رضي الله تعالى عنه ـ فەرمووی: لە حەزرەتی عایشە ـ رضي الله تعالى عنها ـ م بیست ئەیفـەرمـوو: پێغـەمـەر ـﷺـ فەرمـووی: ئەگـەر خەڵق زەمـانی ئیسـلامـەتییـان لە كوفـریانەوە نزیك نەبوایەو، نەفەقەی ئەوەیشم نیە كە توانام ببێ كە بینای كەمەوە لە حەجەر پێنج ذیراعم ئەدایە دەم، دوو دەرگام بۆ ئەكرد: لە دەرگاییكەوە خەڵق بچنە ژوورێ، لە دەرگاییكەوە بچنە دەرێ. [ئیبن وزوبەیر ـ رضي الله تعالى عنهما ـ فەرمووی:] ئیمرۆ من قودرەتی مەصرەفیم هەیەو لە خەڵقیش ناترسم [كە لە دین وەرگەڕێن]. پێنج ذیراعی لە حەجەر لێ زیاد كرد، [هەڵیان كەند] تا بنـاغـەیێكی دەرخست خەڵق تەمـاشـایان كرد، لەسەر ئەوەوە بینایكرد، درێژی كەعبە هەژدە ذیراع بوو، ئەوەی بە كورت زانی دە گەزیشی لە درێـژیی لێ زیـاد كرد، دوو دەرگـای بۆ كرد، یەكـێكی لێی بچنـە ژوورێ، یەكـێـكـی لێـی بێنەدەرێ. كە شەهیـد كرا حەججـاج بۆ عەبدولمەلیكی كوڕی مەروانی نووسی [. . . .] خەبەری دایێ،[یەعنی بەوە كە ئەو صەحابە گەورەو عالمە كە پێغەمەر ـﷺـ كە بە دەست و تفی موبارەكی خۆی گۆشی كردبوو كوشتیو شەهیدی كرد] خەبەری بەوەیش دایێ كە ئیبن وزوبەیر ـ رضي الله تعالى عنهما ـ بینای بەیتی لەسـەر ئەسـاسـێ كردەوە كە پیـاوانی صاحیب عەداڵـەتی مەكـەیی تەماشایان كردوە [یەعنی لێیان مەعلووم بووەو شەهادەت ئەدەن كە ئەو ئەسـاسـە ـ ئەو ئەسـاسـەیـە كە ئیبـراهیم و ئیسماعیل ـ علیهما الصلاة

والســـلام ـ دایـان مەزرانـوە. . . . .] عەبـدولمـەلیـك [. . . . .] بۆی نووسییـەوە: ئێمـە هیـچ دەخلْمـان نیـە بەسـەر ئەو ئیشـە قەبیحـەوە کە ئیبن وزوبــەیـر ـ رضي الله تعـالی عنهمـا ـ کردوویـەتی. ئەوی کە لە درێژیی لێی زیادکردوە بیهێڵەرەوە، ئەمما ئەوەی کە لە حەجەر لێی زیاد کردوە بیخەرەوە سەر بینای خۆی، ئەو دەرگایەیشی کە کردوویە بگرە. حەججاج دیسان هەڵیوەشان و بردیەوە سەر حاڵی پێشووی.

**١٥/١٨٦٦ـ عبـد الله بن عبيـد بن عميـر والـوليـد بن عطاء يحدثان عن الحـرث بن عبـد الله بن أبي ربيعـة. قال عبد الله: وفد الحرث بن عبد الله على عبـد الملك بن مروان. . . . في [زمـان] خلافته [. . . .] فقال عبد الملك: ما أظن أبـا خبيب ـ يعني ابن الـزبير ـ سمع من عائشة [رضي الله تعـالى عنهمـا] ما كان يزعم أنـه سمعـه منهـا. قال الحـرث [رحمـه الله تعالى]: بلى أنا سمعته منها. قال: سمعتها تقول ماذا؟ قال: قالت: قال رسول الله ـ ﷺ ـ: إن قومك إقتصروا من بنيان البيت، ولولا حداثة عهدهم بالشـرك أعـدت ما تركـوا منـه، فإن بدا لقـومكِ من بعدي أن يبنوه فهلمِّي لأريك ما تركوا منه، فأراها قريبا من سبعة أذرع.**

**هذا حديث عبـد الله بن عبيـد وزاد عليـه الـوليـد بن عطاء: قال النبي ـ ﷺ ـ: ولجعلت لهـا بابين موضـوعين في الأرض شرقيـا وغـربيـا. وهـل تدرين لِمَ كان قومـكِ رفعـوا بابهـا؟ قالت: قلت: لا. قال: تعـززا أن لا يدخلها إلا من أرادوا، فكان الرجل إذا هو أراد أن يدخلها يدعونه يرتقي، حتى إذا كاد أن يدخـل دفعـوه فسقـط! قال عبـد الملك للحـرث: أنت سمعتهـا تقـول هذا؟ قال: نعم. قال: فنكت ساعـة بعصـاه، ثم قال: وددت أني تركته وما تحمَّل. م ـ ٦/٢٢.**

تەرجەمە:

عەبدوڵڵای کوڕی عوبەید ـ رحمە اللە ـ ئەفەرموێ: حەرثی کوڕی عەبدوڵڵا ـ رحمە اللە ـ تەشریفی چوە لای عەبدولمەلیك لە زەمانی قەراڵێتیا. عەبدولمەلیك وتی: ظەنم نیە کە =باوکی خوبەیب کە عەبدوڵڵای کوڕی زوبەیرە ئەوەی کە گومانی وایە لە عایشەی بیستوە= لە حەزرەتی عایشە ـ رضي اللە تعالی عنها ـ ی بیستبێ. حەرث فەرمووی: بەڵێ منیش لێم بیستوە. (وتی): چیت لێ بیستوە؟ فەرمووی: لێم بیست ئەیفەرموو: پێغەمەر ـﷺـ فەرمووی: قەومەکەت لە بینای بەیتیان کەم کردۆتەوە. ئەگەر قەومەکەت بە زەمانی شیرك نزیك نەبوونایە ئەوی کە لێیان تەرك کردوە ئەمخستەوە سەر بەیت. ئەگەر قەومەکەت لە دوای من تەمایان بێ کە بیکەنەوە وەرە ئەوەت پێ نیشان =دەم= کە تەرکیان کردوە. نزیك بە حەوت گەزی پێ نیشان دا.

وەلید لە عەبدوڵڵا ئەوەی لێ زیادکردوە کە پێغەمەر ـﷺـ فەرمووی: دوو دەرگام بۆ ئەکرد لە ئەرزا: یەکێکی مەشریقیی، یەکێکی مەغریبیی. ئەزانی بۆچ قەومەکەت دەرگاکەیان بەرزکردۆتەوە؟ ئەفەرموێ: عەرزم کرد: خەیر. فەرمووی: لەبەر ئەوە بەرزیان کردۆتەوە کە نەیێڵن غەیری ئەوەی کە هەوەسیان بێنێ بچێتە ناوی. وابوون کە کەسێ حەز نەکەن بچێتە ناوی و ئیرادەی کرد کە بچێتە ناوی وازی لێ یێنن تا سەرەکەوێ، کە نزیکی ئەمە بوو بچێتە ناوی پاڵێکیان پێوە ئەناو ئەکەوتە خوارێ. عەبدولمەلیك (وتی): تۆ ئەمەت لە عایشە ـ رضي اللە تعالی عنها ـ بیستوە کە فەرموویەتی؟ حەرث ئەفەرموێ: وتم: ئا. عەبدولمەلیك بە قەد ساعەتێ عەصاکەی لە ئەرزەوە ژەن و

وتی: حەزم ئەکرد وازم لێ بێنایە.

لە ریوایەتێکی ترا: عەبدولمەلیك لە طەوافا دەرحەق ئیبن وزوبەیر ناماقوولییەکی زیاد ئەکا، حەرث پێی ئەڵێ: وا مەڵێ من لە حەزرەتی عایشەم بیستوە ـ رضي الله تعالى عنها ـ کە وای ئەفەرموو. ئەو وەختە عەبدولمەلیك ئەڵێ: لە پێش ئەمەدا کە تێکم دا ئەم حەدیثەم ببیستایە تەرکم ئەکرد لە سەر بینای ئیبن و زوبەیر ـ رضي الله تعالى عنه ـ. م ـ ٦/٢٤.

**١٦/١٨٦٧ـ عن عمرو بن دينار وعبيد الله بن أبي يزيد ـ رحمهما الله تعالى ـ قالا: لم يكن على عهد النبي ـﷺـ حول البيت حائط. كانوا يصلون حول البيت حتى كان عمــر [رضي الله تعـالى عنـه] فبنى حولـه حائطا. قال عبيد الله: جَدْره [أي: جداره] قصير، فبناه ابن الزبير [ـ رضي الله تعالى عنهما ـ مرتفعا]. ح ـ ٦/١٦٧. مرسل، أو منقطع. إلا آخره فموصول.**

**تەرجەمە:**

عەمری بنی دینارو عوبەیدوڵلای کوری ئەبو یەزید ـ رحمهما الله ـ ئەفـەرمـوون: لە زەمـانی پێغـەمـەرا ـﷺـ لە دەورەی بەیتا دیوار نەبوو، خەڵق لە دەوری بەیتا نوێژ یان ئەکرد، تا زەمانی ئیمامی عومەر ـ رضي الله تعالى عنه ـ ئەو بە دەوریا دیواری کرد. یەعنی حەوشەی بۆ کرد. عوبـەیـدوڵـلا ئەفـەرموێ: دیوارەکەی نزم بوو ئیبن وزوبەیر ـ رضي الله تعالى عنهما ـ بەرزی کردەوە.

## مەسجیدی نەبەویی - علیه الصلاة والسلام -

أصل بنائه مر في حديث الهجرة.[1]

١٨٦٨/١٧- عبد الله بن عمر [رضي الله تعالى عنهما] أخبر أن المسجد كان على عهد رسول الله -ﷺ- مبنيا باللبن وسقفه الجريد، وعمده خشب النخل. فلم يزد أبو بكر [رضي الله تعالى عنه] شيئا. وزاد فيه عمر [رضي الله تعالى عنه] وبناه على بنيانه في عهد رسول الله -ﷺ- باللبن والجريد، وأعاد عُمُده خشبا. ثم غيره عثمان [رضي الله تعالى عنه] فزاد فيه زيادة كثيرة، وبنى جداره بالحجارة المنقوشة والقَصّة [الجص]، وجعل عمده من حجارة منقوشة، وسقَفَه بالساج. ح - ١/ ٤٣٠. د.

تەرجەمە:

عەبدوڵڵای کوڕی عومەر - رضي الله تعالى عنهما - ئەفەرموێ: مەسجیدی نەبەویی لە عەهدی پێغەمەرا -ﷺ- بە خشتی کاڵ بینا کرابوو، سەقفەکەی لقی دارخورما بوو، کۆڵەکەکانی دارخورما بوو. ئەبوبەکر - رضي الله تعالى عنه - هیچی لێ زیاد نەکرد. عومەر - رضي الله تعالى عنه - [لە درێژیو پانیی لێی زیاد کرد] لەسەر بینای زەمانی پێغەمەر -ﷺ- بینای کردەوە بە خشت و بە لقە خورما، کۆڵەکەکانی رزیی بوو داری لە جێی دانایەوە. لە پاشا ئیمامی عوثمان - رضي الله تعالى عنه - گۆڕیی زۆر شتی لێ زیادکرد، دیوارەکانی بە بەردی نەقشکراوو بە گەچ دروست کرد، کۆڵەکەکانی کرد بە بەردی نەقشین، سەقفەکەی لە داری ساج - کە لە هیندەوە یێ - دروست کرد.

---

(١) بڕوانە حەدیثی (٩٢٠/٤٣) بەرگی سێیەم.

**١٨ / ١٨٦٩- عبيد الله الخولاني [ربيب أم المؤمنين ميمونة - رضي الله تعالى عنها -] أنه سمع عثمان بن عفان - رضي الله تعالى عنه - يقول عند قول الناس فيه حين بنى مسجد [النبي] الرسول -ﷺ-: إنكم أكثرتم، وإني سمعت النبي -ﷺ- يقول: من بنى مسجدا، قال بكير [أحد الرواة] حسبت أنه [أي شيخه عاصما] قال: يبتغي به وجه الله بنى الله له مثله في الجنة. ح - ١ / ٤٣٣. م - ١٠ / ٤٢٩. وعن محمود بن لبيد - أيضا -.**

**١٩ / ١٨٧٠- عن أبي هريرة - رضي الله تعالى عنه -، =عن النبي -ﷺ-= قال: لا تشد الرحال إلا إلى ثلاثة مساجد: المسجد الحرام، ومسجد الرسول -ﷺ-، ومسجد الأقصى. ح - ٢ / ٣٢٩. م - ٦/١٠٦-١١٠. د، ن.**

تەرجەمە:

ئیمامی عوثمان - رضي الله تعالى عنه - لەو وەختەدا کە مەسجیدی نەبەویی بیناکردو خەڵق زۆریان لێ وت، فەرمووی: زۆرتان وت! لە پێغەمەر -ﷺ- م بیست ئەیفەرموو: هەرکەسێ مەحض بۆ خوا مزگەوتێ دروست بکا خوا لە جەننەتا بینایێکی وای بۆ دروست ئەکا.

ئەبوهورەیرە - رضي الله تعالى عنه - ئەفەرموێ: پێغەمەر -ﷺ- فەرمووی: بۆ سێ مزگەوت نەبێ بۆ هیچ مزگەوتێ بار نابەسترێ: بۆ مەسجیدی حەرام، بۆ مەسجیدی رەسوول -ﷺ- بۆ (مسجد الأقصى).

**٢٠ / ١٨٧١- عن أبي هريرة - رضي الله تعالى عنه - أن النبي -ﷺ- قال: صلاة في مسجدي هذا خير من ألف صلاة فيما سواه إلا المسجد الحرام. ح - ٢ / ٣٣٠. م - ٦/١٠٥. د، ن، جه.**

تەرجەمە:

ئەبـوهـورەیـرە ـ رضي الله تعـالى عنـه ـ ئەفەرموێ: پێغەمەر ـ ﷺ ـ فەرمووی: نوێژێ لەم مزگەوتی منەدا بکرێ چاکترە لە هەزار نوێژ کە لە (مسجد الحرام) بەدواوە لە مزگەوتی ترا بکرێ.

**٢١/١٨٧٢ـ عن أبي سلمـة بن عبـد الـرحمن وأبي عبـد الله الأغر مولى الجهنيين، وكـان من أصحـاب أبي هريـرة [رضي الله تعـالى عنـه] أنهمـا سمعـا أبـا هريـرة ـ رضي الله تعالى عنه ـ: يقول: صلاة في مسجد رسول الله ـ ﷺ ـ أفضـل من ألف صلاة فيمـا سواه من المسـاجـد إلا المسجـد الحـرام، فإن رسـول الله ـ ﷺ ـ آخـر الأنبياء، وأن مسجده آخر المساجد. قال أبـو سلمـة وأبـو عبد الله: لم نشك أن أبا هريرة [رضي الله تعالى عنه] =كان= يقول عن حديث رسول الله ـ ﷺ ـ فمنعنا ذلك أن نستثبت أبا هريرة عن ذلـك الحـديث حتى إذا توفِّي أبو هريرة [رضي الله تعالى عنه] تذاكرنا ذلـك وتـلاومنـا أن لا نكون كلمنا أبا هريرة [رضي الله تعالى عنه] في ذلك حتى يسنده الى رسول الله ـ ﷺ ـ إن كان سمعه منه. فبينا نحن على ذلك جالسنا عبد الله بن إبراهيم بن قارظ فذكرنا ذلك الحديث والذي فرَّطنا فيه من نص أبي هريرة عنه، فقال لنا عبد الله بن إبراهيم بن قارظ: أشهد إني سمعت أبـا هريـرة ـ رضي الله تعـالى عنـه ـ يقـول: قال رسول الله ـ ﷺ ـ: فإني آخر الأنبياء، وإن مسجدي آخر المساجد. م ـ ٦/١٠٥.**

تەرجەمە:

ئەبـوسـەلـەمـەی کوڕی عەبـدوڕەحمـانی کوڕی عەوف و ئەبـو عەبدوڵلای ئەغەڕ، کە لە ئەصحابی ئەبوهورەیرەیە، ـ رضي الله تعالى عنـه ـ ئەفـەرمـوون: کە لە ئەبـوهـورەیـرە ـ رضي الله تعالى عنه ـ یان

بیست ئەیفەرموو: نوێژێ لە مزگەوتی پێغەمەرا -ﷺ- کردن ئەفضەلترە لە هەزار نوێژ کە =لە= مزگەوتی ترا بکرێ غەیری (مسجد الحرام) چونکی پێغەمەر -ﷺ- ئاخری هەموو پێغەمەرانەو مزگەوتەکەیشی ئاخری هەموو مزگەوتی پێغەمەرانە. هیچ تەرەدودمان نەبو لەمەدا کە ئەبوهورەیرە - رضي الله تعالى عنه - ئەمەی لە پێغەمەرەوە -ﷺ- ریوایەت ئەکرد لە بەر ئەوە کە وامان ئەزانی لێمان تەحقیق نەکرد کە لە پێغەمەر -ﷺ- ی بیستوە یان نا تا وەفاتی کرد. ئەو وەختە موذاکەرەی ئەو حەدیثەمان کرد یەکتریمان لەوم کرد کە بۆچ لێمان نەپرسی، ئەگەر لەوی بیستوە ئیسنادی بداتە سەر پێغەمەر -ﷺ-. لەو بەینەدا کە ئێمە سەرزەنشی یەکتریمان ئەکرد عەبدوڵڵای کوری ئیبراهیمی کوری قاریظ هاتەلامان دانیشت، ئەو حەدیثەو قوصووری خۆمان بۆ بەیان کرد، عەبدوڵڵا پێی وتین: (أشهد بالله) لە ئەبوهورەیرە - رضي الله تعالى عنه - م بیست ئەیفەرموو: پێغەمەر -ﷺ- فەرمووی: من ئاخری پێغەمەرانم، مزگەوتەکەیشم ئاخری مزگەوتانە. یەعنی مزگەوتی پێغەمەران - عليهم الصلاة والسلام -.

**٢٢/١٨٧٣- عن ابن عباس [رضي الله تعالى عنهما] قال: إن امرأة إشتكت شكوى، فقالت: إن شفاني الله [تعالى] لأخرُجنَّ فلأصلينَّ في بيت المقدس! فبرأت ثم تجهَّزت تريد الخروج: فجاءت ميمونة [رضي الله تعالى عنها] زوج النبي -ﷺ- تسلم عليها، فأخبرتها ذلك، فقالت: إجلسي فكلي ما صنعت وصلِّي في مسجد الرسول -ﷺ-؛ فإني سمعت رسول الله -ﷺ- يقول: صلاة فيه أفضل من ألف صلاة فيما سواه من المساجد إلا مسجد الكعبة. م - ١٠٨/٦.**

تەرجەمە:

ژنێ نەخۆش کەوت وتی: ئەگەر خوا شیفام بدا ئەچمە دەرێ لە (بيت المقدس)ا نوێژ ئەکەم! چا بۆوە، تەدارەکی کرد کە بڕوا، هاتە خزمەت حەزرەتی مەیموونەی حەرەمی پێغەمەر -ﷺ-، ورضي عنها - کە ماڵاوایی لێ بخوازێ، سەلامی لێ کردو خەبەری ئەوەی دایێ.
مەیموونە - رضي الله تعالى عنها - پێی فەرموو: دانیشە ئەوی کردووتە بیخۆو لە مزگەوتی پێغەمەرا -ﷺ- نوێژ بکە. من لە پێغەمەر -ﷺ-م بیست ئەیفەرموو: نوێژێ لەم مزگەوتە - مەسجیدی کەعبە نەبێ - لە هەزار نوێژ لە مزگەوتی ترا خێری زیاترە.

**١٨٧٤/٢٣- أبو سلمة بن عبد الرحمن [بن عوف - رضي الله تعالى عنه -] قال: مرَّ بي عبد الرحمن بن أبي سعيد الخدري [رضي الله تعالى عنه] قال: قلت له: كيف سمعت أباك يذكر في المسجد الذي أسِّس على التقوى؟ قال: قال لي أبي: دخلت على رسول الله -ﷺ- في بيت بعض نسائه، فقلت: يارسول الله أيُّ المسجدين الذي أسِّس على التقوى؟ قال: فأخذ كفاً من حصباء المسجد فضرب به الأرض، ثم قال: هو مسجدكم هذا لمسجد المدينة. قال: فقلت: أشهد أني سمعت أباك هكذا يذكره. م - ٦/١١١.**

تەرجەمە:

ئەبوسەلەمەی کوڕی عەبدوڕەحمانی کوڕی عەوف - رضي الله تعالى عنه - ئەفەرموێ: عەبدوڕەحمانی کوڕی ئەبوسەعیدی خدریی - رضي الله تعالى عنه -م بە لادا رابورد، پێم وت: چۆنت لە باوکت بیستوە دەرحەق ئەو مەسجیدەی کە لەسەر تەقوا بیناکراوە [کە موقابیلی

مەسجیدی ضیرارە]؟ عەبدورەحمان فەرمووی: باوکم پێی فەرمووم: چوومە خزمەت پێغەمەر ـ ﷺ ـ لە ماڵی بەعزێ ئەزواجی طاهیرات بوو. عەرزم کرد: (یارسول الله) لەو دوو مەسجیدە کامیان لەسەر تەقوا بیناکراوە؟ مستێ لە بەردە وردەی مزگەوتەکەی هەڵگرت و دای بەئەرزاو فەرمووی: ئەو مزگەوتەی کە لە سەر تەقوا بینا کراوە ئەم مزگەوتی ئێوەیە، یەعنی مەسجیدی نەبەویی مەدینە. ئەبو سەلەمە ئەفەرموێ: شەهادەت ئەدەم کە منیش وام لە باوکت بیستوە کە ئەیفەرموو.

**٢٤/١٨٧٥ـ عن أبي ذر [رضي الله تعالى عنه] قال: قلت: يا رسول الله أيُّ مسجد وضع في الأرض أوَّلَ؟ قال: المسجد الحرام. قلت: ثم أيٌّ؟ قال: المسجد الأقصى. قلت: كمْ بينهما؟ قال: أربعون سنة. وأينما أدركك الصلاة فصلِّ فهو مسجد.** ح ـ ٣٥٤/٥. ن، جه. م ـ ١٧٤/٣.

**تەرجەمە:**

ئەبوذەڕ ـ رضي الله تعالى عنه ـ ئەفەرموێ: عەرزی پێغەمەر ـ ﷺ ـ م کرد: لە ئەرزا چە مزگەوتێ لە پێش مزگەوتانا دروست کراوە؟ فەرمووی: (مسجد الحرام). عەرزم کرد: لە دوای ئەو؟ فەرمووی: (مسجد الأقصى). عەرزم کرد: بەینیان چەندە؟ فەرمووی: چل ساڵ. لە هەر جێیێ نوێژت لێ بوو لەوێدا نوێژ بکە ئەوە مزگەوتە.

مەقبەرە، سەرەنگوێلك، قەصابخانە، مۆڵگەی وشتر، سەرەڕێ، حەمام، ئەدەبخانە.. موستەئنان، لەو جێگەیانەدا نوێژکردن مەکرووهە.

حەزرەتی ئیبراهیم ـ علیە الصلاة والسلام ـ (مسجد الحرام)ی بینا

نەکردوە. لە ئەوەڵەوە حەزرەتی ئادەم - عليه الصلاة والسلام - بینای کردوە، حەزرەتی ئیبراهیم - عليه الصلاة والسلام - تەجدیدی کردوّتەوە. حەزرەتی سولەیمانیش - عليه الصلاة والسلام - لە ئەوەڵەوە بینای (مسجد الأقصى)ی نەکردوە. حەزرەتی ئادەم - عليه الصلاة والسلام - کە (مسجد الحرام)ی دروست کرد لە دوای چل ساڵ خوا ئەمری پێکرد بچێ (مسجد الأقصى) بینا بکا، موورادی پێغەمەر -ﷺ- ئەمەیە. گینا بەینی ئیبراهیم و سولەیمان - عليهما الصلاة والسلام - گەلێ زیاترە لە چل ساڵ.

**٢٥/١٨٧٦- عن أنس - رضي الله تعالى عنه - قال: قال عمر - رضي الله تعالى عنه -:وافقت ربي في ثلاث: قلت: يارسول الله لواتخذنا من مقام إبراهيم مصلى. فنزلت: ﴿واتخذوا من مقام إبراهيم مصلى﴾[1] وآية الحجاب قلت: يارسول الله لو أمرت نساءك أن يحتجبن؛ فإنه يكلمهن البَرُّ والفاجر. فنزلت آية الحجاب[2] واجتمع نساء النبي -ﷺ- في الغيرة عليه، فقلت لهن :﴿عسى ربه إن طلقكن أن يبدله أزواجا خيرا منكن.﴾فنزلت هذه الآية.[3] ح - ٤٠٨/١. رەنگە لە فەضائیلا نووسیبێتم.[4]**

**تەرجەمە:**

ئەنەس - رضي الله تعالى عنه - ئەفەرموێ: ئیمامی عومەر - رضي

(١) البقرة /١٢٥.

(٢) مەبەست ئایەتی: ﴿يا أيها النبي قل لازواجك...﴾یە. الأحزاب/٥٩.

(٣) التحريم/٥.

(٤) نەخەیر نەنووسراوە.

الله تعالى عنه ـ فەرمووی: لە سێ شتا موافەقەی خوا ـ عزوجل ـ م کردوە: عەرزی پێغەمەرم کرد ـﷺـ: (یارسول الله) ئەگەر لەو جێگەیەدا کە حەزرەتی ئیبراهیم ـ علیه الصلاة والسلام ـ کە بینای بەیتی ئەکرد لێی راوەستابوو جێێکمان بکردایە بۆ ئەمە کە لێی رابوەستی لە نوێژا. یەعنی باشە بوو. ئەم ئایەتە نازڵ =بوو=: لە شوێن راوەستانی ئیبراهیم جێ‌نوێژێ تەعیین بکەن بۆ لێ‌راوەستان.

دوەم: ئایـەتی حیجـاب؛ عەرزم کرد: (یـارسـول الله) ئەگـەر حەرەمـەکـانت ئەمـرت پێ بفـەرمـوونـایێ کە خۆیان لە خەڵق داپۆشن خراپ نەئـەبـو؛ چونکی چاك و خراپ قسـەیـان لەگەڵ ئەکەن. ئایەتی حیجاب نازڵ بوو.

حەرەمەکانی پێغەمەر ـﷺـ کۆبوونەوە غیرەتیان لەسەر پێغەمەر ـﷺـ ئەکێشا، ئەذیەتی رۆحیان ئەدا، پێم وتن: ئەگەر ئێوە تەلاق بدا ئومێد وایە کە خوا ـ عزوجل ـ لە باتی ئێوە ژنی لە ئێوە چاتری پێ عەطا بفەرمووێ. ئەو ئایەتە کە دائیرە بەوە نازڵ بوو.

موافەقەی حەزرەتی عومەر ـ رضي الله تعالى عنه ـ مونحەصیر نیە لەمانەدا. ئەسارای بەدر،[1] نوێژنەکردن لەسەر مونافیقان، حەرامکردنی

(١) ئەمانەی دانەر ئیشارەی بۆ کردن هەر یەکێکیان رووداوێکی دیاریی‌و مێژوویی‌و باوو بە ناوبانگە.

ئەسارای بەدر: دیلەکانی بەدر. پێغەمەر دەربارەی ئەو دیلانە لە یارانی پرسی کە چییان لێ بکەن. ئەبوبەکر فەرمووی: پارەو ماڵیان لە باتی وەربگرن و ئازادیان بکەن، عومەر فەرمووی: گشتیان بکوژرێن. لەسەر راکەی عومەر ئایەتی ﴿ما كان لنبي أن يكون له أسرى حتى يثخن في الأرض....﴾ هاتە خوارەوە. ⟵

شەراب... (والحاصل) تا گەییوە بە پانزە.

ئیجتیهادو ڕەئی عومەر هەمووی - وە یا (أكثر)ی - صەوابە، زۆر دوورە لە خەطاوە. (محدث)و[1] ئیلهامکراوی ئەم ئوممەتەیە رووی دوشمنەکانی ڕەش بێ!

**٢٦/١٨٧٧- أبو هريرة [رضي الله تعالى عنه] قال: قال رسول الله -ﷺ-: من سمع رجلا ينشد ضالّةً في المسجد فليقل: لا ردَّها الله عليك! فإن المساجد لم تبن لهذا. م - ٣/٢٣٦.**

**تەرجەمە:**

ئەبوهورەیرە - رضي الله تعالى عنه - ئەفەرموێ: پێغەمەر -ﷺ- فەرمووی: هەرکەسێ گوێی لە کەسێ بوو کە لە مزگەوتا بانگی ئەکردە خەڵق کە: کێ ئەوەی دۆزیوەتەوە بمداتەوە، یەعنی لە مزگەوتا جاڕی ئەدا بۆ شتی ون بوو پێی بڵێ: خوا نەتداتەوە؛ چونکی مزگەوت بۆ ئەمە دروست نەکراوە.

**٢٧/١٨٧٨- عن بريدة [رضي الله تعالى عنه] أن رجلا نشد في المسجد؛ فقال: من دعا إلى الجمل الأحمر. فقال النبي -ﷺ-: لا وجدت! إنما بنيت المساجد لما بنيت له. م - ٣/٢٣٦.**

**تەرجەمە:**

بورەیدە - رضي الله تعالى عنه - ئەفەرموێ: پیاوێ لە مزگەوتا

---

عومەر - خ - داوای لە پێغەمەر دەکرد نوێژ لەسەر مونافیق و دووڕووەکان نەکات ئایەتی: ﴿ولا تصل على أحد منهم مات أبدا ولا تقم على قبره...﴾ هاتە خوارەوە.

حەزرەتی عومەر - خ - هەر ئەیفەرموو: (اللهم بين لنا في الخمر بيانا شافيا)تا ئایەتی ﴿إنما الخمر والميسر والأنصاب...﴾هاتە خوارەوە.

(١) ئەم قسەیش ئیشارەیە بۆ حەدیثی (٩٣٧/٦٠)ی بەرگی سێیەمی ئەم کتێبە.

جاری دا وتی: کێ دەعوەتم =بۆ= ئەکا[1] بۆ وشتری سوور؟ پێغەمەر ـ ﷺ ـ فەرمووی: قەت نەیدۆزییەوە! مزگەوتان هەر بۆ ئەوە دروست کراون کە بۆی دروست کراون. یەعنی بۆ ذیکرو عیبادەت دروست کراون شتی تری نابێ تیا بکرێ.

تەعلیمی عیلم و موذاکەرەی ئوموری خەیرییە دروستە. ئیشی دنیایی کە بۆ مەنفەعەتی ئەشخاص بێ مەکرووهە. بۆ مەنافیعی عامە دروستە. بەیع و شیراو صەنعەتیش وایە.

**٢٨ / ١٨٧٩ـ عن أبي حميد وأبي أسيد ـ رضي الله تعالى عنهما ـ قال: قال رسول الله ـ ﷺ ـ: إذا دخل أحدكم المسجد فليقل: أللهم افتح لي أبواب رحمتك، وإذا خرج فليقل: أللهم إني أسألك من فضلك. م ـ ٣/٤٢٢.**

**تەرجەمە:**

پێغەمەر ـ ﷺ ـ فەرمووی: هەرکەسێ لە ئێوە بچێتە مزگەوت بڵێ: خوایا هەموو دەرگای رەحمەتم لێبکەیتەوە. کە هاتەدەرێ بڵێ: خوایا لە فەضلی تۆم ئەوێ.

**٢٩ / ١٨٨٠ـ عن أبي هريرة [رضي الله تعالى عنه] عن النبي ـ ﷺ ـ قال: صلاة [الرجل في الجماعة تضعف. أخرى. خ] الجميع تزيد على صلاته في بيته وصلاته في سوقه خمسا وعشرين درجة؛ فإن أحدكم إذا توضأ فأحسن، وأتى المسجد لا يريد إلا الصلاة [أو ما في معناها كالإعتكاف] لم يَخْطُ خَطْوة إلا رفعه الله بها درجة وحط عنه خطيئة حتى يدخل المسجد، وإذا دخل المسجد كان في صلاة، ما**

(١) واتە: کێ بانگەوازم بۆ ئەکا بۆ دۆزینەوەی وشتری...

كانت تحبسه، وتصلي ـ يعني عليه ـ الملائكة ما دام في مجلسه الذي يصلي فيه: أللهم اغفر له، اللهم ارحمه! مالم[يؤذ الملائكة] يُحْدِثْ ح ـ ١/٤٤٨. م ـ ٣/ ٣٧٠. ح ـ ٤/٢٥ في الجماعة بفرق يسير لفظا. د، ت، جه.

تەرجەمە:

ئەبـوهـورەیـرە ـ رضي الله تعـالی عنـە ـ ئەفەرموێ: پێغەمەر ـﷺـ فەرمووی: نوێژی جەماعەت فەضلی هەیە بە بیست و پێنج دەرەجە بە سەر نوێژكردنیا لەماڵەوەو، لە ناو دووكانیا؛ چونكی یەكێ لە ئێوە كە دەزنـوێـژێكی جوانی شت و هاتـەمـزگەوت و غەیری نوێژ ئیرادەی هیچ شتـێـكـی تری نەبـێ.. هیــچ هەنگــاوێ نانێ كە خوا بەو هەنگــاوە دەرەجـەیێكی بەرز نەكـاتـەوەو گونـاهێكی هەڵـنـەوەرێنێ، تا ئەچێتـە ناو مزگەوتەكەوە، كە چوە ناو مزگەوتەوە ئەو موددەیەی كە نوێژ حەبسی ئەكا هەر لە نوێژایەو مەلائیكە صەلاواتی لەسەر ئەدا تا لەو جێگەیەدا بێ كە نوێژی لێ ئەكا. ئەڵێن: خوایە لێی خۆش بە! خوایە رەحمی پێ‌بكە! بەو شەرتە ئەذیەتی مەلائیكە نەداو بێ‌دەزنوێژ نەبێ.

لە ریوایەتێكی ترا ئەفەرموێ: تا لە نوێژەكەی سەلام ئەداتەوە، یا تا دەزنــوێــژەكـەی ئەشكێ. راویی ئەڵێ: وتم: دەزنـوێـژشكـان چیـە؟ فەرمووی: بای بێ‌دەنگ یا دەنگار.

٣٠/١٨٨١ـ وعنـه قال: قال رسـول الله ـﷺـ من تطهـر في بيتـه، ثم مشى إلى بيت من بيوت الله ليقضي فريضة من فرائض الله... كانت خطواته إحداها تحط خطيئة، والأخرى ترفع درجة. م ـ ٣/٣٧٤.

**تەرجەمە:**

پێغەمەر -ﷺ- فەرمووی: هەرکەسێ لەماڵەوە دەزنوێژ بشوا، لە پاشا بچێ بۆ ماڵێ لە ماڵانی خوا بۆ خاتری =ئەوە= فەرزێ لە فەرزی خوا بەجێ بێنێ. هەنگاوەکانی: یەکێکی گوناهێکی هەڵەوەرێنێ، هەنگاوەکەی تری دەرەجەیێکی پێ بەرزەبێتەوە.

**١٨٨٢/٣١ـ قزعة ـ أبو سعيد الخدري ـ رضي الله عنه ـ يحدث بأربع عن النبي -ﷺ- فأعجبنني وأنقنني [أفرحنني] قال: لا تسافر المرأة يومين إلا معها زوجها أو ذو محرم. ولا صوم في يومين: الفطر،والأضحى. ولا صلاة بعد صلاتين: بعد الصبح حتى تطلع الشمس، وبعد العصر حتى تغرب. ولا تشد الرحال إلا إلى ثلاثة مساجد: مسجد الحرام، ومسجد الآقصى، ومسجدي. ح ـ ٢/٣٣٣. م ـ ٦/٣٦. وفيه [قال قزعة]: فقلت له: أنت سمعت هذا من رسول الله -ﷺ-؟ قال: فأقول على رسول الله -ﷺ- مالم أسمع؟ والباقي مثله بتقديم وتأخير بعض. ح ـ ٣/٤٠٦**

**تەرجەمە:**

(قزعة) ـ رحمه الله تعالى ـ ئەفەرموێ: ئەبوسەعیدی خدریی ـ رضي الله تعالى عنه ـ چوار شتی لە پێغەمەرەوە -ﷺ- ریوایەت کرد خستمیە تەعەجوبەوە، مەسروووریان کردم:

١ ـ پێغەمەر -ﷺ- فەرمووی: هیچ ژنێ بێ ئەمە مێردی یا مەحرەمێکی لەگەڵ بێ سەفەرێکی دوورو درێژ نەکا.

٢ ـ لە دوو رۆژا رۆژووگرتن نیە: رۆژی فیطرو، رۆژی قوربان.

٣ ـ لە دوای دوو نوێژ ـ نوێژکردن نیە: دوای نوێژی صبحەینێ تا

هەتاو ئەکەوێ. دوای عەصر تا رۆژاوا.

٤ ـ بۆ سێ مزگەوت نەبێ بار نابەسترێ: بۆ (مسجد الحرام). بۆ (مسجد الأقصى) بۆ ئەم مزگەوتەی من.

قەزعە ئەفەرموێ: لە ئەبوسەعیدم پرسیی: تۆ ئەمەت لە پێغەمەر ـ ﷺ ـ بیست؟ فەرمووی: ئەی من بە دەم پێغەمەرەوە ـ ﷺ ـ شتێك ئەڵێم کە لێم نەبیستبێ؟!

**١٨٨٣/٣٢ـ عن أبي بن كعب [رضي الله تعالى عنه] قال: كان رجل من الأنصار بيته أقصى بيت في المدينة، فكان لا تخطئه الصلاة مع رسول الله ـ ﷺ ـ قال: فتوجعنا له، فقلت له: يافلان لو أنك اشتريت حمارا يقيك من [الظلماء. أخرى] الرمضاء ويقيك من هوام الأرض. قال: أم والله ما أحب أن بيتي مطنب ببيت محمد ـ ﷺ ـ قال: فحملت به حملا، حتى أتيت نبي الله ـ ﷺ ـ فأخبرته. قال: فدعاه فقال له مثل ذلك، وذكر له أنه يرجو في أثره الأجر، فقال له النبي ـ ﷺ ـ: إن لك ما احتسبت. وفي أخرى مثله: قد جمع الله لك ذلك كله. م ـ ٣٧٢/٣.**

**تەرجەمە:**

ئوبەییی کوری کەعب ـ رضي الله تعالى عنه ـ ئەفەرموێ: پیاوێ بو لە ئەنصار ماڵی لە هەموو ماڵی مەدینە دوورتر بوو، هیچ نوێژێ نەبوو کە لە خزمەت پێغەمەرا ـ ﷺ ـ نەیکا. بەزەییم پیاهات، پێم وت: ئەی فلان ئەگەر گوێدرێژێکت بکریایە لە لمی گەرم و، تاریکیی شەوو، مارو مێرووی ئەرز موحافەظەت بکا [خراپ نابێ] وتی: سا وەڵڵا حەز ناکەم کە خانوەکەم شەتەك بدرابوویا بە خانووی پێغەمەرەوە ـ ﷺ ـ ئەو جوابەی بوو بە بارێکی قورس بە سەرمەوە تا هاتمە خزمەت

پێغەمەر -ﷺ- عەرزم کرد. بانگی کردو لێی پرسی چ جوابی منی دایەوە بە پێغەمەریش -ﷺ- جوابێکی وای دایەوەو عەرزیشی کرد کە بە شوێن پێی [کە بێ بۆ مەسجید بۆ جەماعەت] ئومێدی ئەجری هەیە. پێغەمەر -ﷺ- فەرمووی: ئەو ئومێدەی کە بووتە بۆت هەیە. لە ریوایەتەکەی ترا: خوا ئەوانەی هەموو بۆ کۆکردوویتەوە.

**١٨٨٤/٣٣ـ عن جابر ـ رضي الله تعالى عنه ـ قال: كانت ديارنا نائية [بعيدة] عن المسجد فأردنا أن نبيع بيوتنا فنقترب من المسجد، فنهانا رسول الله -ﷺ- فقال: إن لكم بكل خطوة درجة. م ـ ٣٧٣/٣.**

**١٨٨٥/٣٤ـ جابر [رضي الله تعالى عنه] قال: خلت البقاع حول المسجد فأراد بنو سلمة أن ينتقلوا قرب المسجد، فبلغ ذلك رسولَ الله -ﷺ- فقال لهم: إنه بلغني أنكم تريدون أن تنتقلوا قرب المسجد؟ قالوا: نعم يارسول الله قد أردنا ذلك. فقال: يا بني سلمة دياركم تكتبُ آثاركم. دياركم تكتبُ آثاركم. م ـ ٣٧٣/٣.**

**تەرجەمە:**

جابیر ـ رضي الله تعالى عنه ـ ئەفەرموێ: ماڵەکانمان دوور بوو لە مزگەوتی نەبەویەوە، ئیرادەمان کرد کە خانوەکانمان بفرۆشین و بێینە نزیکی مزگەوتەوە. پێغەمەر -ﷺ- نەهی لێ کردین؛ فەرمووی: بە کوللی هەنگاوێك دەرەجەیێکتان بۆ هەیە.

لە ریوایەتی دوەما ئەفەرموێ: دەورو پشتی مەسجیدی نەبەویی چۆڵ بوو، بەنوسەلەمە ئیرادەیان بوو کە نەقڵ بکەن بۆ نزیکی مەسجید، ئەوە گەییەوە بە پێغەمەر -ﷺ- پێی فەرموون: وام پێ گەییوەتەوە کە تەماتانە بێنە نزیك مزگەوتەوە؟ عەرزیان کرد: بەڵێ

(یارسول الله) وامان تەمایە. فەرمووی: ئەی بەنوسەلەمە لە جێی خۆتان بمێننـەوە هەنگـاوەکـانتـان بۆ ئەنـووسـرێ. . لە جێی خۆتـان بمێننـەوە هەنگاوەکانتان بۆ ئەنووسرێ.

**١٨٨٦/٣٥ ـ عن حذيفـة [رضي الله تعـالى عنـه] قال: قال رسـول الله ﷺ: فُضِّلنـا على النـاس بثـلاث: جعلت صفـوفنا كصفوف الملائكة. وجعلت لنا الارض كلها مسجدا. وجعلت تربتها لنا طهورا إن لم نجد الماء. وذكر خصلة أخرى. م ـ ٣٧٥/٣[١].**

**تەرجەمە:**

پێغـەمـەر ـﷺـ فەرمـووی: بە سێ شت تەفضیـل دراوین بە سەر خەڵقا: صەفی ئێمە ئاوتای صەفی مەلائیکە کراوە. هەموو ئەرزمان بۆ کراوە بە مزگـەوت. گڵی ئەرزمـان بۆ کراوە بە پاك و پاکـەوەکـەر. خەصلەتێکی تریشی فەرموو. یەعنی لەبیرم چوەتەوە.

**١٨٨٧/٣٦ـ عن أبي هريـرة [رضي الله تعـالى عنـه] عن النبي ـﷺـ قال: من غدا الى المسجد أو راح أعد الله له في الجنة نزلا كلما غدا أو راح. م ـ ٣٧٥/٣.**

**تەرجەمە:**

پێغـەمـەر ـﷺـ فەرمـووی: هەرکـەسێ سبـەینێ و ئێـوارێ بچێ بۆ مزگەوت. خوای تەعالا لە بەهەشتا هەموو سبەینێ و ئێوارێ ضیافەتێکی بۆ حازر ئەکا.

**١٨٨٨/٣٧ـ وعنـه أن رسـول الله ـﷺـ قال: أحب البـلاد [الإضافة ظرفية] إلى الله ـ تعالى ـ مساجدها. وأبغض البلاد =الى الله= أسواقها.**

(١) ئەم حەدیثەم لەو شوێنە دیاریکراوەدا نەدۆزیەوە.

**تەرجەمە:**

پێغـەمـەر ـﷺـ فەرمـووی: لای خوای تەعـالا خۆشەویسترینی ئەو مەکـانـانـەی کە لە ناو شاران مزگـەوتی ئەو شارانـەیـە؛ [چـونکی جێی ذیکرە] لای خوای تەعالا مەبغووضترینی ئەو جێیانەی کە لە ناو شارانن بازاڕی ئەو شارانەیە [چونکی جێی ترازوو حیلەبازی‌یە].

**١٨٨٩/٣٨ـ عن جابـر [رضي الله تعـالى عنـه] أن رجلا مر في المسجد بأسهم قد أبـدى نصـولُهـا، فأمر أن يأخذ بنصولها لا يخدش مسلما. وفي أخرى: فقال له رسول الله ـﷺـ: أمسك بنصالها كي لا تخدش مسلما.[1] خ ـ ١٠/ ١٧٠. م ـ ١٠/ ٥٦. ن، د، جه. وجوه بعض. م ـ ١٠/ ٥٢. وعن أبي موسى نحوه. وفيه: فقال أبو موسى ـ عليه الرضوان ـ: والله مامتنا حتى سددناها بعضنا في وجوه بعض. م ـ ١٠/ ٥٢.**

**تەرجەمە:**

جابیر ـ رضي الله تعالى عنه ـ ئەفەرموێ: پیاوێ بە مزگەوتا رابورد تیری پێبوو نووکی دەرخستبوون. پێغەمەر ـﷺـ ئەمری پێکرد: نووکی پەیکانەکان بگرە نەکو موسوڵمانێ بریندار بکا. ئەبومووسا ئەفەرموێ: وەڵڵاهی نەمردین تا ئەو تیرەمان گرتە رووی یەکتری.

**١٨٩٠/٣٩ـ عن أبي قتادة [رضي الله تعالى عنه] أن رسول الله ـﷺـ قال: إذا دخل أحدكم المسجد فليركع ركعتين قبل أن يجلس. ح ـ ١/ ٤٢٩. م ـ ٣/ ٤٢٣. د، ت، ن.**

---

(١) لە بوخاریدا لە دوای ریوایەتی: (أمسك بنصالها)وە (كي لا تخدش مسلما)نیە. تەنها (قال: نعم) هەیە.

تەرجەمە :

پێغەمەر ـﷺـ فەرمووی: کە یەکێکتان چوە مزگەوت لە پێش ئەمەدا دابنیشێ دوو رکات نوێژ بکا.

**٤٠/١٨٩١ـ عن جابر ـ رضي الله تعالى عنه ـ قال: كان لي على النبي ـﷺـ دين فقضاني وزاد لي. ودخلت عليه في المسجد، فقال لي: صل ركعتين. م ـ ٣/٤٢٤.**

تەرجەمە :

جابیر ـ رضي الله تعالى عنه ـ ئەفەرموێ: قەرزێکم بوو بە سەر پێغەمەرەوە ـﷺـ تەشریفی لە مزگەوتا بوو[1] [کە چوومە خذمەتی بۆ قەرزەکە] قەرزەکەی دامەوە بۆیشی زیادکردم. ئەمری پێ فەرمووم دوو رکات نوێژ بکەم. ئەم حەدیثە لە جیهادا بە موفەصەلی رابورد.

**٤١/١٨٩٢ـ عن سماك بن حرب قال: قلت لجابر بن سمُرة [رضي الله تعالى عنهما]: أكنت تجالس رسول الله ـﷺـ؟ قال: نعم، كثيرا كان لا يقوم من مصلاه الذي يصلي فيه الصبح أو الغداة حتى تطلع الشمس، فإذا طلعت الشمس قام. وكانوا يتحدثون، فيأخذون في أمر الجاهلية، فيضحكون، ويبتسم. ح ـ ٦/٣١٨.[1]**

---

(١) بە گوێرەی حەدیثەکە وا دیار نیە کە قەرزەکەی لە مزگەوتدا دابێتەوە، بەڵکو تەرجەمەی حەدیثەکە ئاوایە: فەرمووی: قەرزێکم بەسەر پێغەمەرەوە ـﷺـ بوو بە زیادەوە قەرزەکەی دامەوە. وە چوومە خذمەتی لە مزگەوتا فەرمووی: دوو رکات نوێژ بکە.

(١) ئەم حەدیثە وەك دانەر ـ خ ـ دیاریی کردوە لە (ح ـ ٦)دا نیەو، گەڕام لە (م ـ ٣/٣٧٥)دا دۆزیمەوە.

تەرجەمە:

سەمماکی بنی حەرب ئەفەرموێ: لە جابیری کوڕی سەمورە ـ رضي الله تعالى عنهما ـ م پرسی: هیچ لە خزمەت پێغەمەر ـ ﷺ ـ دا دائەنیشتی؟ فەرمووی: بەڵێ زۆر. پێغەمەر ـ ﷺ ـ لە دوای نوێژی سبەینێ تەشریفی تا رۆژ هەڵەهات لەو جێی کە نوێژی تیاکردبوو دائەنیشت، کە رۆژ هەڵەهات تەشریفی هەڵەستا، ئەوان قسەیان لە ئیشی جاهیلییەت ئەکردو پێئەکەنین. پێغەمەر ـ ﷺ ـ تەبەسومی ئەکرد.

**١٨٩٣/٤٢ـ عن سلمة وهو ابن الأكوع ـ رضي الله تعالى عنه ـ أنه كان يتحرى موضع مكان المصحف يسبح فيه، وذكر أن رسول الله ـ ﷺ ـ كان يتحرى ذلك المكان، وكان بين المنبر والقبلة ممر الشاة م ـ ١٦٣/٣.**

تەرجەمە:

سەلەمەی کوڕی ئەکوەع ـ رضي الله تعالى عنه ـ [لە مزگەوتا بە دەوام] بۆ ئەو جێگەیە ئەگەڕا کە موصحەفی عوثمانیان لێ دانابوو لەوێدا نوێژی ئەکردو ئەیفەرموو: پێغەمەر ـ ﷺ ـ بۆ ئەو جێیە ئەگەڕا کە نوێژی لێ بکا. لە بەینی مینبەرو قیبلە ئەوەندەی مەڕێکی پیاڕابووریٚ مەیدان بوو.

موصحەفی ئیمامی عوثمان دیارە کە لە دوای پێغەمەر بوو ـ ﷺ ـ پێغەمەر ـ ﷺ ـ وا نەبوە کە تەحەڕری جێی موصحەفەکە بکا. یەعنی لەو جێگەیا نوێژی کردوە کە لە دواییا موصحەفەکەیان لێ داناوە.

١٨٩٤/٤٣ـ یەزیدی بنی ئەبی عوبەید ـ رحمه الله تعالى ـ ئەفەرموێ: ئەچوومە خزمەت سەلەمەی کوڕی ئەکوەع ـ رضي الله

تعالى عنه - نوێژی له لای ئەو كۆڵەكەوە ئەكرد كە موصحەفیان لێ دانا بوو. لێم پرسیی: ئەی ئەبوموسلیم وات ئەبینم كە هەر نوێژ لە لای ئەم كۆڵەكەوە ئەكەی! فەرمووی: پێغەمەر -ﷺ- م دی هەر نوێژی لای ئەو كۆڵەكەوە ئەكرد. ح - ٤٥٧.

ئەم ریوایەتە لە ریوایەتەكەی موسلیم واضیحترە.

**٤٤/١٨٩٥- قال عمر [رضي الله تعالى عنه]: المصلون أحق بالسواري من المتحدثين إليها. ورأى عمر - رضي الله تعالى عنه - رجلا يصلي بين اسطوانتين، فأدناه إلى سارية، فقال: صل إليها. ح - ١/٤٥٧. وصله ابن أبي شيبة.**

**تەرجەمە:**

ئیمامی عومەر - رضي الله تعالى عنه - فەرمووی: ئەوانەی نوێژ ئەكەن موستەحەقترن لە خەڵقی تر بە كۆڵەكەكان لەوانەی كە قسەی لە لاوە ئەكەن. یەكێكی دی لە بەینی دوو كۆڵەكەدا نوێژی ئەكرد، لە كۆڵەكەكەی نزیك خستەوە پێی فەرموو: روو بكەرە ئەوێ نوێژ بكە.[1]

**٤٥/١٨٩٦- عبد الله بن عمر - رضي الله تعالى عنهما - كان ينام وهو شاب أعزب لا أهل له في مسجد رسول الله -ﷺ- =ح - ١/٤٢٦=.**

**تەرجەمە:**

عەبدوڵڵای كوری ئیمامی عومەر - رضي الله تعالى عنهما - لەو وەختەدا كە عازەب بوو ماڵ و مناڵی نەبوو لە مزگەوتی پێغەمەرا -ﷺ- ئەنوست.

**٤٦/١٨٩٧- عن عائشة - رضي الله تعالى عنها - قالت: لما اشتكى**

(١) ئەگەر بنووسرێ: «لە پاڵ ئەم كۆڵەكەدا نوێژ بكە» باشترە.

النبي -ﷺ- ذكرت بعض نسائه [أم حبيبة وأم سلمة - رضي الله تعالى عنهما -] كنيسة رأينها بأرض الحبشة يقال لها: مارية. وكانت أم سلمة وأم حبيبة - رضي الله تعالى عنهما - أتتا أرض الحبشة، فذكرتا من حسنها وتصاوير فيها، فرفع رأسه فقال أولائك إذا مات منهم الرجل الصالح بنوا على قبره مسجدا ثم صوروا فيه تلك الصورة. أولائك شرار الخلق عند الله. ح - ٢/٤٢٤. م - ٣/١٨٤.

تەرجەمە:

عایشە - رضي الله تعالى عنها - ئەفەرموێ: کە پێغەمەر -ﷺ- نەخۆش کەوت بەعزێ لە ژنانی بەحثیان لە کەنیشتەیێ کرد کە لە حەبەشستان دیبوویان ناوی ماریە بوو. ئومم وسەلەمەو ئومم وحەبیبە - رضي الله تعالى عنهما - تەشریفیان چووبوو بۆ ئەرزی حەبەش. بەحثیان لە جوانیی ئەو کەنیشتەو ئەو صوورەتانەی کە تیابوو کرد. پێغەمەر -ﷺ- سەری هەڵبڕی فەرمووی: ئەوانە کە پیاوێکی صاڵحیان وەفاتی کرد لەسەر قەبرەکەی مزگەوتێ دروست ئەکەن و صوورەتی ئەو پیاوە صاڵحەی تیا ئەکێشن. ئەوانە لە لای خوا خراپترینی هەموو خەڵقن.

٤٧/١٨٩٨- وعنها أن وليدة كانت سوداء لحـي من العرب فأعتقوها، فكانت معهم. قالت: فخرجت صبية لهم عليها وشاح أحمر من سيور، قالت: فوضعته أو وقع منها، فمرّت به حُدَيّاة وهو ملقى فحسبته لحما فخطفته! قالت: فالتمسوه فلم يجدوه. قالت: فاتهموني به، قالت: فطفقوا يفتشون حتى فتشوا قبلها! قالت: والله إني لقائمة معهم إذ مرت الحدياة فألقته. قالت: فوقع بينهم. قالت: فقلت: هذا الذي

إتهمتموني به، زعمتم وأنا منه بريئة، وهو ذا هو. قالت: فجاءت إلى رسول الله -ﷺ- فأسلمت. قالت عائشة: فكانت لها خباء في المسجد أو حفش. قالت: فكــانت تأتيني فتحــدث عنـدي. قالت: فلا تجلس عندي مجلسا إلا قالت:

ويـوم الـوشـاح من تعاجيب ربنا ألا إنــه من بلدة الكفـر نجـاني!

قالت عائشة: فقلت لها: ما شأنكِ لا تقعدين معي مقعدا إلا قلتِ هذا؟ قالت: فحدثتني بهذا الحديث. ح ـ ١/٤٢٦.

(ره‌نگه نووسيبيّتم).[1]

ته‌رجه‌مه:

عايشه ـ رضي الله تعالى عنها ـ فه‌رمووى: جارى‌يه‌يه‌كى ره‌ش بوو هى به‌عزێ له عه‌ره‌ب بوو، ئازاديان كرد، له لايان مايه‌وه. ئه‌و جارى‌يـه وتى: كچێكى عازه‌بى ئه‌و مالـه [تـازه‌بـووك بوو] حه‌مايه‌لێكى سوورى بوو له مێشنى سوور گيرابوو، ئه‌و جارى‌يه‌يه وتى: ئه‌و كچه حه‌مايه‌ڵه‌كه‌ى دانا يا لێى كه‌وت. كۆللاره‌يێ به لايا رابورد [به گۆشتى زانى] فرانى. ژنه‌كه وتى: بۆى گه‌ران نه‌يان دۆزيه‌وه. وتى: توهمه‌تيان به من كرد. ده‌ستيان كرد به بوگه‌رانى تا ناو فه‌رجيشى گه‌ران! وتى: وه‌ڵلاهى له ناويانا راوه‌ستابووم ئه‌وه‌نده‌م زانى كۆللاره‌كه به‌وێدا رابوردو حه‌مايه‌ڵه‌كه‌ى فرێداو كه‌وته به‌ينيانه‌وه. وتى: وتم: ها ئه‌وه ئه‌وه‌يه كه واتان زانى كه من دزيومه‌و منيش له‌وه به‌ريى بووم. عايشه ـ رضي الله

(١) به‌ڵێ حه‌ديثى (١١٤١/٢٦٤)ى به‌رگى چواره‌ميش وه‌ك ئه‌م حه‌ديثه وايه.

تعـالى عنهـا ـ فەرمـووی: ئەو جاری‌یـە هاتـە خزمـەت پێغەمەر ـ ﷺ ـ موسـوڵمـان بوو. عایشـە ـ رضي الله تعـالى عنهـا ـ فەرمـووی: لە مەسجیدی پێغەمەرا ـ ﷺ ـ خەیمەیێکی بوو، هەموو جارێ ئەهاتە لام قسەی بۆ ئەکردم. فەرمووی: کە دائەنیشت و دانەئەنیشت ئەیوت.

رۆژی حەمایەڵ عەجایەبی خوا

لە شاری کوفر خوا دای نەجاتم!

عایشە فەرمووی ـ رضي الله تعالى عنها ـ: لێم پرسیی: بۆچی کە هەر جارێ لام دائەنیشی و دانانیشی ئەم بەیتە ئەڵێی؟ عایشە ـ رضي الله تعالى عنها ـ فەرمووی: ئەم قسەیەی بۆ کردم.

**٤٨/١٨٩٩ـ عن أبي هريـرة ـ رضي الله تعـالى عنـه ـ أن رجـلا أسـود أو امـرأة سوداء [وفي روايـة ابن خزيمـة إمرأة سوداء] كان يقُمُّ المسجد [أي يزيل قمامه ويكنسها] فمات، فسأل النبي ـ ﷺ ـ عنه، فقالوا: مات. قال: أفلا كنتم آذنتموني به؟ دلّوني على قبره، أو قال على قبرها. فأتى قبره [أو قبـرهـا] فصلى عليهـا [أو عليـه]. وفي أخـرى: فحقـروا شأنـه. خ ـ ١/٤٣٨. وعن ابن عباس ـ رضي الله تعالى عنهما ـ نحوه. ح ـ ٢/٣٦٤. م ـ ٤/٣٠١. وفيه: صغروا أمرها. د، جه، ت، ن.**

**تەرجەمە:**

ئەبوهورەیرە ـ رضي الله تعالى عنه ـ ئەفەرموێ: پیاوێکی رەش، یا ژنێکی رەش خزمـەتی مزگـەوتی پێغـەمـەری ئەکرد ـ ﷺ ـ وەفاتی کرد، پێغەمەر ـ ﷺ ـ لێی پرسیەوە. عەرزیان کرد کە: وەفاتی‌کرد. فەرمووی: بۆ خەبەرتان نەدامێ؟ قەبرەکەییم پیٚ‌نیشان بدەن. تەشریفی چوە سەر

قەبرەکەی نوێژی لەسەر کرد. لە ریوایەتێکا ئەفەرموێ: تەحقیری شانیان کرد. یەعنی شتێکی وا نیە کە زەحمەت بدەینە بەر تۆ. لە ریوایەتێکا ئەفەرموێ: ئەم قەبرانە تاریکن بۆ ئەهلیان بە نوێژی من خوا بۆیان رووناك ئەکاتەوە.

**٤٩/١٩٠٠ـ عن عائشة ـ رضي الله تعالى عنها ـ قالت: لما أنزل الآيات في سورة البقرة في الربا خرج النبي ـﷺـ إلى المسجد فقرأهن على الناس، ثم حرّم تجارة الخمر. ح ـ ١/٤٣٩. م ـ ٦/٤٦٤. د، ن، جه.**

**تەرجەمە:**

عایشە [رضي الله تعالى عنها] ئەفەرموێ: کە ئایاتی سوورەتی بەقەرە نازڵ بوو دەرحەق ریبا پێغەمەر ـﷺـ تەشریفی هاتە مزگەوت بۆ خەڵقی خوێندەوە، لە پاشا تیجارەتی شەرابی حەرام کرد.

**٥٠/١٩٠١ـ عن أبي هريرة [رضي الله تعالى عنه] عن النبي ـﷺـ قال: إن عفريتا من الجن تفلّت عليَّ البارحة [تعرض لي] أو قال كلمة نحوها ليقطع عليّ الصلاة، فأمكنني الله منه، فأردت أن أربطه إلى سارية من سواري المسجد حتى تصبحوا وتنظروا إليه كلكم، فذكرت قول أخي سليمان: ﴿رب اغفر لي وهب لي ملكا لا ينبغي لأحد من بعدي﴾[1] قال روح [في روايته]: فردّه خاسئا. ح ـ ١/٤٣٩. م ـ ٣/٢٠٦. ن.**

(١) ص/٣٥.

**تەرجەمە :**

ئەبوهورەیرە ـ رضي الله تعالى عنه ـ ئەفەرموێ: ئیمشەو عیفریتی لە جیننی هوجوومی کردە سەرم کە نوێژم پێ ببڕێ، خوا قودرەتی دام بە سەریا [یەعنی گرتم] تەمام بوو بی بەستم بە کۆڵەیێکەوە لە کۆڵەکەکانی مزگەوت تا رۆژتان لێ ئەبێتەوە تەماشای بکەن، فکری ئەوەم کردەوە کە برای نوبووەتم کە سولەیمانە فەرموبووی: خوایا لێم خۆش ببەو مولکێکی وام پێ عەطا بفەرموو لە پاش من بۆ هیچ کەس نەبێ. بە زەلیلیی بەرەلاّم کرد.

**١٩٠٢/٥١ـ عن عائشة ـ رضي الله تعالى عنها ـ قالت: أصيب سعد [رضي الله تعالى عنه] يوم الخندق، رماه رجل من قريش يقال له حبّان ابن العَرِقة، رماه في الأكحل [رەگی جان] فضرب النبي ـﷺـ خيمة في المسجد ليعوده من قريب، فلما رجع رسول الله ـﷺـ من الخندق وضع السلاح، واغتسل. فأتاه جبريل ـ عليه السلام ـ [زاد ابن سعد: على فرس عليه عمامة سوداء قد أرخاها بين كتفيه على ثناياه الغبار وتحته قطيفة حمراء] وهو ينفض رأسه من الغُبار. فقال: قد وضعت السلاح؟! والله ما وضعته! أُخرج إليهم. قال النبي ـﷺـ: فأين؟ فأشار إلى بني قريظة فأتاهم رسول الله ـﷺـ فنزلوا على حكمه، فرد الحكم على سعد [رضي الله تعالى عنه] قال: فإني أحكم فيهم: أن تقتل المقاتلة، وأن تسبى النساء والذرية، وأن تقسم أموالهم. ح ـ ٣١٨/٦. م ـ ٣٨٢/٧. لە فەضائیلا نووسراوە.** [1]

(١) بەڵێ لە حەدیثی ژمارە (١١١٣/٢٣٦)دا ریوایەتێکی نزیك بەم ریوایەتە هەیە، بەلاّم جیاوازن.

٥٢/١٩٠٣ـ وعنها: أن سعدا قال: أللهم إنك تعلم أنه ليس أحد أحب إليَّ أن أجاهدهم فيك من قوم كذبوا رسولك -ﷺ- وأخْرَجوه، أللهم فإني أظن أنك قد وضعت الحرب بيننا وبينهم، فإن كان بقي من حرب قريش شيء فأبقني له حتى أجاهدهم فيك، وإن كنت وضعت الحرب [بيننا وبينهم] فافجرها واجعل موتي فيها فانفجرت من لَبّته [من موضع القلادة من صدر] فلم يَرُعْهم، وفي المسجد خيمة من بني غفار إلا الدم يسيل إليهم! فقالوا: يا أهل الخيمة ما هذا الذي يأتينا من قبلكم؟ فإذا سعد يغذو جرحه =دما= فمات منها. ح ـ ٣١٨/٦. م ـ ٣٨٢/٧. د، ن. وفي أخرى مثله: فما زال يسيل حتى مات. =وزاد في الحديث= فذاك حين يقول الشاعر:

ألا يا سعد سعد بني معاذ!
فما فعلت قريظة والنضير؟
لعمرك إن سعد بني معاذ
غداة تحملوا لهو الصبور
تركتم قِدركم لا شيء فيها
وقدر القوم حامية تفور
وقد قال الكريم أبو حباب:
أقيموا قينقاع، ولا تسيروا
وقد كانوا ببلدتهم ثقالا
كما ثقلت بميطان الصخور.

م ـ ٣٨٣/٧

**تەرجەمە:**

عایشه[1] - رضي الله تعالى عنها - ئەفەرموێ: سەعدی کوڕی مەعاذ - رضي الله تعالى عنه - فەرمووی: یارەببی خوایا تۆ ئەزانی هیچ کەسێ نیە کە لە لام خۆشەویستر بێ کە شەڕی لەگەڵا بکەم لەو قەومەی کە تەکذیبی رەسوولی تۆیان کردوە -ﷺ- و لەوەطەنی خۆی کردوویانەتە دەرێ. خوایا من ظەننم وایە کە لە بەینی ئێمەو ئەوانا حەربت برانۆتەوە، ئەگەر شتێك لە حەربی قورەیش ماوە بمهێڵەوە بۆ ئەو حەربە کە موجاهەدەیان لەگەڵ بکەم بۆ رەزای تۆ، ئەگەر حەربت نەهێشتوە لە بەیناخوێنەکەم بەرەڵلا بکەو بیکە بە سەبەبی مردنم. خوێنەکەی لەو شەوەدا لە شارەگی ملی بەربوو[2]، هەر

(١) دانەر - خ - تەرجەمەی حەدیثی (١٩٠٢/٥١)ی نەنووسی لەبەر ئەوەی کە لە فەضائیلا نووسراوە، بەلام لەبەر ئەوەی ریوایەتی ئێرەو ریوایەتەکەی ئەوێ جیاوازن ئێمە لێرەدا تەرجەمەکەمان نووسی:

عائیشە - خ - دەفەرموێ: لە رۆژی خەندەقدا سەعد - خ - پێکرا. پیاوێکی قورەیشی کە ناوی حیببانی کوڕی عەریقە بوو تیرێکی دا لە رەگی گیانی، پێغەمەر -ﷺ- چادرێکی لە مزگەوتدا هەڵدا تا لە نزیکەوە سەری لێ بدا. کاتێ پێغەمەر -ﷺ- لە خەندەق گەڕایەوە چەکی داناو خۆی شۆرد. جیبریل - د - هات بۆلای، [ئیبن وسەعد دەڵێ: سواری ماینێك بووبوو، مێزەرێکی رەشی بەسەرەوە بوو، شۆڕی کردبووەوە بە ناوشانیدا ئەم لاو لاکەی تۆزاوی بوو، قەیفەیەکی سووری لە ژێرەوە بوو.] تۆزی لە سەری خۆی ئەتەکاند. عەرزی پێغەمەری کرد: ئەوە چەکت داناوە؟! وەڵلاهی من هێشتا دام نەناوە! بۆیان دەرچۆ. پێغەمەر -ﷺ- فەرمووی: بۆ کوێ؟ جیبریل - د - ئیشارەتی بۆ کرد: بۆلای بەنی قورەیظە. پێغەمەر -ﷺ- چوە سەریان، لەسەر حوکمی پێغەمەر -ﷺ- لە قەلاکانیان هاتنەخوارێ. پێغەمەر -ﷺ- دانیە دەست حوکمی سەعد - خ - سەعد وتی: من وایان حوکم بەسەردا دەدەم کە: جەنگاوەرەکانیان بکوژرێن و، ژن و منداڵەکانیان بەدیل بگیرێن و، ماڵ و داراییان دابەش بکرێت.

(٢) دانەر - خ - مانای ئەم شوێنەی بیرچوە کە ئەمە ماناکەیەتی: خێوەتێکی بەنی غیفار لە مزگەوتدا ⟸

خوێنـەکـەی لێ جاریی بوو تا وەفـاتی کرد. ئەوە لەو وەختانەدا بوو کە شاعیر ئەم بەیتانەی وت:

ئەی سەعـدی بنی مەعـاذ خەبـەردار بە کە چیت کرد دەرحـەق بەنی قورەیظـەو بەنی نەضیـر؟! بە بەقـای تۆ قەسـەم سەعـدی بنی مەعـاذ لەو سبـەینێیـەدا کە قورەیظـە تەحـەممـولی ئەوەیـان کرد لەسـەر حوکمی ئەو لە قەڵاکـەیـان هاتنـەدەرێ.. زۆر بە صەبـر بوو کە حوکمی بە قەتڵیـان کرد. دیزەی خۆتان بە بەطاڵیی بەجێ هێشت کە هاوسوێنی خۆتان بە کوشتن دا. دیزەی قەومی [سەعدی بنی عوبادە کە بەنی خەزرەجن بە سایەی ئەمەوە کە شەفـاعـەتیـان بۆ بەنی نەضیـر کردو پێغـەمـەر ـﷺـ عەفوی کردن] لە کوڵەو ئەجـۆشێ [چـونکـە ئێـوە لە هاوسـوێن مەحـرووم بوون و ئەوان مەحـرووم نەبـوون] ئەبـوحـەبـاب [کـە عەبـدوڵـڵای کوڕی ئوبەیی کوڕی سەلوولی مونـافیقـە] بە سوێنخـوارەکـەی خۆیی وت: لە قەینـوقـاع ئیقامەت بکەن و مەڕۆن، لە شارو وەطەنیانا گران و بەقیمەت بوون چۆن بەردی میطان لە میطانا بە قیمەتە.

ئەم شاعیرە بەم شیعرانە لەومی لەسەعدی بنی مەعاذ داوە[1] ـ رضي الله تعالى عنه ـ ئەمما ناماقوولی کردوە؛ چونکی پێغەمەر ـﷺـ پێی فەرموو: بە حوکمی خواو رەسوولی خوا حوکمت کرد.

٥٣/١٩٠٤ـ عن ابي سعيد الخدري ـ رضي الله تعالى عنه ـ قال: خطب

بوو ـ خەڵکی تیابوو ـ بە خۆیان نەزانی تا شۆڵاوگەی خوێن بۆلایان هات. وتیان: ئەی خەڵکی چادر ئەمە چیە لای ئێوەوە بۆمان دێت؟ سەیریان کرد خوێنی برینەکەی سەعدە ـ خ ـ!

(١) ئەم رستـەی دانـەر ـ خ ـ هەڵـەیـەکی تێـدایـەو دەبێ یا بڵێ: (لەومی سەعدی کوڕی مەعاذی کردوە) یا بڵێ: (تەعنەی لە... داوە).

النبي -ﷺ- فقال: ان الله - تعالى - خيَّر عبدا بين الدنيا وبين ما عنده فاختار ما عند الله. فبكى ابو بكر - رضي الله تعالى عنه - فقلت في نفسي: ما يبكي هذا الشيخ إن يكن الله خير عبدا بين الدنيا وبين ما عنده فاختار ما عند الله؟! فكان رسول الله -ﷺ- هو العبد، وكان ابو بكر [رضي الله تعالى عنه] اعلَمنا فقال: يا ابا بكر لاتبك. ان امنَّ الناس عليَّ في صحبته وما له ابو بكر، ولو كنت متخذا خليلا من امتي لاتخذت ابا بكر. ولكن اخوة الإسلام ومودته. لايبقينَّ في المسجد باب الا سدَّ الا باب ابي بكر. م - ٢٦٨/٩. ح - ٦/ ٨٠. ح - ١/ ٤٤٢. وعن ابن مسعود وابن عباس. م - ٢٧١/٩. ح - ١/ ٤٤٤ وفيه: سدّوا عنيِّ كل خوخة في هذا المسجد غير خوخة ابي بكر. ح - ١/ ٤٤٤. ن.

تەرجەمە:

پێغەمەر -ﷺ- خوطبەی خوێن [لە خوطبەکەیا] فەرمووی: خوا - سبحانە وتعالى - عەبدێکی موخەییەر کردوە لە بەینی دنیاو ئەوەی کە لە لای خوایە. ئیختیاری ئەوەی کرد کە لە لای خوایە. ئەبوبەکر - رضي الله تعالى عنە - گریا. [ئەبوسەعید - رضي الله تعالى عنە -] ئەفەرموێ: لە دڵی خوّما وتم: ئەم ئیختیارە بوّچی ئەگریی کە پیاوێ ئیختیار بکرێ لە بەینی دنیاو ئەوی لای خوایە =ئەو ئیختیاری ئەوە بکا کە لە لای خوایە=؟ مەگیرە ئەم عەبدە موخەییەرە پێغەمەر -ﷺ- بوو، ئەبوبەکر - رضي الله تعالى عنە - لە هەموومان عالمتر بوو. پێغەمەر -ﷺ- فەرمووی: ئەی ئەبوبەکر مەگریی بە منەتترینی خەڵق بە سەرما لە رەفاقەتیو لە ماڵیا ئەبوبەکرە. ئەگەر لە ئوممەتی خوّم یەکێکم بکردایە بە دوّست ئەبوبەکرم ئەکرد. ئەمما ئەبوبەکر [برای دینە] برای دین و مەحەببەتی دین ئەفضەلترە. هیچ دەرگایێ لە

مزگـەوتـا نەمێنێ، ئەبێ هەمـووی بگیـر رێ غەیری دەرگای ئەبوبەکر. لە ریـوایـەتـەکـەی ترا ئەفـەرمـوێ: هەز قوخێ لە مزگەوتا بێ بیگرن غەیری قوخی ئەبوبەکر.

٥٤/١٩٠٥- عن السـائب بن يزيـد قال: كنت قائمـاً في المسجـد فحصبني رجل فنظرت فإذا عمر بن الخطاب [رضي الله تعالى عنه] فقال: اذهب فأتني بهذين، فجئت بهما قال:من أنتما؟ أو من أين أنتما؟ قالا: من أهـل الطـائف. قال:لو كنتما من اهل البلد لأوجعتكما، ترفعان أصواتكما في مسجد رسول الله -ﷺ-؟ ح - ١/٤٤٥.

٥٥/١٩٠٦- عن عبـد الله بن زيـد بن عاصم [رضي الله تعـالى عنـه] انه رأى رسـول الله -ﷺ- مستلقيـا في المسجـد واضعـا احـدى رجليـه على الاخرى م - ٨/٤١٢. ح - ١/٤٤٧. د، ت، ن.

تەرجەمە:

سائیبی کوڕی زەیـد ئەفـەرمـوێ: لە مەسجیـدا راوەستـابـووم یەکێ بەردێکی بۆ هاویتم، کە تێفکریم ئیمامی عومەر بو- رضي الله تعالى عنه - فەرمووی: بچۆ ئەو دوانەم بۆ بانگ کە، بردمنە خزمەتی، لێیپرسین: ئێوە کێن؟ یا فەرمـووی: خەڵقی کوێن؟ وتیان: خەڵقی طایەفین. فەرمووی: ئەگـەر خەڵقی شار بوونـایـە ئازارم ئەدان لە مزگەوتی پێغەمەرا -ﷺ- دەنگ بەرز ئەکەنەوە؟

عەبـدوڵـلای کوڕی زەیـدی کوڕی عاصیم - رضي الله تعـالى عنـه - ئەفـەرمـوێ: چاوم کەوت بە پێغـەمـەر -ﷺ- بەقـەفـاوە راکشـابوو پێیێکی خستبوە سەر پێیێکی.

سەعیـدی کوڕی موسـەییـەب - رحمـه الله، ورضي عنه - ئەفەرموێ:

عومەرو عوثمانیش ـ رضي الله تعالى عنهما ـ وایان ئەکرد.

پێنــج شەش رۆژە تەرکی نووسینم کردوە؛ چونکی خەڵق گەلێکیــان رۆییبوون و گەلێکیان حازرن بۆ رۆیین، کە ئەستامووڵ لە ترسی ئەڵمان چۆڵ بکــرێ مەبــادا تووشی تەهلوکــە ببن (صــانهــا الله مع سائـر بلاد المسلمين من جميـع الآفـات والبليـات!) منیش بارم بەستـوە بۆ ئەطەنە، فەقـەط تەرەدودم هەیـە (أقـدم رجـلا وأؤخـر أخرى) ئەو کتێبانەی کە هەمە هەموو لە جەوالآن، سا بە خێرییەت بیان کەمەوەو لە جێی خۆمان پەروازە نەبین: دوٚعای خێرمان بۆ بکەن.

ئیمـرۆ (بتـوفيق الله تعـالى) دەستی پێ‌ئەکەمەوە تا بزانین خوا چیمان بۆ ئەکـا، کتێبـەکـانم هەروان لە ناو بارا، تەنهـا موسـوەدەکـان بە بێ تەرتیب بەدەرەوەن. قەسطـەلانیم لە لایـە ئەممـا لە جەوالآیـە! ئەگەر غەڵەطم بوو ئیصلاحی بکەن (يغفر الله لكم. ومن الله التوفيق) ٢١ نیسانی ٩٤١

## نوێژ لە مەسجیدی قوباداو زیارەتی

٥٦/١٩٠٧ ـ عن نافــع أن ابن عمــر ـ رضي الله تعـالى عنهمـا ـ كان لايصلي من الضحى إلا في يومين: يوم يقـدم بمكـة، فانـه كان يقـدمها ضحى، فيطـوف بالبيت ثم يصلي ركعتين خلف المقــام، ويــوم يأتي مسجد قباء فانه كان يأتيه كل سبت فإذا دخل المسجد كره أن يخرج منه حتى يصلي فيه. قال: وكان يحدث ان رسول الله ـ ﷺ ـ كان يزوره [يوم السبت فيصلي فيه ركعتين. اخرى] راكبا وماشيا. قال: وكان يقول له: إنما أصنع كما رأيت أصحابي يصنعون، ولا أمنع أحدا أن صلى في أي ساعــة شاء: من ليــل، أو نهــار غيـر أن لاتتحـروا طلوع الشمس

**ولاغروبها. ح - ٢/٣٣١. م - ١١٣/٧ [1]. ح - ٢/٣٣٢.**

**تەرجەمە:**

نافیع - رحمه الله - ئەفەرموێ: عەبدوڵڵای کوڕی عومەر - رضي الله تعالى عنهما - نوێژی ضوحای هەر لە دوو رۆژا ئەکرد: ئەو رۆژەی کە ئەگەییە مەککە؛ چونکی لە وەختی چێشت ئەنگاوا ئەگەییە مەککە، طەوافی بەیتی ئەکرد، لە پاشا لە پشت مەقامەوە دوو رەکعەت نوێژی ئەکرد. هەم لەو رۆژەیشا کە ئەچوە مەسجیدی قوباء لە رۆژی شەمەدا ئەچوو، کە بچوایە ژووری مزگەوتەکەوە ئەیکەرهان کە بێ ئەمە نوێژی تیا بکا لێی بچێتە دەرێ ئەیشیفەرموو: پێغەمەر -ﷺ- هەموو شەمەیێ زیارەتی قوبای ئەکرد دوو رکات نوێژی تیا ئەکرد. نافیع ئەفەرموێ: عەبدوڵڵا - رضي الله تعالى عنه - ئەیفەرموو: بۆیە من وا ئەکەم چونکی رەفیقەکانم ئەدیی وایان ئەکرد. مەنعی هیچ کەس ناکەم لە هەر ساعەتێکا نوێژ ئەکا بیکا: شەو بێ، رۆژ بێ.. ئەوەندەی هەیە مەگەڕێن بۆ وەختی رۆژهەڵاتن و رۆژئاوابوون، =کە= لەو وەختەدا بە عەمدەن نوێژ بکەن.

بۆ ئەهلی مەدینە هەموو شەنبەیێ سوننەتە زیارەتی مزگەوتی قوبا بکا؛ چونکی پێغەمەر -ﷺ- بینای کردوەو، هەموو شەمەیێ تەشریفی چوە نوێژی تیاکردوە.

**لە وەختی رۆژهەڵاتن و ئاوابوونا نوێژکردن حەرامە بەو شەرتە بە عەمدەن بیخاتە ئەو وەختەوە. یەعنی ئەگەر لەبەر مەعذەرەتێ کەوتە ئەو**

(١) ئەم حەدیثەم لە موسلیمدا نەدۆزیەوە.

وەختانە مەکرووهـ نیەو دروستە. (خلافا لأبي حنيفة) لای ئەو بەتاڵە.

**دروست نیە قەبری ئەنبیا ـ عليهم الصلاة والسلام ـ بکرێن بە مزگەوت:**

**١٩٠٨/٥٧ ـ جندب [رضي الله تعالى عنه] قال: سمعت النبي ـ ﷺ ـ قبل ان يموت بخمس وهو يقول: اني أبرأ إلى الله أن يكون لي منكم خليل، فإن الله قد إتخذني خليلا كما إتخذ إبراهيم [عليه الصلاة والسلام] خليلا. ولو كنت متخذا من أمتي خليلا لاتخذت أبا بكر خليلا. ألا وإن من كان قبلكم كانوا يتخذون قبور أنبيائهم وصالحيهم مساجد؛ فلا تتخذوا القبور مساجد، إني أنهاكم عن ذلك. م ـ ١٨٦/٣.**

**تەرجەمە:**

جوندوب ـ رضي الله تعالى عنه ـ ئەفەرموێ: پێنج رۆژ لە پێش وەفاتی پێغەمەرا ـ ﷺ ـ لێم بیست ئەیفەرموو: بە تەحقیق من بەرییم لە لای خوا [عز وجل] کە لە ئێوە یەکێ بکەم بە خەلیلی خۆم؛ چونکی خوا ـ عز وجل ـ منی کردوە بە خەلیل وەك ئیبراهیم [عليه السلام]ی کردوە بە خەلیل. من ئەگەر لە ئوممەتی خۆم یەکێکم بکرادیە بە خەلیل ئەبوبەکرم ئەکرد بە خەلیل. لێتان مەعلووم بێ ئەو ئوممەتانەی کە لە پێش ئێوەدا بوون قەبری پێغەمەرەکانیان و صاڵحەکانیان ئەکرد بە مزگەوت، هیچ قەبرێك مەکەن بە مزگەوت من نەهیتان لێ ئەکەم لەوە.

## منبر النبي ـ ﷺ ـ

**١٩٠٩/٥٨ ـ أبو حازم [سلمة بن دينار ـ رحمه الله ـ] قال: سألوا سهل بن**

سعـد [رضـي الله تعـالـى عنـه] : من أيّ شيـىء الـمنبـر؟ فقـال : مابقي بالنـاس أعلم مني ، هو من أثـل الغـابـة [شجـر لاشـوك له مثـل الطرفاء ، وورقـه الأشنـان . والغـابـة موضـع قرب المـدينة] عمله فلان [ميمون أو باقـوم] مولى فلانـة [عائشة الأنصارية ـ رضي الله عنها ـ] لرسول الله ـﷺـ وقـام عليـه رسـول الله ـﷺـ حين عمله ، ووضِـعَ ، فاستقبـل القبلة ، كبـر وقام الناس خلفه ، فقرأ وركع وركع الناس خلفه ، ثم رفع رأسه ، ثم رجع القهقرى ، فسجد على الأرض ، ثم عاد إلى المنبر ، ثم قرأ ، ثم ركع ، ثم رفع رأسه ، ثم رجع القهقرى . حتى سجد بالأرض ، فهذا شأنه . قال أبـو عبـدالله [البـخـاري] : قال علي بن عبـدالله سألني أحمـد بن حنبـل [رحمهم الله تعـالى] عن هذا الحـديث . قال : فإنمـا أردت أن النبي ـﷺـ كان أعلى من النـاس ، فلا بأس بأن يكـون الامـام أعلى من النـاس بهـذا الحـديث . قال : فقلت : ان سفيـان [بن عيينـة ـ رحمـه الله ـ] كان يسأل عن هذا كثيرا ، فلم تسمعه منه؟ قال : لا . ح ـ ١/٣٩٥ . جه .

٥٩/ ١٩١٠ ـ وعنه أن نفراً جاؤا إلى سهل بن سعد [رضي الله تعالى عنه] قد تماروا في المنبر من أي عود =هو=؟ فقال : =أما= والله إني لأعرف من أي عود هو ، ومن عمله ، ورأيت رسـول الله ـﷺـ أول يوم جلس عليـه . فقلت له : ياأبا عباس فحدثنا . قال : أرسل رسول الله ـﷺـ إلى إمرأة . قال أبو حازم : إنه ليسميها يومئذ ، انظري غلامك النجار يعمل لي أعواداأكلِّم النـاس عليهـا ، فعمـل هذه الثـلاث درجـات ، ثم أمر بها رسول الله ـﷺـ فوضعت هذا الموضع ، فهي من طرفاء الغابة . ولقد رأيت رسول الله ـﷺـ قام عليه فكبر وكبر الناس وراءه ، وهو على المنبر ، ثم رفع فنزل القهقرى حتى سجد في أصل المنبر ، ثم عاد حتى =فرغ= من آخر صلاته ، ثم أقبل

**على الناس، فقال: يأيها الناس إنما صنعتُ هذا لتأتمّوا بي ولتعلموا صلاتي. م - ٣/٢١٢. ح - ٢/١٧١. د، ن.**

**تەرجەمەکانیان:**

ئەبوحازم - رحمه الله - ئەفەرموێ: بەعزێ خەڵق هاتنەخزمەت سەهلی کوڕی سەعدی ساعیدیی - رضي الله تعالى عنه - لە مینبەرا: کە لە چە دارێ دروست کراوە؟ نیـزاعیـان بوو. سەهـل - رضي الله تعـالى عنـه - فەرمـووی: خەبـەرتـان بێ وەڵـڵاهی ئەزانم کە: لە چە دارێکە، کێ دروستی کردوە. چاوم کەوت بە پێغەمەر -ﷺ- لە ئەووەڵ ڕۆژێکـا کە تەشـریفی لە سەری دانیشت. ئەبـوحـازم ئەفـەرمـوێ: عەرزم کرد: کە وابێ قسەمان بۆ بکە. فەرمووی: پێغەمەر -ﷺ- ناردیە لای ژنێ کە عایشـەی ئەنصـاریـیە ئەمـری پێکـرد کە: بە غولامـە دارتـاشـەکـەت [کـە مەیمـوونـە، یا باقـوومـە] بڵێ چەنـد: دارێکم بۆ دروست بکا کە لە سەری قسە لەگەڵ خەڵق بکەم. ئەم [مینبەرە] سێ پێپیلکـەیـەی بۆ دروست کرد. پێغـەمـەر -ﷺ- ئەمری کرد لەو جێیەیان دانا. ئەو مینبەرە لە داری بیی غابەیە[1]. پێغەمەر -ﷺ- م دی تەشریفی لە سەری ڕاوەستا رووی کردە قیبلە. (الله أكبر)ی کرد، لە دوای ئەووەوە خەڵق لە پشتیـەوە ڕاوەستـان و (الله أكبـر)یـان کرد، قورئـانی خوێن و تەشریفی چوە روکووع، خەڵقیش چوونە روکووع سەری موبارەکی لە روکـووع بەرزکـردەوە لە پاشـا تەشـریفی پاشەوپاش گەڕایەوە سوجدەی لەسەر ئەزر برد دیسان سەرکەوتەوە، تا ئاخری نوێژەکەی بەم نەوعە. لە

(١) غابە: شوێنێکە لە نزیکی مەدینەدا.

دوای نوێژ روی کردە خەڵق، فەرمووی: ئەی خەڵقینە بۆیەکم وا کرد تا ئێوەیش لە نوێژا پەیڕەویی من بکەن، بزانن کە چۆن نوێژئەکەن (١).

حەرەکەتی کەم نوێژ بەتاڵ ناکاتەوە،بۆ مەصڵەحەتی عامە ئیعانە لە خەڵق طەڵەبکردن، بە قەدەر ئەو مەصڵەحەتە دروستە،بە فیعل تەعلیمی خەڵق زۆر باشەو سوننەتە. بە قسەیش دووبارەو تەئکیدي سوننەتە. بۆ ئیمام لە نوێژا لە سەر جێی بەرزتر لە جێی مەئمووم راوەستان دروستەو سوننەتە، تا چاویان لە نوێژکردنی ئیمامەکەیان بێ لێیان تێك نەچێ.

## وجوب إذن النساء إلى المساجد وحرمة منعهن (٢)

**٦٠/١٩١١ ـ عن عبدالله بن عمر [رضي الله تعالى عنهما] أن رسول الله ـﷺـ قال: لاتمنعوا إماء الله مساجد الله. م ـ ٣/٨٦.**

**تەرجەمە:**

پێغەمەر ـﷺـ فەرمووی: جاریەی خوا لە مزگەوتانی خوا مەنع مەکەن

**٦١/١٩١٢ ـ سالم عن عبدالله بن عمر [رضي الله تعالى عنهما] قال: سمعت رسول الله ـﷺـ يقول: لاتمنعوا نساءكم المساجد إذا استأذنكم إليها. فقال بلال بن عبدالله [رضي الله تعالى عنه]: والله لنمنعهن. قال: فأقبل عليه عبدالله فسبَّهُ سبًا سيِّئا ماسمعته سبَّه مثله**

(١) دانەر ـ خ ـ پوختەی مانای هەر سێ حەدیثەکەی نووسی، بۆیە هەندێ شتی نەنووسیوە وەك قسەکەی بوخاریی و سوفیانی کوڕی عویەینە. کە عەلیی کوڕی مەدینی ئەڵێ: بە ئەحمەدی کوڕی حەنبەلم وت: گەلێ جار دەربارەی ئەم حەدیثە لە سوفیان دەپرسرا، ئایا لێت نەبیستوە؟ فەرمووی: نە.

(٢) پێویستی رێگەدانی ژنان بۆچوونە مزگەوت و حەرامی مەنعکردنیان.

**قط. وقال: أخبرك عن رسول الله ـ ﷺ ـ وتقول والله لنمنعهن؟! مـ ٣/٨٦.**

**وفي أخرى مثله: لاندعهن يخرجن فيتخذنه دَغَلا [فسادا وخداعا وريبة].**

**وفي أخرى: ائذنوا للنساء بالليل إلى المساجد. فقال: ابن له يقال له واقد: إذن يتخذنه دَغَلا. قال: فضرب صدره.. م ـ ٣/٨٦، ٨٧.**

**تەرجەمە:**

عەبدوڵڵای کوڕی ئیمامی عومەر ـ رضي الله تعالى عنهما ـ ئەفەرموێ: لە پێغەمەر ـ ﷺ ـ م بیست ئەیفەرموو: ژنانتان کە ئیذنیان لێ خواستن [بە شەو. م أخری] بۆچوونەمزگەوت مەنعیان مەکەن لە مزگەوت بیلالی کوڕی عەبدوڵڵا وتی: وەڵڵا مەنعیان ئەکەین!

عەبدوڵڵا ـ رضي الله تعالى عنه ـ رووی تێکرد. سالم ئەفەرموێ: جوێنێکی زۆر خراپی پێدا، قەت نەمبیستبوو جوێنی وای پێدابێ. پێی فەرموو: من لە پێغەمەرەوە ـ ﷺ ـ خەبەرت ئەدەمێ و تۆ ئەڵێی مەنعیان ئەکەین؟! لە ریوایەتەکەی ترا واقیدی کوڕی وتی: کە وابێ خەڵق ئەیانکەن[1] بە سەبەبی فەسادو شوبهە. عەبدوڵڵا ـ رضي الله تعالى عنە ـ بە سنگیا کێشاو فەرمووی.. إلخ. لە ریوایەتەکەی ترا ئەفەرموێ: کە ئیذنیان لێ خواستن کە بە شەو بچنە مزگەوت ئیذنیان

(١) دانەر ـ خ ـ لە مانای (يتخذنه دغلا)دا فەرموویەتی: «خەڵق ئەیانکەن بە سەبەبی فەسادو شوبهە» بەڵام وابزانم باش بۆی نەچووە، دەبوو بیفەرمووایە: «کە وابێ مزگەوت ئەکەن بە جێگەی خراپەو..» واتە: ژنەکان ئەیکەن، نەك خەڵق ژنەکان ئەکەن بە..

بدەن.

١٩١٣/٦٢ وعنه ـ رضي الله تعالى عنه ـ قال: كانت إمرأة لعمر [عاتكة بنت زيد النبي، أو الولي، أخت سعيد[٢] من العشرة المبشرة ـ رضي الله تعالى عنهم ـ] تشهد صلاة الصبح والعشاء في الجماعة في المسجد، فقيل لها: لم تخرجين وقد تعلمين أن عمر [رضي الله تعالى عنه] يكره ذلك ويغار؟ قالت: ومايمنعه أن ينهاني؟ قال: يمنعه قول رسول الله ـﷺـ: لاتمنعوا إماء الله من مساجد الله. ح ـ ١٦٢/٢.

تەرجەمە:

عاتیکەی حەرەمی حەزرەتی عومەر، کچی زەیدی کوڕی نوفەیل خوشکی سەعیدی موبەششەر بە جەنەت ـ رضي الله تعالى عنهم ـ تەشریفی لە نوێژی سبەینێ و خەوتنانا حازری جەماعەت ئەبوو. پێیان وت: بۆ بە شەو ئەچی بۆ مزگەوت ئەزانی کە عومەر ـ رضي الله تعالى عنه ـ لەبەری گرانەو بەغیرەتە؟! فەرمووی: ئەی بۆچی مەنعم ناکا؟ عەرزیان کرد: لەبەر فەرموودەی پێغەمەر ـﷺـ: کارەکەرانی خوا لە مزگەوتانی خوا مەنع مەکەن.

١٩١٤/٦٣ ـ زينب الثقفية: امرأة ابن عمر ـ رضي الله تعالى عنهما ـ كانت تحدث عن رسول الله ـﷺـ أنه قال: إذا شهدت إحداكن العشاء فلا تطيب تلك الليلة. م ـ ٨٧/٣. وعن أبي هريرة نحوه م ـ ٨٨/٣.

تەرجەمە:

زەینەبەی ثەقەفی‌یە ژنی ئیبن و عومەر ـ رضي الله تعالى عنهم ـ لە

(١) لە ئەسڵدا ئاوایە (زيد بن عمرو بن نفيل أخت سعد).

پێغەمەر ـﷺـ ەوە ریوایەت ئەکا فەرمووی: ژنانتان کە حازری نوێژی خەوتنان بوون ئەو شەوە بۆنی خۆش لە خۆی هەڵنەسوێ.

ئەبوهورەیرەیش ـ رضي الله تعالى عنه ـ ئەفەرموێ: پێغەمەر ـﷺـ فەرمووی: هەر ژنێ کە بە بخوور خۆی قان دا لەگەڵ ئێمە حازری جەماعەتی خەوتنان نەبێ.

**١٩١٥/٦٤ ـ عائشة [رضي الله تعالى عنهـا] زوج النبي ـﷺـ تقول:لو أن رسول الله ـﷺـ رأى ما أحدث النساء لمنعهن المساجد كما مُنِعت نساء بني إسرائيل. قال [يحيى]: فقلت لعمرة [بنت عبد الرحمن بن عوف ـ رضي الله تعالى عنهما ـ] أنساء بني إسرائيل منعن =المسجد=؟ قالت: نعم. م ـ ٨٨/٣.**

**تەرجەمە:**

عایشە ـ رضي الله تعالى عنها ـ ئەیفەرموو: ئەگەر پێغەمەر ـﷺـ ئەوەی ئەبینی کە ژنان ئیجادیان کردوە مەنعی ئەکردن لە مزگەوت چۆن ژنـانـی بەنی ئیسـرائیـل مەنـع کراون. یەحیـا لە عەمـرەی کچی عەبدوڕەحمانی کوڕی عەوفی پرسی ـ رضي الله تعالى عنهما ـ: بۆچ ژنانی بەنی ئیسرائیل لە مزگەوت مەنع کراون؟ عەمرە فەرمووی: بەڵێ.

**١٩١٦/٦٥ ـ حەضرەتی عائیشە [رضي الله تعالى عنها] قالت: كن نساء الـمؤمنـات، يشهـدن مع رسـول الله ـﷺـ صلاة الفجـر متلفعـات بمروطهن، ثم ينقلبن إلى بيوتهن، حين يقضين الصلاة، لايعرفهن أحد من الغلس. ح ـ ٤٩٧/١، ٤٩٢ بفرق لايضر.**

**تەرجەمە:**

عائیشە ـ رضي الله تعالى عنها ـ ئەفەرموێ: ژنەموسوڵمانان لە خزمـەت پێغەمەرا ـﷺـ حازری نوێـژی سبـەینێیـان ئەبوون، خۆیان بەسەرپۆش داپۆشیبو، لە دوای نوێژ ئەگەڕانەوە بۆماڵەوە لەبەر تاریکیی هیچ کەس نەیەناسین.

وەختی نوێــژی سبـەینێ طولـووعی فەجـرە. زۆر ئەکـرێو کراوە، حەتتا دوای گەڕانەوە یەکترییان نەناسیوەتەوە لەبەر تاریکیی.

ئەو مەوقیعانەی کە پێغەمەر ـﷺـ کە لە رێی حەج و عومرەدا نوێژی لێ کردوە نۆ مەوقیعــە. ئیمـڕۆ مەسجیـدی (ذو الحلیفـە)و مەسجیـدی (روحا) مەعلوومە، خەڵقی ئەو ئەطرافە ئەیزانن، حەوتی هیچ کەس نیە بیـزانێ، کە وابێ لە نووسینیـانـا هیـچ فایـدەی نیـە. لە بوخـارییان لە صەحیفەی ح ـ ٤٥١/١. لە نۆ حەدیثان موراجەعەتی ئەو صەحیفەی قەسطەلانییە بکەن.

## سترة المصلى[(١)]

**١٩١٧/٦٦ ـ عن أبي جحيفة ـ رضي الله تعالى عنه ـ قال: رأيت رسول الله ـﷺـ [بمكـة وهـو بالأبطـح] في قبـة حمـراء من أدَم [كأني أنظر إلى بياض ساقيه. م] ورأيت بلالا أخذ وَضوء رسول الله ـﷺـ ورأيت الناس يبتدرون ذاك الوَضوء فمن أصاب منه شيئا تمسح به، ومن لم يصب منه شيئا أخذ من بلل يد صاحبه، ثم رأيت بلالا أخذ عنزة فركزها، وخرج النبي ـﷺـ في حلة حمراء مشمِّرا، صلى إلى العنزة بالناس ركعتين،**

(١) ئەوەی لە بەردەمی نوێژکەرا دادەنرێ.

ورأيت الناس والدواب يمرون بين يدي العنزة.
ح ـ ١/ ٣٩٤. م ـ ٣/ ١٥٧. د، ت، ن، جه. وفي مسلم زيادة: فتوضأ، وأذّن بلال قال [=ابو جحيفة=] فجعلت أتتبع فاه ههنا وههنا [إلى هنا ح ـ ٢/ ١٨] يقول يمينا وشمالا، يقول: حي على الصلاة، حي على الفلاح. قال: ثم ركزت له عنزة فتقدم فصلى الظهر ركعتين، يمر بين يديه الحمار والكلب لايمنع، ثم صلى العصر ركعتين، ثم لم يزل يصلي ركعتين حتى رجع إلى المدينة. م ـ ٣/ ١٥٧.
تەرجەمە:

ئەبو جوحەيفە ـ رضي الله تعالى عنه ـ ئەفەرموێ: هاتمە خزمەت پێغەمەر ـﷺـ لە مەكەدا تەشریفی لە ئەبطەحا بوو، لە قوببەیێكی چەرمی سوورا بوو، چاوم كەوت بە بیلال ئاوی دەزنوێژی پێغەمەری ـﷺـ هێنایە دەرێ، دەرنوێژی شت، خەڵق بە پەلەپەل هاتن بۆ ئاوی دەزنوێژەكەی، هەركەسێ شتێكی دەست بكەوتایە لە خۆیی ئەسوو، هەركەسێ دەستی نەكەوتایە لە تەڕایی دەستی ڕەفیقەكەی لە خۆیی ئەسوو، بیلال بانگی دا، تەماشای دەمم ئەكرد كە بۆ لای ڕاستیو لای چەپی ئەملاو ئەولای پێ ئەكرد. پێغەمەر ـﷺـ لە دەستێ لیباسی سوورا تەشریفی هاتەدەرێ، (كأنە) چاوم وا لە سپیایی هەردوو پووزی موبارەكی، لە پاشا بیلال عەصایێكی نووك بە ئاسنی بۆ داچەقان، بە قاچی هەڵماڵراوەوە ڕووی كردە عەصاكەو دوو ركات نوێژی بە خەڵق كرد. گوێدرێژو سەگ بە بەردەمی عەصاكەدا ئەڕۆیین مەنع نەئەكران، نوێژی عەصری دوو ركات كرد، تا گەڕایەوە بۆ مەدینە هەر دوو ركات ـ دوو ركات نوێژی ئەكرد ـ یەعنی غەیری مەغریب ـ.

**١٩١٨/٦٧ ـ عن ابن عمر [رضي الله تعالى عنهما] أن رسول الله ـﷺـ كان إذا خرج يوم العيد أمر بالحربة فتوضع بين يديه فيصلي إليها والناس وراءه، وكان يفعل ذلك في السفر، فمن ثم إتخذها الأمراء. ح ـ ١/٤٥٤. م ـ ٣/ ١٥٤.**

**تەرجەمە:**

ئيبن و عومەر ـ رضي الله تعالى عنهما ـ ئەفەرموێ: كە پێغەمەر ـﷺـ رۆژی جەژن تەشریفی بچوایە دەرێ بۆ نوێژ ئەمری ئەفەرموو کە نێزە لە بەردەمیا دائەچەقێنرا، بەرەو نێزەکە نوێژی ئەکرد، خەڵقیش لە پشت ئەوەوە نوێژیان ئەکرد، لە سەفەریشا وای ئەکرد؛ بۆیە ئومەرا نێزەیان کردوە بە سوترە.

**١٩١٩/٦٨ ـ أبو جحيفة [رضي الله تعالى عنه] أن النبي ـﷺـ صلى بهم بالبطحاء، وبين يديه عَنَزَةٌ، الظهر ركعتين، والعصر ركعتين، يمر بين يديه المرأة والحمار. ح ١/٤٥٤. م ـ ١٥٨/٣. د، ت، جه.**

**تەرجەمە:**

ئەبوجوحەيفە ـ رضي الله تعالى عنه ـ ئەفەرموێ: پێغەمەر ـﷺـ لە بەطحادا نوێژی پێکردن نێزەییێکی لە بەردەما داچەقێنرابوو دوو رکات نوێژی نیوەڕۆ، دوو رکات نوێژی عەصری پێکردن پیاوو[1] گوێدرێژ بە بەردەمیا رائەبوردن. یەعنی لەودیو نێزەکەوە.

**١٩٢٠/٦٩ ـ عن عبدالله بن عباس [رضي الله تعالى عنهما] قال: أقبلت**

(١) دانەر ـ خ ـ لە دەقە عەرەبیەکەیدا، بە هەڵە، (المرء)ی نووسیبوو لێرەیشدا بە پیاو تەرجەمەی کرد. بەڵام (المرأة) راستەو دەبێ لێرەدا (ژن) بنووسرێ.

راكبا على حمار أتان، وأنا يومئذ قد ناهزت الاحتلام، ورسول الله -ﷺ- يصلي بالناس بمنى إلى غير جدار [أي سترة، شافعي] فمررت بين يدي بعض الصف فنزلت وأرسلت الأتان ترتع، ودخلت في الصف، فلم يُنكر ذلك عليَّ أحد. ح - ١/٤٥٤. م - ٣/١٥٨.

تەرجەمە:

ئیبن وعباس - رضي الله تعالى عنهما - ئەفەرموێ: سواری گوێدرێژێكي ماچە بووبووم، نزیكي ئیحتیلام بوونم بوو، هاتم پێغەمەر -ﷺ- لە میناداا نوێژی بە خەڵق ئەكرد، بێ ئەمە كە سەترەی بێ، بە بەردەمی بەعزێ لە صەفەكانا رابوردم، دابەزیم و گوێدرێژەكەم بەرەڵلا كرد بلەوەڕێو، چوومە ناو صەفەكەوە هیچ كەس ئینكاری لێ نەكردم.

١٩٢١/٧٠ - عن سهل - رضي الله تعالى عنه - قال: كان بين مصلى رسول الله وبين الجدار ممرُّ الشاة. ح - ١/٤٥٥. م - ٣/١٦٣.

١٩٢٢/٧١ - عن سلمة [بن الأكوع - رضي الله تعالى عنه -] قال: جدار المسجد عند المنبر ماكادت الشاة تجوزها. ح - ١/٤٥٥.

تەرجەمە:

سەهل - رضي الله تعالى عنه - ئەفەرموێ: لە بەینی جێنوێژی پێغەمەرا -ﷺ- و بەینی دیواری مزگەوتا ئەوەندە بوو مەڕی پیا ئەڕۆیی. سەلەمە ئەفەرموێ: دیواری مزگەوت لای مینبەرەوە بوو، ئەوەندە بوو مەڕی پیا بڕوا.

١٩٢٣/٧٢ - عن أنس - رضي الله تعالى عنه - قال: كان المؤذن إذا أذن

قام ناس من أصحاب النبي -ﷺ- يبتدرون السواري حتى يخرج النبي -ﷺ- وهم كذلك يصلون الركعتين قبل المغرب، ولم يكن بين الأذانين والإقامة شيء. ح - ٢/١٣/. م - ٤/١٣٢. وفيه: حتى أن الرجل الغريب ليدخل المسجد فيحسب أن الصلاة قد صليت من كثرة من يصليها. وليس فيه آخره.

تەرجەمە:

ئەنەس - رضي الله تعالى عنه - ئەفەرموێ: كە موئەذذين بانگی دا بەعزێ لە ئەصحابي پێغەمەر -ﷺ، ورضي عنهم - تەشريفيان هەڵەستا بە پەلەپەل ئەچوون بۆ لای كۆڵەكەكانی مزگەوتەوە [بۆ نوێژ] تا پێغەمەر -ﷺ- تەشريفی ئەهاتە دەرێو ئەوان لەوێبوون دوو ركاتيان لە پێش نوێژی مەغريبا ئەكرد لە بەينی بانگ و قامەتا هيچ نەبوو[1].

## سەترە چەندە ئەبێ بەرز بێ؟

١٩٢٤/٧٣ - عن موسى بن طلحة عن أبيه [رضي الله تعالى عنه] قال: قال رسول الله -ﷺ- إذا وضع أحدكم بين يديه مثل مؤخرة الرحل فليصلِّ ولا يبال من مر وراء ذلك. م - ٣/١٥٢.

١٩٢٥/٧٤ - وعنه قال: كنا نصلي والدواب تمر بين أيدينا فذكرنا ذلك لرسول الله -ﷺ- فقال: مثل مؤخرة الرحل تكون بين =يدي= أحدكم ثم لايضره مامرٌ. وقال ابن نمير:

(١) دانەر - خ - مانای زيادەی ريوايەتەكەی موسليمی نەكردوە، كە ئەمەيە: دوای بانگی مەغريب كە دەستيان ئەكرد بە نوێژكردن وا دەبوون پياوی غەريب و نەشارەزا دەچوە مزگەوتەوە ئەوەندە زۆر ئەو دوو ركاتەيان دەكرد وای دەزانی كە نوێژ-ەفەرزەكە - كراوە.

=لايضره= من مر بين يديه. م ـ ١٥٤/٣.
تەرجەمە:
مووسـای کوڕی طەلحـه ـ رضي الله تعـالى عنـه ـ لە باوکیـەوە ریـوایـەت ئەکـا نوێـژمـان ئەکـردو حەیـوانـات بە بەردەممانا ئەڕۆیین، ئەوەمـان عەرزی پێغـەمـەر ـ ﷺ ـ کرد فەرمـووی: لە بەردەمتـانا بە قەد بەرزایی =پاشکۆی= کۆپانی وشتر بێ ئەوی ـ یا فەرمووی ئەوکەسەی ـ بە بەردەمتـانـا رابـوورێ زەرەرتـان پێ نـاگـەیێنێ. لە پشت ئەوەوە رابوورێ. لە ئیبن و عومەرو عایشەیش ـ رضي الله تعالى عنهم ـ وا ریـوایـەت کراوە. پێغـەمـەر ـ ﷺ ـ بەرەو وشترەکەی خۆی نوێژی کردوە. یەعنی لە باتیی سەترە.

١٩٢٦/٧٥ ـ عن عروة قالـت عائشـة [رضي الله تعـالى عنهـا]: مايقطـع الصـلاة؟ =قـال:= فقلنـا: الحمار والمرأة. فقالت: إن المرأة لدابـة سوء. لقـد رأيتني بين يدي رسـول الله ـ ﷺ ـ معتـرضـا كاعتـراض الجنازة وهو يصلي. م ـ ١٦٧/٣. جه.

١٩٢٧/٧٦ ـ وعنها ـ رضي الله تعالى عنها ـ أنه ذكر عندها: مايقطع الصـلاة؟ فقـالـوا: يقطعهـا: الكلب، والحمـار، والمـرأة. قالت: لقد جعلتمونا كلابا.

[وفي أخـرى عنهـا: فقـالـت: شبهتمونا بالحمر والكلاب. والله خ] لقد رأيت النبي ـ ﷺ ـ يصلي وإني لبينه وبين القبلة، وأنا مضطجعة على السرير، فتكون لي حاجة فأكره أن أستقبله. [وفي أخرى خ: فأكره أن أجلس فأوذي النبي ـ ﷺ ـ] فأنسل إنسلالا [عند رجليه. أخرى. خ]. ح ـ ٤٦١/١، ٤٦٢. د، جه.

تەرجەمە:

لەخزمەت حەزرەتی‌عایشەدا - رضي الله تعالى عنها - بەحثی ئەوە کرا کە: چی نوێـژی ئینســان ئەبـڕێ؟ وتیـان: سەگ و، کەرو، ژن. حەزرەتی عایشە - رضي الله تعالى عنها - فەرمووی: ئێمەتان بەرابەر بە سەگ گرت. تەشــبــیــهــتــان بە سەگ و کەر کردیــن و، ژن چە حەیوانێکی خراپە؟! وەڵڵاهی! لەسەر تەخت لە بەینی پێغەمەرا -ﷺ- و قیبلەدا وەك مردوو لێی پاڵکەوتبووم ئەو نوێژی ئەکرد. ئیحتیاجییێکم ببـوایـە حەزم نەئـەکـرد هەڵسم دابنیشم ئەذیـەتی بدەم لای پێیەوە خۆم ئەکێشایە دەرێ.

**١٩٢٨/٧٧ - عن أبي ذر - رضي الله تعالى عنه - قال: قال رسول الله -ﷺ-: إذا قام أحـدكم يصلي فإنـه يستـره إذا كان بين يديـه مثـل آخـرة الـرحـل، فإذا لم يكن بين يديـه مثـل آخـرة الـرحل فإنه يقطع صلاته: الحمار، والمرأة، والكلب الأسود. [قال الراوي عنه:] قلت: يا أبا ذر مابــال الكلب الأسـود من الكلب الأحمـر، من الكلب الأصفـر؟ قال: يابن أخي! سألت رسول الله -ﷺ- كما سألتني، فقال: الكلب الأسود شيطان. م ١٦٥/٣.**

**[وفي رواية أحمد عن عائشة - أي عن رسول الله -ﷺ-] أنه قال: لايقطع صلاة المسلم شيىء إلا: الحمار، والكافر، والكلب، والمرأة. فقالت عائشة: يارسول الله لقد قرنّا بذوات السوء. قسطلاني - ٤٦٣/١.**

**١٩٢٩/٧٨ - عن عائشة [رضي الله تعالى عنها] زوج النبي -ﷺ- أنها قالت: كنت أنـام بين يدي رســول الله -ﷺ- ورجـلاي في قبلتـه، فإذا**

**سجد غمزني فقبضت رجليّ، فإذا قام بسطتهما. قالت: والبيوت يومئذ ليس فيها مصابيح. ح ـ ١/٣٩٨. م ـ د، ن.**

**تەرجەمە:**

سێ حەدیث موتەعاریضن دوانیان لەگەڵ یەکێکیانا.

ئەبـوذەڕ ـ رضي الله تعـالی عنـه ـ ئەفـەرمـوێ: پێغـەمـەر ـﷺـ فەرمووی: کە یەکێ لە ئێوە هەڵسا بۆ نوێژ بە قەد بەرزایی پاش کۆپانی وشترێکی لە بەردەما بێ ئەوە ئەبێ بە سەترەی، ئەگەر نەبێ کەر، ژن، سەگی رەش بە بەردەمیا راببورن نوێژەکەی ئەبرن. راویی ئەفەرموێ: لە ئەبوذەڕم پرسیی: سەگی رەش فەرقی لە سەگی سوورو زەرد چیە؟ فەرمـووی: کوڕی برای خۆم وەك لە منت پرسیی منیش لە پێغـەمـەر ـﷺـ م پرسیی فەرمووی: سەگی رەش شەیطانە.

ئەحمەد بە طەریقی خۆی لە عایشە ـ رضي الله تعالی عنها ـ وە ـ ریوایەت ئەکا [کە پێغەمەر ـﷺـ] فەرمووی: غەیری: کەرو، کافرو، سەگ و، ژن، هیچ شتێ نوێژی موسوڵمان بەتاڵ ناکاتەوە. عایشە ـ رضي الله تعالی عنها ـ عەرزیکرد: (یارسول الله) بە تەحقیق ئاوملی حەیواناتی خراپ کراوین.

لە ریوایەتەکەی تری حەزرەتی عایشە ـ رضي الله تعالی عنها ـ دا ئەفـەرمـوێ: لە بەردەمی پێغـەمـەرا ـﷺـ ئەنـوستم هەردوو پێم لە بەر قیبلەیـا بوو، کە ئەچـوو بۆ سوجـدە پێی ئەگـوشیم و پێم هەڵـەکێشـا کە تەشریفی لە سوجدە هەڵەستایەوە پێم رائەکێشایەوە لەو رۆژانەدا ماڵان چرایان تیا نەبوو. (سێ شت).

له ریوایه‌تی ئه‌بوذه‌ڕا سێ شت، له ریوایه‌تی ئه‌حمه‌دا له عایشه‌وه ـ رضي الله تعالی عنها ـ کافریشی لێ زیادکراوه. ئه‌م سێ چوار شته به بێ سه‌تره له به‌رده‌می ئینسانـا بن نوێژ به‌تـاڵ ئه‌که‌نـه‌وه. له هه‌مـوو ریوایه‌تی بوخاریی‌و موسلیما له حه‌زره‌تی عایشه‌وه ـ رضي الله تعالی عنها ـ به بێ سه‌تره ژن نوێژ به‌تاڵ ناکاته‌وه. حه‌تا پێغه‌مه‌ر ـﷺـ پێی حه‌زره‌تی عایشه‌ی گوشیوه که جێی سوجده‌ی بکاته‌وه.

ریـوایـه‌تـه‌کـان هه‌موویان صه‌حیحن، پێغه‌مه‌ر ـﷺـ فه‌رموویه‌تی، فه‌قه‌ط به‌عزێ قه‌ولی پێغه‌مه‌ر ـﷺـ نه‌سخی به‌عزێ قه‌ولی ئه‌کاته‌وه. قه‌ولی حه‌زره‌تی عایشه ـ رضي الله تعالی عنها ـ که ئه‌فه‌رموێ: له به‌ر قیبله‌ی پێغـه‌مـه‌را ـﷺـ وه‌ك جه‌نـازه راکشـابووم، دوای وه‌فاتی پێغه‌مه‌ر ـﷺـ فه‌رمــوویـه‌تی. ئه‌وی ئیمـامی ئه‌حمـه‌د لێی ریـوایـه‌ت کردوه له زه‌مانی پێغه‌مه‌را ـﷺـ بوه. ئه‌گه‌ر ئه‌م حوکمه باقی بوایه ئینکاری قسه‌ی ئه‌وانه‌ی نه‌ئه‌کرد که له حوضووریا فه‌رموویان سه‌گ و که‌رو ژن نوێژ به‌تـاڵ ئه‌کـه‌نـه‌وه. له‌گـه‌ڵ ئه‌مه‌یشا ئیحتیمالی هه‌یه که مورادی پێغه‌مه‌ر ـﷺـ له به‌تــاڵ بوونــه‌وه‌ی نوێـژ به‌تـاڵ بوونـه‌وه‌ی ئه‌واب بێ؛ چونکی ئینسان ته‌ماشای ئه‌کاو ذیهنی به‌وه مه‌شغووڵ ئه‌بێ نوێژه‌که‌ی لێ تێك ئه‌چێ.

# بابەت و سەرباسەکانی ئەم بەرگە

| لاپەڕە | بابەت |
|---|---|

لاپەرە بابەت

**لاپەڕە بابەت**

لاپەرە بابەت

رجام لە مەلا عبدالسلام سلمه الله وایە کە ئەم مقدارەی وەرگرت منتظرنە بەر تاڕەی خوێنرتەوە
ئەنبە جەرجوانی گەیشتنی بنووسی تادڵ رەحەت بیم چونکە وە هەتەکەی خوایە والسلام

تەمام وابو کە دەرحق هەر پیغمبر علیه السلام چە آیەتی نازڵ بووە بینووسم تەفکرم ئەبێ بنووەی زیاتری قورآنم بنووسیایە
حرفی نظرم ئەکرد چونکە هەموو لە نهایتی وایە بلەیە لە بلاکوا ان شاء الله ئەم مقدارەتە وایکەم

مسجد قباء

بیرنج شەش ڕوژە ترکی نووسینم کردووە چونکە خلق گەڕکیان ڕومیو فوکلر کیان حاضر نەبوو روحین
کە استانبول لە ترسی ئەلمان چوڵ بکری مەبادا توشی تهلکە ببن صانها الله مع سائر بلاد المسلمین
من جمیع الآفات والبلیات منیش بارم بەستووە بو الحلة فقط تردد م هەیە اقوم وحیلا
وادخم اخری ئەوکتە بانەی کەهەم هەموو جوانان سابەخەریت بیانکەم هەوە و
لەجری خوشاف پەرواتەنەبین دعای خەرمان بوبکەن

امرو بتوفیق الله تعالی دەستی پێ ئەکەم هەوە تا بزانین خوا پێمان بەهە ماکریگانم
هەروالمانا و بارا تنها مسودە کان بەبێ ترتیب بەدرەوەن قسطلانیم لە لایە امالە جوانی یە
ئەگەر غلطم بوا اصلاحی بکەن یغفر الله لکم و من الله التوفیق ۲۱ نیسان ۹٤۱

له كتیبخانەی نیشتمانیدا ژمارە
(٦١٨)ی سالی (١٩٨٧)ی دراوەتێ

نرخی: (دوو دینارو نیو)ە




بغداد - هاتف ٨٨٨٢٧٢٦